**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

## پێنجەمین کتێب

- نووسینی: جەبار جەمال غەریب
- بابەت: ڕۆمان
- نەخشەسازی ناوەوە: ڕووناک ڕەسوڵپور
- بەرگ: سەیوان سەعیدیان
- مۆتیڤ: قەرەنی جەمیل
- ژمارەی سپاردن: ٥٢٣
- نرخ: ٣٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠٠٩
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

زنجیرەی **کتێب** (٣٧١)

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

لە ساڵی شەش سەدەمینی ژیانی نوح،
لە حەڤدەمین رۆژی مانگی دووەمدا، ئا لەو
رۆژەدا هەموو سەرچاوەکانی قووڵایی مەزن
تەقینەوە و دەروازەکانی ئاسمانیش کرانەوە.
بارانیش چل رۆژ و چل شەو بەسەر زەویدا
باری.

یەکەمین کتێب

## گەیشتن

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ دەیڕوانییە ئەو ڕێگایەی کە نەیدەزانی بەرەو کوێ دەچێت. خۆر بەلاری لە بەفرەکەی دەدا و بایەکی سارد خەریک بوو گۆلە ئاوە بچووکەکانی دەبەست، چیدی چاوەڕێی نەکرد و ڕوانییە دێیەکی چەند ماڵە، کە شانی بە گردێکەوە دابوو.

ئەو چەند سەد مەترێک لە سنوور دوورکەوتبۆوە، شوفێرێکی درێژ و باریک و سوورڕفل و ریش سپی پێی گوتبوو کە ئێستا دێتەوە و دەیگەیەنێ.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ ئەو ڕێگا باریکەی گرت کە دەچووە گوندەکە، هەستی کرد بەردە سەوزباوە شکاوەکانی ژێر پێی ڕۆدەچن و دوای تاوێک هەڵدەستنەوە. چەند سەگێک بەرەو ڕووی هاتن و لەناو هەموویان ڕوانییە ناوچاوی سەگێکی سپی گەورەی تووک درێژ و ئەویش بێ ئەوەی لێی نزیک بێتەوە چەند جارێک وەڕی.

کاکۆ لە دایکێکی ئەرمەنی و باوکێکی کورد لە وڵاتێکی لێرە دوور لە دایک ببوو. دایکی دەستی کاکۆی کوشیبوو، لە باوەشی کردبوو، گوتبووی: جارێ مەڕۆ، تۆ لەوێ کێ

دەناسی؟»ئەویش روانیبوویە باوکی و باوکیشی دایکی لە باوەش کردبوو و دەستەکانی رزگار کردبوو. سواری شەمەندەفەرێک ببوو وەک هەر بۆ ئەوە دروست کرابێ ئەو لە نیگای دایک و بابی رزگار کات.

لە یەکەم ماڵی گوندەکە لای دا و ژنێکی کامڵ خولڵقی کرد و دەنگێکی گڕ لە ژووریێ دەیگوت: هەر کەسە بابێتە ژووریێ.

کاکۆ لەسەر فەرشێکی رەنگ تۆخ دانیشت، هەندێ نیگاری بازنەیی وناڕێک و پڕ ڕەنگ رازاندبوویانەوە، راستە فەرشەکە هەموو رەنگێک بوو، بەڵام ڕەنگێکی رەش تێکەڵ بە شەڕابی بەسەر هەموو رەنگەکاندا زاڵ بوو. دەیویست شەرم نەکات و بڵێ ''برسیمە''. هەستی کرد گەرمی ژوورەکە وردە وردە دەخزێتە ناو لەشییەوە و خەریکە خاوبێتەوە. هەمان ژنی کامڵ بەسینییەکی پڕ و قورسەوە هاتە ژووریێ و هەڵم لەسەر بەلەم و قاپە پڕ مریشک و گۆشتاوەکە هەڵدەستا.

کاکۆ هەستی بە بەختیارییەکی قووڵ کرد و شتێکی وەک خەنیبوون گوشادی کرد، ویستی سوپاسی ژنەکە بکات و دەستی بکوشێت. پیاوەکە بە هەمان دەنگی قەبە، بەڵام هێجگار دۆستانە گوتی: ''– فەرموو''.

کاکۆ بزەیەکی کردو لەسینییەکە نزیک بۆوە، ژوورەکە لەوپەڕی ئارامیدا و رەنگە گەرمەکان بەسینگ فراوانی خۆیانەوە چواردەوریان ئاخنیبوو. دیسانەوە هەستی بە بەختیاری کرد، بەڵام بەختیارییەکی زۆر تەنها.

روانییە تاقەیەکی بچووک کە چەند کتێبێکی بەڕێکی تێدا دانرابوون، لە تەنیشتییەوە وێنەی پیاوێکی کامڵ و تەسبیحێکی شووشەی مۆری پێداشۆڕکرابۆوە، وێنەکە بە ویقارەوە دەیڕوانی بێ ئەوەی هیچی لێ نووسرابێ، دیاربوو لەودیو وێنەکەوە ئاماژەیەک هەبوو، کە خاوەنەکەی مردووە، کاکۆ بڕوای وابوو ئەو کەسانەی دەمرن، هەر لەو لەحزەی کۆچەدا ئیدی وێنەکان، شێواز و روانینیان دەگۆڕێت و مردن لەودیو چاوەکانیانەوە دەردەکەوێ.

کابرای خاوەن ماڵ لەوپەڕی هێمنیدا گوتی:

– ئەوە سەید حوسێنی جیهانگیرە. باپیرە گەورەمانە.

ژنەکەی بێئەوەی سەیری کابرای مێردی یان وێنەکە کات، لە پەنجەرە شووشەبەندە ڕەنگا و ڕەنگەکەی ڕوانی، لەگەڵ ئەو ناوهێنانەدا پێستی رووی ژنەکە گۆڕا، بە جۆرێک دەیڕوانییە شووشە مۆر و پەمەیی و شینەکانی پەنجەرەکە لەوە بوون کون بە دەربن.

کاکۆ خۆی لە فەزای ژوورەکە لادا و ویستی ئەو تۆزە بەختیارییەی دەستی کەوتووە وا بەئاسانی لە دەستی نەدات، بەوپەڕی ئیشتیاوە دەستی بۆ نانەکە برد، هەستی کرد تام و لەزەت و هێزێک جیا لە هی نانخواردن هەر لە ناودەمییەوە بەبن ددان و زمان و مەلاشوویدا دەچنە ناوخوێنی خۆشی و توانایەکی بێئەندازەی دەدەنێ.

ژنە کامڵی کامڵ، رووی لە وێنەکە وەرگێڕا وەک گوڵێک لە ئاو هەڵکێشرابێ، گوڵێک تەڕ تەڕ، تەڕێکی پڕ نهێنی، لە پشت سەماوەرەکەوە دانیشت، دەنگی ئاوە گەرمەکە دووبارە دوو دڵی ناو فەزای ژوورەکەی شاردەوە، ژنەکە سەیری کاکۆی دەکرد وەک ئەوەی سەیری وێنەی سەر ئەو پارچە کاغەزانە بکات بە جلوبەرگی تازەوە دەنرێن، خەریک بوو جلەکانی لە ناو رەنگی فەرشە چینراوەکەی لە سەری دانیشتبوو ون بێت. هەستا و هەر وەک ئەوەی رەنگەکانی فەرشەکە هەستنە سەرپێ چایەکانی بۆ دانان، خەریک بوو پرسیارێکی لێبکات، بڵێ چۆن وا بە تەنها کەوتویتە ئێرە؟ یان چۆن بەجێیان هێشتووی؟ یان بپرسێ چ بایەک لە داکتی فڕاندووی؟ پیاوەکە لەو کاتەوەی ناوی سەید حوسێنی جیهانگیری هێنابوو، ئیدی قسەیەکی نەکردبوو، وەک ئەوەی هەر ئەو کاتە کاکۆی دیتبێ گوتی:

– هەر بە تەنهای؟

گوتی، بەو کوردییەی لە باوکییەوە فێری ببوو:

– ئەرێ، هەر بە تەنها هاتوومەوە.

ئیدی پیاوەکە کەمێک پێکەنی و گوتی:

– لەگەڵ خۆت بەفرێکی ئەستووریشت هێناوە.

هەر بە هەمان زمانی باوکی، گوتی:

– بەفر دوای من کەوتووە، من لە ناو بەفر لە دایک بووم.

بۆ دەیەم جار ویستی یادگارییەکی باوکی تێکەڵ قسەکانی کات، شتێک بگێڕێتەوە کە بۆنی دانیشتنێکی پیاوانەی لێبێت، بیری لە پەنجە باریکەکانی باوکی کردەوە، بیری لەو کاتانە دەکردەوە کە دایکی لە باوەش دەکرد و دەگریا، ئەو بۆ ئەوەی دایکی ژێر کاتەوە، بۆ ئەوەی دڵی بداتەوە سەری دەخستە سەر سینگی، بەڵام چ دڵنەوایی کردنێک بوو. ئەوان هەمیشە گریانەکانیان لە یەکتر دەشاردەوە، هەمیشە وەک جیرانە ئەوروپاییەکانمان دەیانویست کراوە و گوشاد و خەندان بن.

نەمدەزانی بۆ ئەوەندە خەمبارن، ئەلبوومەکانیان پڕ بوون لە وێنە، وێنەی رەش و سپی و کۆن و تەڕبوو. کتێبەکانی خۆیان هەموویان رۆمان و شیعرو بیرەوەری بوون، بە سەعات دەیانخوێندنەوە، تەنها دەیانویست ئەو زانست بخوێنێ، هەر زانستێک بێت، بیرکاری، ئەندازە، زانستی پزیشکی، بەڵام ئەو زەویناسی هەڵبژارد.

ژنەی خانە خوێی خۆشەویستانە تەماشای کرد و گوتی:

– باهەر بباریٚ، ئەوەندەی دەکریٚ ببباریٚ، ئێرەماڵی خۆتە چەند پێت خۆشە لێرەبە.

بۆ لەحزەیەک هەستی کرد دایکییەتی و وەک ئەوەی ئولفەتێکی قووڵی لەگەڵ ئەو ژوورە هەبیٚ، وەک ئەوەی هەر لە منداڵیەوە پاڵی بە پشتییەوە دابیٚ و ئەو رەنگانە هەر بە هەمان ئەو هارمۆنییەتەوە بناسیٚ، وەک ئەوەی لەو ژوورە لە دایک بووبیٚ، پێیەکانی لێراکێشا، گوێی لە سرتەی بەفر بوو. لە نێوان کاکۆ و ئەواندا بۆنی برنج و هەڵمی چاو و هەناسە هەبوو، لە نێوان کاکۆ و ئەواندا کۆمەڵێک پرسیاری ناکامڵ و چەند وێنەیەکی شێواو هەبوو، ئەو ئەوانی بە سەر لاپەڕەکانی خۆیانەوە گرتبوو، ئەو ئەوانی لە نێو قسە و نیگای خۆیاندا ناسیبوو، وێنەی سەر دیوار و رەنگی فەرش و تاقی کتێبی ئەوانی دیبوو، ئەوان تەنها قژی درێژ و دوو چاوی پڕ تەم و جانتایەکی سەفەری کاکۆیان دەدی، ئەوان تەنها ڕێبوارێکیان دەدی کە رێگای لێگیراوەو شەوی بە سەردا هاتووە، بەڵام ئەوان هەیبەتەکانی خۆشیان هەبوو، وێنەیەکیان هەبوو لە سەرەوە بۆ هەمووانی

دەڕوانی، لە ژوورەکەدا خاوەنی دەنگ و سێبەری خۆیان بوون.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ، لە ناو بەختیارییەکی غەمگیندا یان راستتر بەختیارییەکی بە تاڵدا بۆ چەند ساتێک ژیاو ئەوەندەی دەکرا دەیویست هەر لەو بەختیارییەدا بمێنێتەوە. بەختیارییەک کەهی خۆی نەبوو.

ئەو ئێستا بە تەنها لەگەڵ وێنەیەکی بە هەیبەت لە ژوورەکەدا مابۆوە، چرایەک دەڕژایە ناو هەوای کپی ژوورەکە و بەفر وەک هاوڕێیەکی بە ئەتەکێت و هێمن بێدەنگ دەکەوتە پەنا دیوار و ئەو دیو پەنجەرەکە.

بە شەرمەوە روانییە جانتاکەی و وەک بەڵگەی بێ ئەمانەتی و بێ نەزاکەتی خۆی هاتە بەر چاو، هەموو ئەو شتانەی تێیدان بایەخێکیان نییە، چەند کراس و پانتۆڵ و دەرپێ و فانیلە و کتێب و کامێرایەکی پێنتاکس و... لێرە وەستا و شەرم دایگرت و نەیتوانی بڵێ شتێکی دزیاری، نەیتوانی ناوی ئەو شتە نهێنی و گرنگە بڵێت کە لە ناو جانتاکەی لە گیرفانی ناوەوەیدا شاردبوویەوە، ئەوەش هەرگیز نیشانەی بێ ئەمانەتی و بێ بڕوایی نەبوو.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ پێش ئەوەی زەویناسی هەڵبژێرێ، خولیای وێنەگرتن بوو بە کامێرا، ئەلبوومە بێ ئەژمارەکانی لە هەموو لایەکی ژوورەکەی فڕێدرابوون، سەردەمێک حەزی چووە وێنە گرتنی کەلوپەل، بە تایبەتی کەلوپەلی کۆن و بێ وێنە یان ئەنتیکە، ئەو نەیزانی چۆن ئەو خوڵقەی بۆهات، وێنەی جووتە پێڵاوێک کە لە سەدەی پازدە دروست کرابوو، گوایە هی ئەمیرێکی دانیمارکییە. وێنەی چاکەتەکەی ناپلیۆن و پایپەکەی فرۆید، وێنەی تەلەفۆنێک کە هێشتا شوێن پەنجەکانی ئەنشتاینی پێوە دیارە، وێنەی چەند لاپەڕەیەکی دەستخەتی مارکس، وێنەی چاپەکەی گۆتەنبێرگ، بە هەزار حاڵ بە پارەیەکی زۆر توانیبووی وێنەی ستیانەکەی مارلین مۆنرۆ بگرێ کە گوایە لە دوا چرکەی ژیانی لە بەریبووەو ئێستاش بۆنی ئەوی لێدێ یان هێشتا ئارەقەی ئەوی پێوەیە.

دڵی بە وێنەی پاندانێک خۆش بوو، کە بەرنادشۆ زیاتر لە دوانزە ساڵ بە کاریهێناوەو

دواتر پاندانەکە لە مۆزەخانە دزرا.

دەیان جار وێنەی کەلوپەلەکانی باوکی گرتبوو، هەموو ئەو شتانەی بۆ دواجار لەگەڵ خۆی لە ڕۆژهەڵاتەوە هێنابوونی یان بەڕێکەوت بۆی هاتبوون، چەند تەزبێحێکی تەختەو شووشە و قەزوانی ڕەنگ جیاواز، دوو کڵاوی بە دەست چنراو، کەلوپەلەکانی دایکی، چەند ملوانکەیەکی زۆر کۆن کە هەموویان موڵکی خێزانەکەیان بوون لای ئەو پارێزرابوون، چەند قاپ و پارچە تەختەی پیرۆز کە بە نووسراوی هەڵکەنراو رازابوونەوە، سندووق و کەمووڵە و سرنجی شووشە و هەموو کەلوپەلە پزیشکییەکانی باپیری، تاکە شتێک کە هەرگیز نەیتوانی وێنەی بگرێ یان ڕێگای نەدا لێی نزیک ببێتەوە، دەفتەرێکی بچووکی بەرگی چەرمی قاوەیی بوو، ئەو دەفتەرە چەند نهێنی ماڵەکەیان بوو ئەوەندەش نهێنی هەموو تەمەنی بوو، هەموویان زۆر سادە و ساکاربوون، باوک و دایکی ژیانی خۆیان بەتایبەتی ژیانی سەردەمی تەنهایی و برادەرایەتی و سەفەر و کەسەکانی دیکەی ژیانیان زۆر بە ئاشکرا و بە ڕوونی دەگێڕایەوە، دایکی بۆی هەبوو وێنەی خزمێکی خۆی لە ژوور سەری هەڵواسێ کە سەردەمێک دۆستی نزیکی یەکبوون دواتر لەوپەڕی تراژیدیادا ون ببوو یان کۆچی دوای کردبوو.

## کاکۆ

بابم هەموو ژیانی خۆی نووسیبۆوە، ساویلکەییەکانی، سەرەتاکانی هەرزەکاری و عەشقە سەیرو سەمەرەکانی ئەوەندە بە گێڕانەوەکانی پێدەکەنین دایکم فرمێسکی لە چاو دەهاتەخوارو و من میزم بە خۆم دادەکرد! من.. جامن چیم نەدەگێڕایەوە شتە هەرە هەرە نهێنییەکانی خۆم دەگێڕایەوە و باوکم وێنەی دەگرتم، ئەو کاتە زۆر زوو بوو جارێ نەمدەزانی چییە وام لێدەکات ئەو کچە سوور و سپیانەی هاوڕێم هێندە بەگەرمی ماچ بکەم.

تاکە نهێنی و تاکە شتی شاراوە ئەو دەفتەرە بەرگ چەرمەی دایکم بوو، دایکم هەمیشە و بۆ ساڵانی دوور و درێژ ئەو دەفتەرەی بە تەنها دەخوێندەوە و هەرگیز ڕێگای نەدەدا داوای لێبکەم وێنەیەکی لاپەڕەکانی بگرم یان دەستێک لەو چەرمە نەرمەی بەرگەکەی دەم، لە بیرم نییە ڕۆژێک باوکم ئاگای لێبووبێ دایکم ئەو دەفتەرە بخوێنێتەوە.

بۆ خۆشی لە خەڵوەتێکی زۆر زۆر تایبەت و بە هەستێکی سەیرەوە ئەو لاپەڕانەی دەخوێندەوە، هەستم دەکرد زەمەنی ئەو دەفتەرە زۆر فراوانترە بۆ ژیان لە زەمەنی ناو ماڵەکەمان بۆ ئەوەی دایکم لە سەر بژی، من هەرچەندە زەوییناسیم خوێندووە، بەڵام لە

ڕێگای مامۆستا دیوڕانتەوە لەوە تێگەیشتم کە چینەکانی زەوی و چینەکانی مرۆڤ زۆر جیاوازنین، تێگەیشتم زەویناس و ئینسانناس زۆر لێک نزیکن، چینەکانی قووڵایی زەوی و ناخی مرۆڤ لەیەک دەچن، قوتابییەکانی دیوڕانت دەبوو گیاناس و ئاوناس و هەواناس و گڵناس و بەردناس بن بەهەمان ئەندازەش ئینسانناس بن، ڕاستە من دیوڕانتیم و دەتوانم هەموو بیروباوەڕە سەرەکییەکانی دیوڕانت بنووسمەوە و قوتابی لەسەر ڕابهێنم، بەڵام ئەو حاڵەتەی دایکم حاڵەتێکی تابیەت بوو، من بە منداڵی ئەو حاڵەتانەم بە ڕوونتر دیوە، چەند گەورەتر دەبووم ئەو زیاتر لەو کاتانەدا پەناگیری لێدەکردم، مەبەست ئەو کاتانەی ناو زەمەنی کتێبەکە، کێشەی ئەو زەمەن بوو ئەو زەمەنەی ئەو دەچووە ناوی هەرگیز ناگێڕدرێتەوە.

ئەو وەک کەسێک لەو زەمەنە دەهاتەوە دەرێ، وەک کەسێک نا بەقووڵایی مێژوودا ڕۆچووبێ، یان لە سەد ساڵ بەرەو پێشەوە هاتبێتەوە، نا وەک کەسێک دەگەڕایەوە کە لە زەمەنێکدا ژیاوە کە چۆتە ناو زەمەنێکەوە بەرامبەرمان، بە ئاراستەی ئێمە و لە ئێمەش جیاواز تێدەپەڕێ، تەنها کردنەوەی دەفتەرە بەرگ چەرمەکە، چەرمێک لە نێوان ڕەش و قاوەییدا بەس بوو، بۆ ئەوەی پێ بنێتە ناو ئەو زەمەنە، ئەو دەڕۆیشت دوور دوور دەڕۆیشت، من چەند گەورەتر دەبووم زیاتر دەترسام دایکم جارێک ئەوەندە لێم دوورکەوێتەوە دەستم نەیگاتێ.

ئەو کە دەگەڕایەوە، لەبەر خاتری ئێمە دەگەڕایەوە و لە خەڵوەتەکەی دەهاتەدەر، من وێنەیم دەگرت، بێ ئەوەی هەست بکات ڕوانینەکانیم دەدزی، سەرەتا وەک تەختە دارێک سەرئاو کەوتبێ دەگەڕایەوە ناو قەزای ئێمە، زۆر سارد و بێ بەها دەیڕوانی، دیکۆری ماڵ، شێوەی جلوبەرگ و خواردنی ئێمەی پێ سەیربوو، باوکم کتێب و کۆمپیتەرەکەی بە جێدەهیشت و لە باوەشی دەکرد، وەک دوای دە ساڵ لێکدووری یەکیان دیبێتەوە، وەک دوای چەندان ساڵ زیندان و زەجر گەڕابێتەوە باوەشی، لە باوەشی باوکمدا دایکم توێ توێ ڕەنگی ئەو زەمەنە دوور و جیاوازەی دەچووە ناوی بەر دەدا، دەمماندی زەمەنێک بە هەموو جەبەڕووتیەوە لە رووی هەڵدەستا و دایکمی بەجێدەهێشت.

شتێک لە شێوەی تارمایی و سێبەردا لە دایکم جیادەبۆوە، بێ ئەوەی باوکم نیگای کات دەڕۆیشت، وەک دۆستێکی ئازیز، وەک دایکێکی میهرەبان و دڵسۆز دەڕۆیشت و ئاوڕی دەدایەوە، ئاوڕدانەوەیەک پڕ گلەیی و تامەزرۆیی و حوزنی لێکجیابوونەوە.

کێشەی دایکم گێڕانەوەی ئەو زەمەنە بوو نەیتوانی ئەو زەمەنە بکاتە حیکایەت، من لە گێڕانەوەی وێنە و بیرەوەری کەلوپەلی مۆزەخانەکان فێرببووم هەموو ئەو شتانەی دەبنە حیکایەت فەرامۆش دەکرێن، من زۆر دژی ئەو کەسانە بووم کە دەیانگوت گێڕانەوەو ڕێوڕەسم و دووبارەکردنەوە واتا فەرامۆش نەکردن، دایکم تەنها بیتوانیبا ئەو زەمەنەمان بۆ بکاتە حیکایەت ڕزگاری دەبوو، دەبووە کەسێکی بێ هاوتا و تاقانە، کەسێک دوو زەمەنی هەبێت لە تەنیشتی یەک، دوو زەمەن نەپێچەوانەی یەکتربن و نەدژی یەکتربن و نە تەواوکەری یەکتریش بن، هەر وەک تەمەنی دوو یاریزان لە دوو وڵاتی جیاواز، دوو سەرۆک لە دوو وڵاتی جیاواز، یان تەمەنی دووبرا کە ناتوانن بەشی یەکتری لێبدەن یان بیگۆڕنەوە، دایکم دەیتوانی لە دوو زەمەنی هێندە جیاوازدا بژی.

ئەو کاتە من هەرگیز بیرم لەوە نەکردەوە بچمە ناو ئەو زەمەنە، یان مانای ئەو ڕووداوە تێبگەم، تەنها دەمویست وێنەیەکی ئەو دەفتەرە بەرگ چەرمە بگرم، ڕۆژێک خۆم نیگەران کرد بەو بیانووەی کە هیچ شتێکی سەرنجڕاکێش لەو ماڵەدا نەماوە وێنەی بگرم، بە دایکم گوت:

– بۆچی تۆ شتە گرینگەکانی خۆتم پیشان نادەی؟

ئەو بێ ئەوەی ناڕەحەت بێ یان سەیرم بکات گوتی:

–هەر ئێستا هەموو شتەکانت بۆ دێنم.

ئەوە گوڵاو پژێنی هەرە قەدیمی نەنکت، بڕوانە ئەونەخش و نیگار و ڕەنگانەی لەسەر ئەو مسە هەڵکەنراون، ئەو کڵاوە هەرە بەنرخ و بە دەستچنراوەکەی باپیرەت کە بەبێ ئەو کڵاوە هەرگیز نەچۆتە کەنیسە، ئەوە یەکەم دەفتەری کە تێیدا بۆ یەکەم جار فێری نووسین بووم.....

گوتم:

– ئەوانەم هەموو وێنە گرتووە لەوانەت کۆنتر نییە؟

ئەو گوتی:

– بۆنا، هەمە.

ئەوەندە دڵخۆشبووم خەریک بوو بفڕم و نیگەرانییەکەم بڕەوێتەوەو هەستمە سەرپێ و سەدجار ماچی کەم و پێبکەنم. ڕۆیشت و هاتەوە و گوتی:

–ئەوەتا، سندووقە تەختەکەی باپیرت، بڕوانە ئەو سندووقە یەکەم جانتای پزیشکی بووە، کە باپیرت بەکاری هێناوە.

سەرەکەی هەڵدایەوەو گوتی:

– بڕوانە کەلوپەلی کارەکەی، شووشە و دەرمانی پزیشکییەکەی، سەماعە سادەکەی، بڕوانە ئەو سندووقە چۆن خانە خانە کراوە، وێنەی ئەوانە هەر هەموو بگرە، پارەشت لێ ناستێنم.

لای من ئەو سندووقە تەختەیە زۆر بەنرخ بوو، هەموو کەلوپەلێکی پزیشکی تێدا بوو، هەتا داو دەرمانی دوا نەخۆشەکانی باپیرەمی تێدا بوو، هەندێک لەو دەرمانانەی کە بۆ فریاکەوتنی بەپەلە یان بۆ هەموو فەحسێک بەکاردێن هەر لەوێدا بوون، لیستێکی دوور و درێژی تێدا بوو، کە زۆر بە وردی و دیقەتەوە نووسرا بوو، ناوی هەموو ئەو نەخۆشانەی چارەسەری کردبوون، تەمەنیان، جۆری نەخۆشییەکەیان، هەندێ جار جۆری دەرمان و ژمارەی ئەو جارانەی سەری لێدا بوون. زۆر جار نرخ و پارەش تۆمارکرابوو.

بەڵام بە دوای ئەو سندووقەدا نەدەگەڕام، وڕکی ئەوم نەگرتبوو بۆیە رووم لە دایکم کرد و گوتم:

– نا، ئەو سندووقە کەڵکی منی نییە، حەزم لە شتێکە نووسین و وێنەی لەسەر بێت، کتێب یان دەفتەربێت، شتێک بێت کە پێشتر نەمدیبێ.

بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە، یان سەیرم کات زۆر بە ساردی هەموو شتەکانی خڕکردەوەو چووە ژوورەکەی خۆی.

## سەرۆک

کاکۆ بە تەنها لە ژوورێکدا مابۆوە کە بەفر خەریک بوو دەگەیشتە گوێسوانەکانی ژوورێک وەک کپی بەفر، سەید حوسێنی جیهانگیر لەو دیو شووشەکەوە بەویقارەوە سەیری ئەو میوانە نەناسەی دەکرد و نەیدەزانی چ نهێنییەک لە پشت چاوە پڕ رەنگ و ساردەکانی شاردراوەتەوە، ئەو وێنەی سەید حوسێن، لە تەمەنی سی و یەک ساڵیدا گیراوە، ئەو رۆژە سەختترین رۆژ بوو چ بۆ سەید حوسێن و چ بۆ باپیری جیهانگیری گەورە، چ بۆ وێنەگرەکە، جیهانگیری گەورە ئەو رۆژە دەستی بە خوێن سوور دەبێت و هەست بەخەتا دەکات.

گوێی لێبوو باپیری بە ژنێک کە چواردە رۆژ بوو دوای کەوتبوو، دەڵێت:

– تۆ دەزانی بەدوای چ داهاتووم؟.

ئەو لە کاتێکدا خەریکە لێوەکانی شەق ببن، دەڵێت:

– ئەوەی بەدوایدا هاتووی لای من نییە.

ژنە لەو پەڕی تاسان و رەنگ پەڕیندا دەڵێت:

– تۆ خۆت ئەوەت پێ گوتم.

ئەو تاوێک بێدەنگ دەبێ و دەست دەبات، پارچە مرواریيەک، بەردێکی شین دەخاتە دەستی ژنەکەوەو پێدەڵێت:

– ئەوە یادگاری من، من تازە تەسلیمی خەنجەر بووم، بۆ هەمیشە لەبیرم کە.

پارچە ئەڵماسێک لە رەنگ و خۆشەویستی دەداتە ژنەکەو خۆشی دوای لافاوێک لە هەڵچوون دەکەوێت، لەو رۆژەوە خۆشەویستی ژن، وەعد و بەڵێن لای جیهانگیری گەورە نامێنێت.

پێش چەند سەعاتێک لەو قسانە ئەو وێنەیەی سەید حوسێني جیهانگیر گیرابوو، هەمووشی لەبەردەم کابرای وێنەگردا، هەموو پیاوەکان وێنەیان گرتبوو، تەنها جیهانگیر نەبێ، جیهانگیر لەو رۆژەوە تەسلیمی رق و کوشتن بوو، ناچار بوو لە کێو بژێت، دڵی وەک شاخ رەق بێت، ئەو فێڵی لە خۆی نەکردو ژنێکی بە هەموو موحیبەتەوە فریونەداو زانی دڵی ئەو ناکرێ هەم رەق بێت و هەم نەرم، هەم پڕ سۆز بێت و هەم پڕ خوێن! زانی دڵی ئەو دڵی تۆڵەکردنەوەیەو دڵی ژن نەوایی نییە.

ئەو رۆژەی سەید حوسێنی جیهانگیر ئەو وێنەیەی تێدا گرت، ئەو رۆژە پیاوێکی باڵا بەرزی قژ زەرد، پیاوێکی باریک و پڕ دڵەڕاوکێ ئەوی لەسەر کورسییەک داناو ئەم وێنەی گرت، ئەو پیاوە درێژە وێنەی شار و گوند و رووبار و درەختی پیری دەگرت، کۆڵانەکانی بۆ چرکەیەک دەنووسییەوە، ئەو پیاوە غەمبارترین چاوشین بوو مێژوو ناسیبێتی، ترساوترین وێنەگر بوو رووی کردبێتە ئەو وڵاتە، بە دەیان جار دیبوویان بەسەر سندووقی وێنەکانیدا گریابوو دواتر، زۆر دواتر زانیبوویان ئەو پیاوە تەرم و مردنی سەدان کەسی هەڵگرتبوو، دواتر ئەو پیاوە وێنەی چووە سەر بەرگی کتێب و لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکان، ئەو پیاوە دنیای لە کارەساتی سووتانی شارو سەربڕینی سەدان هاوئایینی خۆی لەو رۆژهەڵاتە بە ئاگاهێنا.

ئەو پیاوە کە لە ژێر وێنەکانی و کتێبەکانیدا نووسرا جیمس پۆڵ براون لەو پەڕی سەغڵەتی و پەشێویدا پەنا بۆ جیهانگیری گەورە دەبات، دواتر گوتبووی من حەزم دەکرد بکوژرێم، حەزم دەکرد وەک ئەو سەدان منداڵ و گەنجە سەرم بخەنە سەر

تەختی قەسابەکان و سەرم ببڕن، من وەک قوربانییەکان گەیشتبوومە ئەو قەناعەتەی کە جوانترین رزگاربوون ئەوەیە لە ریزدا بوەستی و قەسابێک لە جیاتی مەڕ سەرتبڕێ، ئەو پیاوە غەمزەدەیە، ئەو پیاوەی چاوەکانی تەنها دوو کەلا شووشەی شین بوون، گوتبووی سەربڕین بەو گرانییە نییە، من لەبەر رۆحێک و نیگایەک کە خۆریکی دووبارە ببینێتەوە پەنام بۆ سەیدی گەورە نەهێناوە --- من تەنها ویستم وێنەکان رزگارکەم، من تەنها ویستم دنیایەک لە دوا لەحزەکانی ژیانیدا رزگارکەم. ئەو پیاوە سەرەتا رازی نابێت وێنەکانی هێنابوونییەوە بڵاوکاتەوە، لە ماڵەکەی خۆیدا لە گەڵیان دەژی، ژن و منداڵەکانی دەردەکات لەگەڵ وێنەکان دەژی، هاوڕێیەکی زۆر نزیکی یەکێک لەو وێنانە دەبینێ و بۆ ماوەی هەفتەیەک بێ پشوودان و خەوتن لەبەری دەپاڕێتەوە بەڵکو تاقە وێنەیەکیان بڵاوکاتەوە، دواتر پێی دەڵێ: ئەو وێنانە بڵاونەکەیەوە شێت دەبی شێت. ئەو دەڵێت:

– من شێت بم لە شێتبوونی وڵاتێک چاکترە. هاوڕێکەی دەڵێت: ((باشە گوناهی ئەو منداڵانە، ئەو خەڵکە چییە دوا یادگاریان بۆ دنیا کەوتۆتە دەست تۆ)) هاوڕێکەی ئەو هەواڵە بە سەرۆکی وڵات دەگەیەنێ، لە نامەیەکدا بۆی دەنووسێ، هەموو شتێکی بۆ دەنووسێ، کارەساتەکە، نیگەرانی ئەو وێنەگرە، یاوەرانی سەرۆک دەچنە ماڵەکەی، پەیامی وڵاتەکەیانی پێدەگەیەنن، داوەتی دەکەن بۆ دیداری سەرۆک.

رۆژێک خۆی رێک دەخات و کراس و پانتۆڵێکی سپی لەبەر دەکات، دەچێت سەرۆک ببینێ، سەرۆک بەپیرییەوە دێت، دەستی دەکوشێ و دەڵێ:

– دڵشادم گەڕایتەوە وڵاتەکەت.

ئەو وەک بەردێک بێت و سەد درزی دابێت، نەپێدەکەنێ و نەوەڵامی دەداتەوە، سەرۆک دەڵێت:

– تۆ وەک رۆحییەتی ئێمە، وەک ویژدانی وڵاتەکەت ئەو کارەت کردووە.

ئەو دادەنیشێ و سەیری پێڵاوەکانی دەکات، کە دوور دوور دەیانبینی بەناو بەرد و داردا هەڵدێن.

سەرۆک دووبارە دەڵێت:

– تۆ ئێستا لەو پەڕی سەلامەتیدای، وڵاتی ئێمە هێشتا باخچەیەکە لە گوڵ.

ئەو سەری هەڵدەبڕێ، بە قورسی بەرزکردنەوەی بەردێک سەری هەڵدەبڕێ و دەڵێت:

– تۆ حوکمی وڵاتێک دەکەی لە ناو گۆمێک خوێندایە.

ئەو سەرۆکە بە دەسەڵاتە وەک بۆقێک بێت و کەوتبێتە گۆماوێکەوە پڕ لە خوێن، چاوەکانی زەق بوونەوە و دەمی کردەوە. ئەو پیاوە باڵا بەرز و بە هەیبەتە بچووک ببۆوە، هەر هێندەی قەڵەم پاندانێکی لێمابۆوە. توانی لە دوا ساتدا فریایی رووخانی خۆی کەوێت و بڵێت:

– میستەر پۆڵ منیش لەوێ بام نیو ئەوەندەی تۆم پێنەدەکرا، تۆ پاڵەوانی گەورەی نیشتیمانی.

جیمس پۆڵ براون لە وشەی پاڵەوان راپەڕی وەک لەناو بەفردا، لەناو بەفراوێکی سارد و سڕدا پارچە ئاسنێکی سوورکراوەیان بە روومەتییەوە نابێ، گوتی:

–قوربان من پاڵەوان نەبووم! مشکێک بووم پیاوێکی کورد نەبا ئێستا تۆ لە خەوی شیرینی خۆتدا بووی منیش....

سەرۆک کە تا ئەو کاتە لە وشەی کورد حاڵی نە ببوو، هەوڵیشی دەدا ویقاری خۆی ون نەکات، گوتی:

– تۆ سەربازێکی نەبەردی ئەمریکایی بووی، کارێکت کردووە، کە هەموو توانای وڵاتەکەشم خستبایەگەڕ هەر هێندەم پێدەکرا، بەڵام بەناوی خۆم و وڵاتەکەمەوە داوات لێدەکەم ئەو ئەمانەتە بدەیتە دەست خەڵک، با بکەوێتە بەر چاوی دنیا.

جیمس پۆڵ براون هەڵدەستێتە سەرپێ و بەوپەڕی رێز و ستایشەوە بۆ داواکاری وڵاتەکەی دەست دەبات لە گیرفانی چاکەتەکەی وێنەیەک دەردێنێ و دەڵێ:

– فەرموو سەرۆکی مەزن، ئەگەر هێندە لەسەر داوایەکەت سووری ببینە تا جارێکی دیکە بە درێژایی تەمەنت بە ئارامی نەنووی.

سەرۆک دەست دەبات وێنەکە وەرگرێ، ئەو پێش ئەوەی بیداتێ دەڵێ:

– پێش ئەوەی نیشانی هیچ کەسێکی دیکەی بدەی، یان فەرمانی بڵاوکردنەوەی بدەی بیر لەوە بکەوە ئەو وێنەیە بەسە بۆ ئەوەی تا ئەبەد نەتەوەکەت و وڵاتەکەت هەست بە شەرمەزاری بکەن، منیش بەو پەڕی شەرمەزارییەوە ئەو قسەیە دەکەم، پێش ئەوەی بیدەیتە رۆژنامەکان ئەوە بزانە ئەم وێنەیە ئارام و ژیان دۆستیی و ئاسوودیی یەکە یەکەی ئینسانەکان وەک ژیانی من وێران دەکات.

سەرۆک تا ئەو کاتەش بەو پەڕی رێزەوە وەستابوو، چاوەڕێ بوو وێنەکە وەرگرێ، تەماشایەکی وێنەکەی کردوو راچڵەکی، هەنگاوێک گەڕایەوە و بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە دانیشت، هەر لە سەر فەرشەکە دانیشت.

جیمس پۆڵ براون هەموو رۆژە سەختەکانی بیرکەوتەوە، چاوەشینەکانی وەک شووشە و بەرد وشک وشک بوون. سەرۆک پاڵی بە لێواری کورسییەکەوە داو وێنەکەی لە چاوی نزیک کردەوە، لە وێنەکەدا منداڵێک، کە لە شەش ساڵ زیاتر نییە، دەمە و روو لەسەرکا کەوتووە، چاوە گەورەکانی کەوتوون، چەقۆیەکی گەورەی دەسک رەش، کە خوێنی پێوە مەییوە لەوێ، نزیک لە دەم و چاوی فڕێدراوە، لای سەری منداڵەکە پێیەکی بچووکی رووت دیارە، چاوەکانی منداڵەکە بەو ئارامییەی سەیری مەمەی شیریان کردووە هەر بە هەمان ئارامییەوە سەیری چەقۆیەکە دەکەن، سەرۆک تاساوەو جیمس پۆڵ براونیش لەو دیو وێنەکەوە دەبینێ جەللادەکان وەختی نانخواردنی نیوەڕۆیانەو خەریکی پشوون، پۆڵ هەر لەو دیو وێنەکەوە دەبینێ دەستی منداڵەکە بەئاستەم دەجووڵێ، زۆر بە هێواشی خەریکە دڵۆپە خوێنە مەییوەکانی سەر کێردەکە پان دەکاتەوە، بێ ئەوەی ئەوەندەی هێز تێدامابێ کێردەکە بجووڵێنێ. پوڵ ئاگای لە سەرۆک نییە و لەودیو وێنەکەوە دەبینێ، تازە خاوەنی ئەو دوو چاوە ماتە بۆ ئەبەد ناتوانێ هەستێتەوە سەر پێیەکانی و تازە هەرگیز ناتوانێ بانگی دایکی کات، یا چاوەڕێی ئەوەبێت باوکی لە دەرگا بێتە ژوورەوەو خۆی فڕێداتە باوەشی. سەرۆک وێنەکەی لە دەستی گرتووەو وەک ئەوەی هەموو رۆژهەڵاتی بەدەستەوە بێ، هەرچەند دەکا ناتوانێ ئەو دەستەی جارێکی دیکە بەرزکاتەوەو تەماشایەکی وێنەکە بکات. نەیدەزانی ئەو ترسە، ئەو ویژدانە، ئەو

بێ ئارامی و ڕاڕاییە، چییە ئەو سیحرە هەموو هێزی جەستەی مژیوە، ئێستا هەستی بە قسەکەی پۆڵ کرد کە پێی‌گوت: _فەرموو سەرۆکی مەزن تا جارێکی دیکە بە درێژایی تەمەنت بەئارامی نەنووی.

لە وێنەکەدا قورسترە، ئەوە چ منداڵێکە بەو ساردی و بێ گیانییەی تەماشایەک دەکا گەرمی دەستی جەللادەکەی پێوەیە. جیمس پۆڵ براون هەڵدەستێتە سەر پێ و زۆر بە نەوازش و حورمەتەوە دەست دەخاتە سەر شانی سەرۆک و دەڵێت:

– زۆر سوپاس هیوادارم ئەوە دوا بڕیارت بێت، دڵنیام ڕێگا نادەیت بە هۆی ئەم وێنەوە گەلەکەت بۆ هەمیشە لە بێ ئارامیدا بژی.

بۆ بەیانی هەموو ڕۆژنامە بە ناوبانگ و گرینگەکانی وڵات  وێنەی جیمس پۆڵ براونیان بە قەبارەی جیاواز لە لاپەڕەی یەکەم و هەموو لاپەڕەکان دابوو، بە گەورەیی لە ژێر وێنەیەکی باڵانومای نووسرابوو؛

«ئەو پیاوەی لە دنیایەکی دیکە گەڕایەوە»

یەکێکی کەیان نووسیبووی؛

«جیمس پۆڵ براون لە مردن دەگەڕێتەوە»

لەلایەکی دیکە نووسرابوو؛

«پیاوێک سەرۆکی گریاند»

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ بەرەو ڕووی وێنەیەک ببۆوە، کە بەکامێرای جیمس پۆڵ براون گیرابوو.

کاکۆ زیاتر لە سی وێنەی ئەو کامێرایەی گرتبوو کە بە کامێرای براون ناسراوە، ئێستا ئەو کامێرا سادەیە بە بەهاترین ئامێری وێنەگرتن دەژمێردرێ، بە دەیان شێوەی ئەم کامێرایە بۆ بازرگانی دروستکراو هەزاران دانەیان لێفرۆشرا، بەڵام کامێرای براون، ئەو کامێرایەی گەشتی ڕۆژهەڵاتی کردبوو، ئەو کامێرایەی وێنەی سەید حوسێنی جیهانگیری گرتبوو، ئەو کامێرایەی بووە دوا ماڵی منداڵە ئەرمەنەکان ڕۆژ بە ڕۆژ گرانتر دەبوو.

کاکۆ هەستا سەر پێی و سەیرێکی وێنەکەی کرد، لە چاوەکانی ورد بۆوە، ئەو دەمەی

ئەو چاوانە لەو وێنەیەدا بەرجەستەکراون، تەواو لەو لەحەزەیەدا روانیویانەتە جیمس پۆڵ براون تەنها ئەو وێنەیە دەتوانێ لە سەرۆک باشتر حاڵی پۆڵ براون بنووسێتەوە.

سەیری چاوەکانی کرد بەو نیازەی نیشانەیەک، سێبەرێکی دوور، بۆن و بەرامێک لە ناویدا بدۆزێتەوە، چاوەکانی بەو ڕوونییە، دەتگوت هەر ئێستا ئەو وێنەیە گیراوە، بە پێچەوانەی هەموو ئەوانەی دوای مردنیان تەم و خەمێک بێ ئەوەی لە دەسەڵاتیاندا بێت بە نیگایانەوە دەنووسێ.

کاکۆ بۆ یەکەم جار هەستی کرد خەیاڵێک، بیر و ئەندێشەیەک، لە یەکەم ڕۆژی کەڵکەڵەی سەفەرەکەیەوە، لەو دەمەی خۆی ئامادە دەکرد، لەو دەمەی سواری فڕۆکە دەبوو، هەتا ئەو کاتەی لە سنوور هاتە ژوورێ، بە تەواوی دوای ئەوەی شوفێرەکە بە جێی هێشت و دووکەڵی سەربانی ماڵەکانی ئەو لادێیە سەرنجیان ڕاکێشا، ئەو بیر و خەیاڵانە لە کۆڵی نەدەبوونەوە، ئێستا ئەو خەیاڵانە خەریکە لە قووڵایی ئەو وێنەیەوە جارێکی دیکە هەڵدەستنەوە پێ، ئەویش ئەو قەدەرە بوو، ئەو بڕیارە نهێنییە بوو کە ئەو دەبێ ئەو هەموو ڕێگایانە ببڕێت، بەناو ئەو هەموو زەمانانەدا تێپەڕێت و بێت ئەو وێنەیە ببینێ. ئێستا کاکۆی ژەنیاری موراد زانی بۆ بینینی ئەو وێنەیە هاتووە، بەڵام چ نهێنییەک لە پشت ئەو قەدەرەوە بوو، ئەو پێشتر بە دوای کامێراکەی براوندا گەڕابوو، هەوڵی دابوو وێنەکانی لە ناو ڕۆژنامەکاندا ببینێ، ئەو دانیشتنەکەی لەگەڵ سەرۆکدا دیبوو، بەڵام هەرگیز ئەوەی نەزانیبوو لە کونجێکی دیکەی ئەو دنیایەدا وێنەیەک بەسەر دیوارەوە بانگی دەکات، تازە زانیبووی کە تەنها بۆ بینینی ئەو وێنەیە هاتبێ بەسە.

هەستی بە ئاشنایەتی دەکرد لەگەڵ وێنەکەدا، هەستی دەکرد ئەو ماوەیە شتێک لە نێوانیاندا گۆڕاوەتەوە، تۆزێک لە وێنەکە دوورکەوتەوە، جارێکی دیکە ڕوانییەوە چانتاکەی، دوو کتێب و چاویلکەکە و خاولییەکی لێدەرهێنابوو، هێشتا زنجیری جانتاکەی دانەخستبۆوە، دەیویست هێزێک بداتە خۆی و بگەڕێتەوە سەری، زنجیری گیرفانەکەی ناوی بکاتەوە، ئەو شتەی کە نیشانەی نا ئەمانەتی و سپڵەیی بوو، ئەو شتەی بێ پرس هێنابووی، یا بەڕاستی بڵێین دزی بوو، بێنێتەدەرێ.

## مۆڵەت

«ئارتووش کوردە» یەکێک بانگی کرد، دەنگەکە زۆر ئاشنا و نزیک، جارێکی دیکە بانگی کردەوە «ئارتووش» وەستا، حەزی کرد وەک جاران لە دواوە چاوی گرتبا و ئەویش پێی بڵێ «کاکۆ خۆت مەشارەوە»، مەیدانێکی قەڵەباڵغ، بە سەدان دەم و چاوی نا ئاشناو لەیەکنەچوو، هەستی کرد کارۆلین نزیک دەبێتەوە، زۆر نەرم هات و دەستی خستە سەرشانی، ئارتووش لەو پەڕی بێ هێزیدا، لە وەهمی خۆی بەئاگا هات، نەیتوانی بڕوانێتە چاوەکانی کارۆلین، چاوەکانی کارۆلین واتا کاکۆ، ئارتووش بۆ لەحزەیەک ئەوەی لە بیرچوو بوو، کاکۆ سەفەری کردووە، سەفەر لای ئەو تەنها مردن بوو، مردن، سەفەر لای ئارتووش نەهاتنەوە بوو بۆ هەمیشە، سەفەر لای ئەو رێگای چوون بوو تەنها. بێ ئەوەی ئاوڕداتەوە، دەستە بچووک و نەرمەکانی کارۆلینی گرت، تەزوویەک لەناخەوە رایچڵەکاند، نەیتوانی، خۆی کوشت و نەیتوانی ناخی خۆی گەڕاو وێرانی کرد، گریاو گریا گریا نەیتوانی لەو لەحزەیەدا، لە کاتێکدا کە هەموو زیڕۆحەکانی تێیدا هاوبەشن، نەیتوانی وێنای کاکۆ بکات و بیهێنێتەبەر چاوی خۆی، دەستی کارۆلینی گرت

بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە، بێ ئەوەی بوێری سەیری دەم و چاوی کات، یان لێوی ببینێ، دەستی راکێشا و رۆیشت، کارۆلین دەیویست زیاتر لێی نزیک بێتەوە، ئارتووش لەو پەنایە کورسییەکی رەچاو کرد و دانیشت، سەری خستە سەر شانی کارۆلین، وەختێک لێوی لە پێستی گەردەنی دەخشاند، گوتی:

-بۆ هێشتت بڕوا، بۆ؟

روانینە چاوەکانی، پێی ترازاو شعوری ترازاو چاوی ترازاو روانیە چاوەکانی کارۆلین، دوور، دوورو قووڵ روانی، دەیدی کاکۆی دەدی، پشتی لە ئەوەو دەڕوات، لە پشتییەوە باران دەبارێت، شوێنپێیەکانی پڕ دەبن لە ئاوو دڵۆپە باران لە سەریان کڵاوە دەکات، جانتاکەی لە شانەو دەڕوات و ئاوڕ ناداتەوە. کارۆلین بێ ئەوەی چاوی داخات، بێ ئەوەی هێمنی بارانەکە بشێوێنێ، گوتی: دەستەکانی ئارتووشی توند کوشی، دەستی دایکێک بە بە تاڵی جێهێڵرابێت، گوتی:

- ئەو رۆیشتبوو، پێش ئەوەی مۆڵەتم لێ بخوازێ رۆیشتبوو.

## خۆر

کاکۆ باڵی گرتبوو، لەبەر چاوی هەمووان دیار بوو چۆن جووتە باڵە سپییەکەی لێک دەدا، لەسەر نووکی پەنجەکانی ڕادەوەستاو وەک قازێکی تازە پێگەیشتوو یان مراوییەکی کێوی ئەوەندەی دەیتوانی خۆی بەرز دەکردەوە و هەر بۆ کەیف و خۆشی چەندان جار باڵەکانی بەیەکدا دەدان، دەیگوت:

– دەڕۆم، بەسەر پشتی هەورەکاندا دەڕۆم، دەچمە ناو هەتاو، هەتا ئەوەندە لێی نزیک دەبمەوە پشتم بسووتێنێ، ئەو هەموو خاڵە زەرد و پنتە ڕەشانەی بێخۆری لەسەر پێستی دروست کردووم بسووتێن، من حەزم لە بۆ کڕووزی سەر پشتی خۆمە.

کاکۆ بە باوکی دەگوت:

– بابە گوێ بگرە، تۆ هەر لێرە لە ناو ئەو بەستەڵەکە دابنیشە و چەندی پێت دەکرێ لە ژمارەی دوور و درێژ بۆ کارگە نەعلەتییەی کاری لێدەکەی کۆکەوە، ژمارەکانت لێ تێک نەچێ، هەر لێرە لەسەر ئەو کورسیەی لە ناو ئەو باخە بەفر داپۆشیوە دانیشە، من دەڕۆم بە پۆست یەک بارە خۆرت بۆ دەنێرم، بە نامە پارچەیەکت خۆر بۆ حەواڵە دەکەم، تۆ هەر لێرەبە پێستی تۆ تازە بەکەڵکی ڕۆژهەڵات نایە.

باوکی دەیدی کاکۆ گەورە بووە و وەک ئەندازەیەکی زەویناس، دەربارەی ئاووهەوا دەدویٚ، دەیگوت:

– دەتوانی بڕۆی، بەڵام من ئەها لێرە –دەست بۆ چاوی دایکی دەبات– هەر لێرە خۆرێک هەڵاتووە ناتوانم بەجێی هێڵم.

کاکۆ ئەوەندەی دەتوانیٚ باڵەکانی بۆ لای دایکی درێژ دەکات و دەڵیٚ:

ــ هۆ دایکی ئازیزم ئەو باڵانەم لە ناو خەونەکانی تۆ قەرزکردووە بەرەو سەرزەمینی ڕووداوەکان دەڕۆم، لەویٚ من بە بەرگێکی دیکەوە دەبینن. زۆر جیاواز لە بەرگی هۆستاشی ئەو بەرگەی بابم بۆ کەیفی ئێمە لەبەری دەکرد.

کاکۆ باڵدار بوو دەیتوانی هەر چاوێک، هەر خۆرێک لەگەڵ خۆی بەریٚ، بەڵام ئەو بە کاڕۆلینی گوتبوو:

–ئەوانەی باڵدەگرن کەمترین یادگار و کارت لەگەڵ خۆیان دەبەن.

زۆر بێبەزەییانە گوتبووی

– ئەو دڵانەی دەفڕن هێندە تەنک دەبنەوە کە هیچیان لە سەر نانووسریٚ.

کاڕۆلین چووبووە بن باڵی و گوتبووی:

– کاکۆ، ئێمە لە وڵاتی بەفر و بەستەڵەکین دەبیٚ ببینە کەروێشک، لە قووڵایی زەویدا بژین. لێرە فڕین چ مانایەکی هەیە؟

کاکۆ دەچێتە سەر تەپۆلکەیەک، کراسە سپییە فشەکەی دەداتە دەم با و دەڵیٚ:

– من تەنها فڕین دەزانم فڕین، ئاوا..

کاڕۆلین ئەو کەروێشکە سپییەی بەفر، ئەو چاوە شینە ڕوون و شووشیانەی خەریک.. نا خەریک نا هەر بەڕاستی کەوتە سەر بەفر، کە دیتی کاکۆ دای لە شەقەی باڵ، بە هەمان کراسی سپی و کراوەی، بە هەمان دەنگ و سووکی و بێباکییەوە دایە شەقەی باڵ، کاڕۆلین قسەکەی تەواو نەکردبوو، قسەی مابوو، سەد دەفتەری مابوو، بۆی بخوێنێتەوە، هەر وا لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

– تۆ زەویناسی و ئێرە وڵاتی کەروێشکە، چ کارت بە هەوایە، هەوا دەتبا بۆ ئەو شوێنەی دەیەویٚ، زەوی بۆو شوێنەت دەبا کە تۆ دەتەویٚ.

هەر وا قسەی دەکرد، ئەو پێست سپیانە هەرگیز ئەوەندە زۆر بلٚی نەبوون،

دەیگوت:

– ئەوەی زەویناسی بخوێنێ لە هەوادا ناژی، زەوی داتدەپۆشێ و هەوا رووتت دەکاتەوە،...

کراسە فشە سپییەکەی کاکۆ لە هەوادا سەمای دەکرد، با دەیبرد، کارۆلین وەک دوای پەڵە هەورێکی هەر هێندەی دەفتەرێک کەوتبێ رایدەکرد و هاواری دەکرد:

– ئەو پەنجە باریکانەی تۆ، ئەو سینگە تەخت و رووتەی تۆ، بەرگەی هەتاو ناگرێ، کاکۆ ئاگاداربە تۆ ناتەوێ بڕۆی، نا. ئەوە وێنە پڕ ترس و پڕ خوێن و پڕ کارەساتەکانی جیمس پۆڵ بڕوانە تۆی هەڵگرتووە، تۆ پەیمانت دامێ، تۆ سوێندت خوارد کە دوای ئەو وێنانە ناکەوی.

ئارتووش کوردە سەری بە سینگی کارۆلین کردبوو لە ژێر لێوەوە بۆ دەیەم جار گوتی:

– دەبوو تۆ مۆڵەتت نەدابا.

کارۆلین دەستەکانی دەکوشێ و بە پەنجە قژی بۆ شانە دەکات و نایەوێ بڵێ، ئەگەر بشیەوێ بڵێ، چۆن بڵێ کاکۆ دەمێک بوو منی جێهێشتبوو، چۆن بڵێ کاکۆ وەک کەسێکی راستەقینە و خاوەن جەستەو عەقڵ رۆژێک بریاری نەداوە هەستێ و بڕوات و ئیدی کاتی سەفەر و هاتنەوەی دیار بێت، ئەو چۆن بڵێ کاکۆ رۆژێک چاوەکانی دوای مارلین مۆنرۆ کەوت و رۆژێک هەست و شعووری دوای وێنەکانی جیمس براون کەوت، رۆژێک خەونەکانی بۆ ژووری لادێیەکی کوردی فڕی و دەیان رۆژیش بە دوای خاڵ و باپیرە ئەرمەنییەکەیدا رۆیشت و ئەو چۆن و بە چ زمانێک لەو چەقی رێگایە بەو ژنە دڵ بریندار و شکستە بڵێت کاکۆ دەمێک بوو سەفەری کردبوو، چۆنی پێ بڵێ کوڕەکەت بە پارچە پارچەیی سەفەری کردووەو هەر کەسێک بە لەت لەتی سەفەر کات ئیدی مەحاڵە بگەڕێتەوە، ئەگەر گەڕاشەوە، چاوەکانی بێنەوە، دەستەکانی بە جێ دەمێنن، لاقەکانی لەگەڵ نایەن، یان دەشێ بێتەوە، ئا دەشێ بۆ خۆی و سەربەخۆ بە تەواوی بێتەوە، بەڵام ئەوەی دێتەوە کەسێکی دیکەیە، دنیایەکی لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە، وەک ئەوە وایە کەسێکی تازە و سەربەخۆبناسی.

## بەرد

سەدان کەس بە بەردەمیاندا تێدەپەڕن، خێراو بێ ئاوڕدانەوەو بێدەنگ، ئارتووش تەنهاو تەنها و تەنها، کوا کەسەکان، کوا ماڵ و خانوو و بازاڕی گەورە، کوا قەرەباڵغی و راکەو هاوار تەنهایی کەسێکیان پێ کەم دەکرێتەوە، نەڕەنگی جلەکانیان، نەشێوەی رۆیشتن و سیمایان هەر هیچیان لە کاکۆ ناچێ. نیگایەک نییە بیلەرزێنێ و فیڵی لێبکات و بۆ تاوێک، بۆ چرکەیەک بیخاتە ناو چاوەڕوانییەوە، بیخاتە ناو گەشکەو تامەزرۆیی و دڵەڕاوکێوە، جارێکی دیکە ئاوڕیدایەوە و سەیری چاوە شین و سادە و ساردەکانی کاڕۆلینی کرد و دیتی کاکۆ لەو پەڕی دووریدا کە تەنها تەکەی قژی و رۆیشتنەکەی دەناسرایەوە، بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە دەڕوا و دەڕوات باران گۆلاوەکانی دوایی و شوێن پێیەکانی دەشڵەقێنێ. لەو روانینەدا، لەو ساتانەدا، لەو تاسانە بێ مروەتەدا، بێ ئەوەی دەم بکاتەوە، دەڵێ:

– دەبوو مۆڵەتت نەدابا.

کاڕۆلین هەر بە بەفری خۆیەوە، دەستە ساردەکانی بە روومەتی ئارتووشدا دێنێ و دەڵێ:

-کاکۆ شتێکی لای من نەمابوو مۆڵەتی لێوەرگرێ.

دەبینێ، لەگەڵ ئەو قسەیەی کارۆلیندا، دەبینێ، کاکۆ تێپەڕ بووە، لە چاوەکانیدا تێپەڕ بووە بێجگە لە بارانێک هیچی دیکە دیارنەماوە، بارانێک بەخوڕ لە شوێن پێیەک دەگەڕێ پڕیکاتەوە. باشە بۆ باران! لە کاتێکدا بەفر هێمنتر و دڵگیرتر شوێنەواری کەسێک دادەپۆشێ.

لەو مەیدانە گابۆڕەدا، مەیدانێک یەک سەدەی تەواوە، چرکەیەک نەبووە، دەنگی پێی ئینسانی لێنەیە، یەک تاکە لەحزە نییە، دەنگی ماشێن و ترامی لێ ببڕێ، لە هەر دوو جەنگە گەورەکەی دنیاشدا دیسانەوە هەر قەڵەباڵغ و سیخناخ بوو، ئەوان ئارتووش و کارۆلین لەو پەڕی تەنهاییدا، تەنهاییەک سنوورەکانی لە ئاسن و چیمەنتۆبن دەڕزین. دەنگیان لە تەنهاییەکی قووڵی پڕتەمدا دەنگی دەدایەوە. ئەوە حەقیقەت بوو، تاکە شتێک وەهم بوو ئەویش بوونی هەناسەی پێکەوەیی و بوونی هاودەم بوو. هەر لەو باڵەخانە گەورە و پڕ ڕەنگ و شووشە بەندەی، سەد مەتر لێیانەوە دوورە، پڕ لە کوڕو کچی گەنج، پیاوی بۆشناخ و ژنی کامڵ کامڵ و تاخوا حەز بکا کامڵ، هەموو تێکەڵ یەکتر و لەباوەش یەکترن، پێکەوە دەنوون و سەما دەکەن، رانیان پێکەوە دەنووسێنن شەڕابێکی سوور سوور وەک کەف و کوڵی خوێنیان سوور دەخۆنەوە و گەرمی یەکتر لە موولوولە هەرە باریکەکانی پێستیانەوە هەڵدەمژن، هەر سەد مەتر لەوان دوور، هەر سینگی ژنە دەڕژێتە سەر سینگی پیاو، هەر بسکە بەسەر شانو ملی کوڕاندا شۆڕ دەبێتەوە، لە سەعاتێکدا ئاوێنەکان سەدان وێنەیان لێدەگرنەوە، هەزاران ماچ دەڕژێتە سەر سەرین و پشتییە نەرمەکانیان، بەڵام هیچیان، هەر هیچ کامێکیان، ناوی یەکتر نازانن، هەرگیز یەکتر ناناسنەوە، بسکێک نییە دڵێک هەمیشە بۆی لە لێدان بوەستێ، ئەو حەشرە هەر هەمووی قەترەیەک لە حوزنی تەنهایی هیچ کامێکیان کەم ناکەتەوە. لەو هەموو بەر یەککەوتنەدا تەنهایی وەک غەمگینترین و ئەمینترین گاردی دنیا پارچەکانی دڵیان بە هەمان زامی خۆیانەوە بۆ دەپارێزێ، ئەوان نەناوی یەکتر دەزانن و نەسروشتی یەکتر و نەخانەوادە، نەبۆنی یەکتر دەناسنەوە و نەلەمسی یەکتر، دوای ئەو ماوە کورتەی پێکەوە

بوون کە ڕەنجی هەفتەیەکیان تێدا سەرف دەکەن، دەگەڕێنەوە بۆ ژوورە پڕ رەنگ و جوان و رازاوەکانیان و لەو پەڕی تەنهایدا گوێ لە پڕ حوزنترین زەردترین گۆرانی دایکیان دەگرن، دیمەنی ئەو تەنهاییەی رووی داپۆشیون ناناسنەوە. گوێ لەو گۆرانیانە دەگرن دوور دووریان دەبەنەوە، دەیانبەنەوە بۆ مێژوویەک، بۆ دنیاو ژیانێک کەسێک، رۆحلەبەرێک نەوازشی کردوون و خۆشی ویستوون با ئەو رۆحلەبەرە سەگێکیش بووبێ.

ئەو دوو مەخلووقە تەنهایە ئارتووش و کارۆلین یادەوەرییەک، چەند کاتێکی هاوبەش، هەناسەیەک کە هەردووکیان خۆشیان ویستبوو، هەردووکیان لە ناخی خۆیاندا و لە جێگای جیاواز پاراستبوویان و چەند قسەیەکی هاوبەش پێکەوەی کۆکردبوونەوە، ئەوان لە ناو جەستەیەک، لەناو چەند ئێسقان و چەند پارچە گۆشتێک کە کاکۆ ژەنیاریان پێدەگوت بە یەک گەیشتبوون، ئەوان هەردووکیان دوو رێبواری تەمەنی کاکۆ بوون، یەکەمیان لە یەکەم خانەی لەشییەوە چووبووەناوی و بە قەڵەمێک لە رۆحی خۆی رەنگرێژی کردبوو، دووەمیان لە دڵیەوە بەنهێنی وەک دزێک بۆ گەوهەری رەش هاتبێ لە شێوەی پەپوولەیەکی سپی هاتبووە ژوورێ، بەڕووکەش دەتگوت بۆ نان کڕین هاتوونە دەرو بەو تەمەنەدا تێپەریون و هەر لەوێ یەکتریان ناسیوە، کاکۆ کانییەک بوو ئەو دوو ژنە هەر یەکەیان بۆ مەبەستێک چوو بوونە سەری و لەوێ یەکتریان دیتبوو، لەوێ رۆژەکانی ژیانیان دابووە یەکتری.

هەر لەو مەیدانەدا، سەدان شوێنپێ لە لەحزەیەکدا دەکەوتنە سەر یەک و یەکتریان دەسڕیەوە، هەزاران دەموچاوی بێدەنگ و مات و سڕ تێدەپەڕین، ئەوان هەروا، ئەوان ئارتووش و کارۆلین هەروا لەو پەڕی بێدەنگیدا لە قووڵایی چاوی یەکتر ورددەبوونەوە، بۆ یادگارێک، بۆ قسەو بۆنێک دەگەڕان، ئەوان نەدەگریان، گریان لەوە کەم دەستتر بوو، گریان لەوە بێ دەسەڵاتتر بوو ناخی ئەوان بخوێنێتەوە، کێوێک لە بەستەڵەکی حوزن کە لە چاویاندا دیاربوو دەیویست بگۆڕێت بۆ فرمێسک، فرمێسک جگە لە ئومێد بە ئایندە لای ئەوان شتێکی دیکە نەبوو، بەڵام هەرکامیان لە قووڵایی نیگای ئەوی

دیکەدا ڕێژنەی بارانێکی دەدی، بارانێک لەکاتی بەریەکەوتندا لە هەوادا ببێتە تۆز. بارانێک ڕەمزی تەنهایی و ڕەمزی ئاوارەیی، ئاوارەیی ڕۆح و دەربەدەری گیان. ئەو دوو ژنە بە هێمنییەک لە ئاسنەوە بەرامبەر یەک دانیشتبوون، هێمنی بەو مانایە نا کە ئارام بن، بەو مانایەی کپ بن، کپ، بە مانای بێدەنگی سەرەتا، سەرەتای پێش پەیدابوونی وشە ، ئەو سەرەتایەی زمان نەوەک پارچە گۆشتێک نەوەک وشەو دەنگ و هاوار نەبوو. بێ دەنگی بە مانای ئەوکاتەی زمان لە شێوەی تەیرێکی سەد ڕەنگدا نووستبوو. شێرێک بوو، درندەیەک بوو، بۆ جارێکیش بۆ تاکە یەک جار وەئاگا نەهاتبوو، ئەو دوو ژنە بەو هێمنی و کپەییە، کە لە بیریان چووبێتەوە پارچە گۆشتێک لە دەمیاندا هەیە بۆ گوفتار، بۆ دەربڕین و قسەکردن، بۆ گریان و ناڵە، ئەوان بە تەواوی کپ ببوونەوە، کپبوونێک تەنها بە بوورکانێک بتەقێتەوە. هەستانە پێ و یەکتریان لە باوەش کرد، بەفر دەباری و هیچ گرفتێکیشی لەو نەبوو دەڕژێتە سەر تەنها ئینسانەکان، یا خۆش بەختی دار و بەرد، پێی گرنگ نەبوو دەکەوێتە سەر باڵی مەل یان بێدەنگی دەریا. هەریەکە و بە لایەکدا ڕۆیشتن.

کارۆلین زۆر لە هاوڕێکانی دوورکەوتبۆوە، ئەوان فێرببوون لە جەستەی خۆیاندا بژین بۆ چرکەیەک ڕێگەی ئەو ڕۆحە تەنهاو وێرانکەرییان نەدەدا لە ناخیاندا بەئاگا بێت، ئەوان لەسەر کوشتنی ئەو ڕۆحە ڕاهاتبوون، ئەوە گەمژەییەکی ڕۆژهەڵاتیانە بوو، کارۆلین تەسلیم بەو گەمژەییە ببوو، گەمژەییەک تا سەر ئێسقان. گەمژەییەک بەفر نەیدەتوانی داپپۆشێ. لەگەڵ بە ئاگاهاتنی ئەو ڕۆحە پڕ تاسەیە، کاکۆی لە تەنیشت خۆی دیت، ئەو نەیزانی کەنگی ئەو ڕۆحە بە ئاگا هاتووە، ئەو نەیدەزانی هێز و ڕۆح و توانایەکی وا لە ناخیدا خۆی شاردۆتەوە، نا هەرگیز لە بەئاگاهاتنی ئاگادار نەبوو، ئەو ڕۆحە ڕۆژهەڵاتییە پڕ گەشکە و ڕامانە وەک پیاوێک بە ئاگا نایە بکۆخێت و گوڕەی بێت، وەک منداڵێک بە ئاگا نایە، لەگەڵ جووڵەکردنی بداتە گریان، یا هەستێتەسەر پێ، وەک کچێک بەئاگا نایە قژی بەلایەکدا بخات و باوێشک بدا ، ئەو ڕۆحە بریندارە وەک کانییەک وەک بەهەڵم بوونی ئاوی دەریا، بە ئاستەم چاو دەکاتەوە، نا سەرەتا چاو ناکاتەوەو هەر

بەهەست بە ئاگا دێت و بە هەست دەوروپشتی خۆی دەناسێ و بە هەست بۆن دەکات و بەهەستەوە گوێ دەگرێ. بەڵێ ئەو ڕۆحە عاشقانەی ڕۆژهەڵات، ئەو ڕۆحە نەفسکوژەی ڕۆژهەڵات بێدەنگ و بێ هەست دێت و تەواو وەک بە هەڵم بوونی ئاونگ و تەڕایی سەر گەڵاو ئارەقکردنەوەی نێرگز، هەروەک ئەو هەڵمەی سەرەتا نابینرێ و نادوێ و سست و شاراوە، بەڵام ورد و بەهێز لە ماوەیەکی کەمدا تەواوی شاخ و دۆڵ و ئاسمان دەتەنێ و داگیری دەکات، ئەو ڕۆحە ڕۆمانسییە ڕۆژهەڵاتییە هەر ئاوا بێدەنگ و بێرەنگ دێت و لە پڕێکدا تەواوی بوونت دەتەنێتەوە، کارۆلین نەیزانی کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ کەنگێ و لە کێیەوە یەکەم پەنجەو پەنجەو نینۆکی، یەکەم نیگاو دەنگی هاتە ناوی، هەر ئەوەندەی بە ئاگاهات ئەو کوڕە باریکە، ئەو مەخلووقە سرک و چاو بێ سێبەرە لە هەموو شوێنێکی جەستەیدا ئامادەیە. کارۆلین هەنگاوێک لە خۆی و سەد هەنگاو لە هاوڕێکانی دوور کەوتبۆوە، ئەو نەیدەزانی عاقڵانە بژیت، لە بیری چووبۆوە کە دەبێ بۆ خۆی بژی، چ شتێک ئاسوودەی دەکات ئەو بکات، حەزی لە چ گۆرانییەکە گوێ لەوە بگرێ، بچێتە هۆڵی دانس و تا ماندوو دەبێ هەڵپەڕێ و دواتر لە باوەشی کوڕێکی کە پێیان دەڵێن کوڕی شەو کە هەر ئەو شەوە ناسیویەتی پشوو بدات و ئارەقەی ناوچەوانی بە قۆڵی ئەو وشک کاتەوە. ئەو ڕۆحە عاشقەی ڕۆژهەڵات هەرگیز ناهێڵێ گوێ لە گۆرانی خۆت بگری، نا هەرگیز ڕێگای پێکەنین و گریانی خۆت نادات، ئەو ڕۆحە جەللادە گریان و پێکەنین وگۆرانی و خەفەت و سەمای تایبەت بە خۆی دەوێت.

ئەو ئێستا حەزی لە مۆسیقایەک دەکرد کاکۆی بیرخاتەوە، حەزی لە تەماشاکردنی ڕێگایەک دەکرد ئەوی پێدا هاتبێت، بۆنی کلینێکسێک بکات کە جارێک ئەویش بەڕێکەوت کاکۆ دوای خواردنی ئایسکرێم لێوەکانی پێسرپەوە، لە ناو گیرفانە بچووکەکەی جانتاکەیدا ئەو کلینێکسەی هەڵگرتبوو، لەگەڵ قەڵەم جافێکی شینی بچووک کە کاکۆ جارێک دابوویەی تا ناوی ئەو قوتابیانەی پێ بنووسێ کە حەزدەکەن لەگەڵیان بچن بۆ ماڵی مۆسیقاژەنێکی عاشق کە دوو سەد ساڵ پێشتر لەو شارە ژیاوە، چیرۆکی ئەو مۆسیقاژەنە لەسەر زمانی هەموو گەنجەکانە، ئەو کوڕێکی وریاو داهێنەربووە، بەیانیان

زوو لەگەڵ باڵندەکان لە خەو هەستاوەو ئاوازێکی نەرم و پڕ سیحری لێداوە، خەڵکی ئەو شارە دەهاتن و لە پەنا دیوار و باخچەکانی دەوری ماڵەکەی دادەنیشتن، ئەویش بێئاگاو تەنها بۆ خۆی مۆسیقا دەژەنی، عەشقەکان هەر لەشەوەوە دەهاتن و چاوەڕێی بە ئاگا هاتنی باڵندەکان و ژەنیارە لاوەکەیان دەکرد، ئەو ژن و پیاوانەی سەردەمێک بوو خۆشەویستیان بیرچووبۆوە دەهاتن و لەبن دارێک، بە دیار گوڵێکەوە دادەنیشتن تا لەگەڵ سپێدە چاوکرانەوەی گوڵەکەو، ژەنینی مۆسیقایەکە ببیستن، پێش ئەوەی کاکۆ ئەو قەڵەمە بداتە کارۆلین، زۆر پێش ئەوە ناوبانگی مۆسیقاو ئاوازەکانی ئەو کوڕە گەنجە بە هەموو وڵاتدا بڵاوببۆوە، لە شارە دوورەکانەوە، لەلادێ لاچەپەکانەوە، یەک یەک و دوو دوو، دەهاتنە دەوری ماڵەکەی. ئەو، واتا مۆسیقاژەنەکە دواتر بە پاشن کینگ ناسرا، لەماڵەکەی خۆیدا لەو پەڕی هێمنیدا بێ ئەوە بزانێ چارەسەری ئەو دەردەدارانەی دەکرد کە دنیا فڕیدابوونە بەردەرگاکەی، ئێستا ئەو ماڵە بۆتە مۆزەخانە، چیرۆکی ئەو پیاوە سیحرییە هەر بە سیحر کۆتایی هات، کاکۆ دەیان وێنەی ئەو ماڵەی گرتبوو، وێنەی دەرگا و پەنجەرەو کورسی و مێزە بچووک و هەژارانەکەی، کاکۆ چەندان شەو لەو ماڵەدا مابۆوە تا لە پەنجەرەوە وێنەی دەرکەوتنی خۆر و بە ئاگا هاتنی باڵندەکانی و پشکوتنی گوڵەکانی بگرێ، لە هەمووی سەیر و سەمەرەتر کاکۆ شەوێک بە دزی پاسەوانەکان چووبووە ناو ماڵەکەو لە شوێنی پاشن کینگ خەوتبوو، لەناو نوێنە کۆنەکانی ئەودا، ئەو عاشقانەی هاتبوونە دەوری خانوو و باخەکەی مۆسیقازانی سیحری دەیان و سەدان چیرۆکی ناوازە و ئاسەواریان لێبەجێماوە، هەندێکیان لەسەر زەوی و سەر دیوار و تەختە و بەردی باخچەکە یادگار یا خود شعریان نووسیوە، شارەوانی ئەو شارە یەکێک لەو بەردانەی شیعرێکی ناسکی لەسەر نووسراوە ئێستا لەسەر پایەیەکی بەرزی شووشەی شین بەرامبەر ماڵەکەی داناوە، لەسەر ئەو بەردە، کە بۆ خۆشی هەر دەڵێی شووشەیە، شیعرێک نووسراوەتەوە گوایە عاشقێک سەد و هەشتاو چوار رۆژ لە دەوری ئەو ماڵە ماوەتەوەو هەر بە پەنجەکانی بەبێ بەکارهێنانی ئاسن و چەکووچ ئەو شیعرەی لەسەر ئەو بەردە هەڵکەندووە، ئەوەی بۆ کاکۆ دەخوێندرێتەوە هەر ئەوەندەیە:

به پەڕ و باڵێکی سووتاوەوە هاتووم،
بەرۆحێکی ون و دڵێکی لەت لەتەوە هاتووم،
لە شەرمی هێمنی ئەو باخچەیە نەبێت..
هاواردەکەم تا ژەنیار بەئاگابێت و
دڵم تیمارکات.
هەزار ساڵی کە لێرە دەمێنمەوە ..
تا شێوەی مۆسیقا لە سەر ئەو بەردە هەڵکەنم
تا دڵم پڕ پڕ بێت لە مۆسیقا.....
دڵێک لە شووشە لە ئەزەلەوە بۆ وردبوون خوڵقاوە..
دەمەوێ هەرگیز نەڕۆمەوە
لەگەڵ گوڵەکانی ئێرە زەردبم و لەگەڵیشیان
سەوزببمەوە.
لە دیوەکەی دیکەی هەمان بەرد نووسراوە
ئەی ژەنیاری عاشق
گوڵەکان دەمیان کردەوەو
ئاونگ گوڵەکانی داپۆشی
دارستان، پڵنگ و گورگ و مارمیلکەش
لە بەتاڵیدا خەریکە دڵیان بەسەریەکدا بتەپێ..
تا لە ژێر پێی یەکتردا نەپلیشاوینەوە.....
با دەنگێک لە پەنجەرەکەتەوە بۆ دنیا بێ..
ئەگەر ناتەوێ رۆژی حەشر هەر ئەورۆ دەست پێبکات.

## ئۆڕانۆس

لەبەردەم دەرگای ماڵەکە لەسەر گەڵایەکی گەورە، کە زەمەن نەیتوانی بوو ڕەنگی بە تەواوی بسڕێتەوە، بە مووی سەر نووسرابوو «تا مردن مۆسیقا»، پاشن کینگ کە پێشیان دەگوت ئۆڕانوس بەبێ ئەوەی پارچە مۆسیقایەک، پارچە ئاوازێکی لە دوا بەجێ بمێنێ، دڵی هەموو خەڵکی ئەو شارەی پڕ کردبوو لە دەنگ، هەر لە دوورەوە دوای تێپەڕبوونی دوو سەد ساڵ و دوای وشک بوونی گەڵای دارەکان بۆ زیاتر لە دوو سەد جار و هەڵکردنی با بۆ هەزاران هەزار جار، هێرشی بێ ئەژماری باران و گەردەلوول، بەڵام هەر کەسێک بەرەو ماڵەکەی بەڕێکەوتبا، هەر لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم دیمەنی ئەو خانووە، مۆسیقایەک وەک لە بنی خۆڵەمێشەوە بێت لە هەور دروستبووبێ، ئاوازێک وەک لە بن دەریاوە بێت، دەنگێک وەک لە خشت و دیوار و پەنجەرە و تەختەی دەرگاکەوە بێتە دەرێ، سەدایەک وەک ئەوەی لەبن گوێی دارەکانەوە بێت، دێتە بەر گوێچکە، ئەو کەسە هەر کەسێک بێت ئەگەر بۆ سەیری ئەو خانووە چووبێت، هەست دەکات لە پشت دار و لقی چڕی دەوەن و شوێنە پەنهانەکان خەڵکانێک خۆیان شاردۆتەوە، چاوەڕێن، ئیدی ئەوانە سەدان ساڵە چاوەڕێن پاشن کینگ لە خەو هەستێ مۆسیقایەک لە سیحر پڕ جادووتر لە ئامێرە پڕ ئاواز و تایبەتییەکەی هەستێنێ.

کارۆلین بەو قەڵەمە شینە باریکەی ئێستا لە ناو شتەکانی شاردۆتەوە، ناوی هەموو ئەو قوتابیانەی نووسی کە دەیانەویست لەگەڵیان بچن بۆ سەیری خانووە بەمۆزەکراوەکەی ئۆرانوس. ئەو قەڵەمەی عەشقێکی سەرشێتی رۆژهەڵاتانە پڕی کردبوو لەکەفوکوڵی خوێن، سەد گەنجی وەرزشکاری تەندروست نیو ئەوەندەی ئەو قەڵەمە وزەو گەرمیان لە لەشدا نەبوو. کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ لە ناو فەزای خانووەکەدا ون بوو، وەک کەوتبێتە ناو ئۆقیانووسێکەوە، کوڕ و کچەکان دوای تاوێک لە خانووەکە هاتنە دەرێ و بە دارستانەکەدا بڵاوبوونەوە و هەندێکیشیان لەسەر ئەو سەندەڵیانە دانیشتن کە لە پەنا شەقامەکە بۆ گەشتیاران دروستکرابوون. کاکۆ بێ ئەوەی وێنەی هیچ بگرێ، بێ ئەوەی دەست بۆ هیچ شتێک بەرێ بە خانووەکەدا سووڕایەوە، لە نەخشی دەرگا وردبۆوە، روانییە شیعری سەر بەردەکە، کەوچکێکی داری سەر مێزە کۆنەکەشی فەرامۆش نەکرد.

کارۆلین پێی دەڵێ:

- بۆ وێنە ناگری، ئێرە بۆ تۆ پڕە لە وێنە.

ئەو دەڵێ:

- نا، من ناتوانم وێنەی مۆسیقا بگرم. لە ماڵی مۆسیقادا من بۆ مردن باشم.

کارۆلین دەیەوێ گیرۆدەی ئەو خانووە نەبێت و چەند وێنەیەکی بگرێت و بڕوات بۆیە پێی

دەڵێت:

- وێنەی دار و بەردەکەی، وێنەی دەرگاو پەنجەرەکانی.

کاکۆ دەڵێ:

- ئەو وێنانە ناکرێ کۆپیان هەبێ، دەبێ لە ناخمدا لە شێوەیان دروست کەمەوە.

بەڵام دواتر دەکەوێتە وێنەگرتن، دەجار وێنەی ئەو گەڵایە دەگرێ لەسەری نووسراوە «تا مردن مۆسیقا» دەگەڕێتەوە وێنەی شیعری سەر بەردەکە دەگرێت، وێنەی ئامێرەکەی، جێگاو نووستنی و کەلوپەلەکانی دەگرێت. قوتابییەکانی هاورێیان

هەموویان دەڕۆن و ئەو دەمێنێتەوە، کارۆلین لەسەر پلیکانەیەک خەوی لێ دەکەوێت و ئەو چاوەڕێی خۆر ئاوابوون دەکات تا لە پەنجەرەکەی ئۆرانوسەوە وێنەی بگرێ، دەیەوێ چوارچێوەی پەنجەرەکە ببێتە چوارچێوە بۆ وێنەکەش، ئەو وێنەیە دواتر زۆر دواتر بێ ئاگاداری خۆی کارۆلین لای هاوڕێیەکەی جێدەهێڵێ و ئەویش لە گۆڤارێکی رەنگا و رەنگ بڵاوی دەکاتەوە (ئەو پەنجەرەیەی لەجیاتی خۆر مۆسیقای لێهەڵدێت)، لەسەرانسەری وڵاتدا وێنەکە کۆپی دەکرێ و لە فرۆکەخانەکان دەفرۆشرێت و دەبێتە رەمزی چاوەڕوانی و حەسرەت.

کاکۆ هەر لەو ماوەیەدا بە کارۆلین دەڵێت:

– من زۆر لە مێژە درۆ لەگەڵ خۆم دەکەم، کارۆلین من درۆم لەگەڵ تۆش کردووە، من دەبێ تەنها بم تەنها، من بۆ تەنهایی دروست کراوم.

کارۆلین ئەو درزەی نەدی، ئەو وێنەیە دروستی کردبوو، کاکۆ بە چ دەردە سەریەک دەتوانێ شەوێک لەو خانووەدا بمێنێتەوە تەنها بۆ ئەوەی بەیانییەکەی وێنەی رۆژهەڵات و دارستانەکە لە پەنجەرەکانی ئۆرانۆسەوە بگرێ، ئەو هەرگیز لە کاکۆ نەگەیشت کە دەیگوت:

– ئەو وێنەیە تەنها هی منە.

ئەو بەیانییە، بەیانییەکی تاک و تەنهابوو، ئەوە کەی کاکۆ لەگەڵ ئۆرانۆس ژیابوو، هەر بە راستی ئۆرانۆسی دیبوو، بەڕای کاکۆ ئۆرانۆس مەسیحە، وەک مەسیحە قوربانی هەموو دنیایە، تەنها لەو سۆنگەیەوە مەسیح بوو، ئۆرانۆس لە جیاتی هەموو عەشقەکانی دنیا، لە جیاتی خەتاو خراپەکاری و دڵشکاندنەکانیان، لە جیاتی هەموو ئەو خەمە قورسانەی بە دڵی یەکدیدا دەکەن خۆی کردە قوربانی، قوربانییەک هەر وەک مەسیح بێ گۆڕ و گلکۆ، ئۆرانۆس جگە لە مۆسیقا و پیاڵە خوێنێک هیچی دیکەی نەبوو بیداتە عەشقەکەی، هەموو ئەو رۆژانەی پێکەوە بوون، هەموو ئەو سەعاتانەی بەرامبەر یەک بوون، جگە لەو عەشقە هیچی دیکەیان نەبوو بیخۆن، هیچی دیکەیان نەبوو لەبەری کەن، پڕ حوزنترین رۆژەکانی ئەو دارستانە، پڕ گریانترین رۆژی ئەو عاشقانەی لە دەوری ماڵەکەی پاشن کینگ لە چاوەڕوانیدا بوون ئەو رۆژە بوو، گوڵەکان لە خەو هەڵنەستان و باڵندەکان جریوەیان نەهات و گەڵاکان ئاونگیان دەرنەکرد و خۆر دەرنەکەوت، ئەو

بەیانییە کە دواتر هەر عاشقەکان ناویاننا سپێدەی رەش، دروستکردنی ئەو ناوە«سپێدەی رەش» بەو رۆحە فەنتازییەوە تاکە خۆر خۆشی بوو لە ئاسۆی ئەوان هەڵاتبوو. رۆژی قیامەتیش بوو.

ئەو رۆژەی ئۆرانۆس بۆ ئەبەد ون بوو، چەند وشەیەکی لە دوا بە جێما بوو، ئامێرەکەی مۆسیقاو یادگارەکانی دڵداری و دڵێکی پڕ خوێنی بە جێهێشتبوو، درەنگ زۆر درەنگ زانیان پاشن کینگ لە ژوورەکەیدا نییە، درەنگ زۆر درەنگ باخەوانە پیرەکە لەو پەڕی سەرسامیدا گوتی:

– ئیدی ئاوازێک لەو خانووە وە بەرز نابێتەوە.

ئۆرانۆس نامەیەکی بە جێهێشتبوو نامەیەک کە تەنها دەبوو دڵخوازەکەی بیکاتەوە، نامەیەکی مۆرکراو ئەو نامەیە بۆ کچەی دڵبەندی بوو، ساڵان تێپەڕین و نامەکە نەکرایەوە، باخەوانە پیرەکە تاکەکەس بوو دولبەرەکەی دەناسی، دەیڕوانییە هەموو ئەو کچە گەنجانەی دەهاتنە ئەوێ، ماوەیەکی زۆر بەشاردا سووڕایەوە، ئێ خوایە ئەو کچە ببینێ، بەڵام باخەوانەکە چاوەکانی کز بوون و ئەو هەر نەهات، دەستەکانی لەرزۆک بوون و ئەو هەر نەهات، ئەو باخەوانە نامەکەی بە یەکێک لە کوڕەکانی کە ئەویش پیر بوو دای بەبراکەی، کە ئەویش چاوەکانی کز بوون و مرد نامەکەی دا بەکوڕە گەورەکەی، ئێستا دوای تێپەڕبوونی سەدان ساڵ و گۆڕان و لە ناوچوونی ئەو هەموو نەوەیەی باخەوانەکان! نامەکە نەکراوەتەوە، کچەی عاشقی ئۆرانۆس دەرنەکەوتووە، ئێستا خەڵکی ئەو شارە لە دوو شت سڵ دەکەنەوە یەکەمیان نووسینی نامەی دوعاخوازی و دووەمیان دڵی شکاوی کچی عاشقی ، بەردێک لەناو باخەکە هەیە، بەردێکی رەشی لووس، نە زەمەن دەیگۆڕێ و نە بارانیش تەڕی دەکات، دەڵێن ئەو بەردە دڵی کچەی عاشقی ئۆرانۆسە. لەپشت سەری ئۆرانۆس لەو شوێنەی لێی خەوتووە، نامەیەک هەڵواسراوە، نامەیەک بە ئارەقەو چەوری باخەڵی باخەوانەکان چەور بووە و وشەکانی کەوتوونەتە سەر یەک و سڕاونەتەوە، دەڵێن ئەو نامەیە، نامەکەی ئۆرانۆسە کە بۆ دەزگیرانەکەی نووسیوە، هەموو ئەو کوڕ و کچانەی دێنە ئەو ژوورە، هەوڵدەدەن ئەو نامەیە بخوێننەوە، هەندێک ناویان ناوە«وەسیەتنامەی عەشق» هەندێکی کە دەڵێن «سەمای دڵ»

## تۆس

قەشە جۆلیۆس ئەندریاس سەدەیەک لەوەو پێش کاتێک ویستوویەتی ژمارەی دانیشتوانی ئەو شارە بەسەر کاتەوە، دەبینێ مۆسیقاژەنێک دوای ئەو هەموو ماوەیەی بەسەر لە دایکبوونیدا تێپەڕیوە کەچی رۆژی مردنی دیار نییە و تا ئەو کاتە بە زیندوویی بەناو لاپەڕەکانی کەنیسەدا دەسووڕێتەوە، ئەو گەنجە مۆسیقازانە تاکە کەسە سەر بە ناو هەموو ژوورە نهێنییەکانی کتێبی پیرۆزدا دەکات، تاکە کەسە بۆو زەمەنە درێژە میوانی ئایینەکان بووە، تاکە کەسە ئەو هەموو مردن و زیندووبوونەوەی مەسیحی دیبێت، بەڵام تاکە کەسێکی بێدەنگ و بێ ئاماژەیە. تاکە کەسە هیچ لەو ئایەتانە وەرناگرێ و هێمنی و مۆسیقایان دەداتێ، ئەو گەنجە لەو کاتەی کە قەشە جۆلیۆس ئەندریاس دەیناسێ رەنگی زەرد زەردە، زەردێک لە قووڵایی عەشقێکی لەبن نەهاتووەوە هاتبێ، کاتێ بۆ یەکەمجار کە قەشە جۆلیۆس ئەو بوونەوەرە دەبینێ هەروا دەزانێ ئەو باڵندە زەردانەن چەند ساڵ پێشتر یەکێک لە راهیبەکانی شافیتۆس بۆ کەنیسەی هێنابوو، ئەو باڵندە بێ گۆشتانەی لە باخی کەنیسەدا دەبینران، تەنها دوو باڵی زەردو کلکێکی پان بوون، راهیبەکەی شافیتۆس دەڵێت ئەو باڵندانە تەنها لەسەر ئاو دەژین ئەویش ئاوی ئیمان. سەردەمی

زێڕینی کەنیسەکەی قەشە جۆلیۆس ئەو کاتە نەبوو کە ئەو باڵندانە کە بە باڵندەی تۆس ناویان رۆیشتبوو لە باخچەکەی دەهاتن و دەچوون، ئەو سەردەمە کەنیسە لێو رێژ بوو لە ئیمان، ئەو رۆژەی قەشە دەیەوێت ئامارێکی تازەی شارەکەی بکات ماوەیەکی زۆر بوو ئەو باڵندانە لە کەنیسەکەی نەدەبینران، قووڵترین خەمی قەشە نەمانی ئەو باڵندانە بوو، هەر کە لە پڕ یەکێک لەو باڵندانەی کە بە باڵندەی تۆس ناسرابوون لە ناو کتێبی پیرۆزدا دێت ئەوەندەی پەڕجووی زیندووبوونەوە رای چڵەکاند، دواتر زانی ئەوە خوودی باڵندەی تۆس نییە و گەنجێکی ون و سەرگەردانە، دواتر زانی ئەو رەنگە زەردەی وای دەزانی رەنگی باڵندەی تۆسە رەنگی تەم و غوبارێکە لە پشت مۆسیقایەکەوە هەڵدەستێ بە دوای ئەو گەنجەوەیە، قەشەی پڕ حیکمەت دیسانەوە دڵخۆش دەبێت کە یادی باڵندەی تۆس بە نێو کەنیسە و دڵیدا گوزەر دەکات.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ ئاڵودەی ئەو حیکایەتەی باڵندەی تۆس دەبێت و ئەو بە کارۆلین دەڵێت:

– دەتوانم هەموو دنیا لە بیر کەم، تەنها باڵندەی تۆس نەبێت.

کارۆلین کە تا ئەو کاتە خۆی لەگەڵ هەموو دنیادا حیساب نەدەکرد لە دڵی کاکۆدا دەڵێت:

– ئەو باڵندەیە کەس نەیدیوە، ئەو حیکایەتەت لە کوێ هێناوە.

کاکۆ هەنگاوێک دوور لە کارۆلین دەڵێت:

– ئەوەی لە دڵی مندا بژی ئەو باڵندەیە دەبینێ، ئەوە تەنها حیکایەت نییە.

کارۆلین لەو گۆڕانە قورسانەی کاکۆ دەترسێ، ئەو دەیەوێ بژی، بژی و کاکۆی خۆش بووێت ئەو هەرگیز لەو باوەڕەدانەبوو عشقێکی رۆژهەڵاتیانە ئاوا توند کەلەپچەی کەن، ئەو وەک ئەوروپاییەک دەزانێ هەر شتێ نەتوانێ خۆی لێ رزگارکات نەخۆشییە، وەک تریاک و ئەلکهول و خۆشەویستی، بەڵام تازە دەزانێ درەنگەو ئەو بەڕاستی گیرۆدە بووە. دەستەکانی کاکۆ لە باوەش دەکات و چاوەکانی دەکەونە سەماو دەڵێ:

– ئەو قەشە جۆلیۆسە سەد ساڵ زیاتر پێش ئەمڕۆ ژیاوە، ئەو پیاوە تاکە کەسە

باسی باڵندەی تۆس دەکات، کەنگێ جێگای عەقڵە باڵندەیەک هیچ نەخوات؟ دە توخوا پێم بڵێ ئاوی ئیمان چییە؟ کاکۆ لە ناکاو دەڵێت:

– با، جێگای عەقڵ نییە، بەڵام ئەو شتانەی جێگای عەقڵ نین گرنگن ئەوانە حەقیقەتن قەشە جۆلیۆس ڕەوگەی عاشقانە، تاکە کەسە دوای ون بوونی ئۆرانۆس دیویەتی، تاکە کەسە زانیویەتی ئەو هەموو ماوە دوور و درێژە ژیاوە، ئەو زانیویەتی ئۆرانۆس تەنها بۆ ئەوە ژیاوە دڵخوازەکەی نامەکەی بخوێنێتەوە، ئەویش لە ناو کتێبێکدا تەنها جێگای باڵندەی تۆسی تێدا دەبێتەوە، چاوەڕێ بوو لە دووری دوورەوە ئەو کچە نادیارەو بێناونیشانە سەر لە ماڵەکەی بدات و نامەکە بکاتەوە، قەشە جۆلیۆس رزگارکەری رۆحە پاک و زیندانی و خاوێنەکەی ئۆرانۆسە.

ئەو رۆژانە سەختترین رۆژەکانی کاکۆ بوون، ئەو دەیویست رۆحی باڵندەی تۆس ببینێ، ئەو سەردانی کەنیسەی جۆلیۆس ئەندریاسی دەکرد، ئەو کەنیسەیە ئێستا بیست و سێ کیلۆمەتر لە شار دوورە و لە قەد پاڵی شاخێک دایە و هەمیشە هەڵم و تەم دایپۆشیوە، کاکۆ نازانێ بۆ چی ئەو کەنیسەیە هێندە لە شار دوورکەوتۆتەوە، خەڵکی بەو کەنیسەیە دەڵێن کەنیسەی تۆس و عاشقەکانیش بە باڵندەکە دەڵێن خواوەندی تۆس. جگە لە نووسینەکانی قەشە جۆلیۆس تاکە شتێک ناوی تۆسی لەسەر بێت تابلۆیەکە کە پیرێکی خوداپەرست دروستی کردووە، تابلۆیەکە دارستانێکە گەڵای پان دارەختەکانی داپۆشیون و هەورێکی توند ئاسمانی گرتووە و بروسکەیەک بە ناو هەورەکەدا دێت و هەر لەناو بارانەکە لە پەڕوباڵی باڵندەیەک دەدات و لەسەر چەند پەڕێکی کاڵ ڕەنگێکی زەرد زەرد دەرکەوتووە، لە خوار تابلۆیەکە نووسراوە؛

«تۆسی پیرۆز ئامادەم لەگەڵ خۆتم بەرە»

کاکۆ هەست دەکا لە هەر لەحزەیەک بێت دڵی وەک ئەو باڵندەیە دەداتە شەقەی باڵ، ئەو پێی وایە ئەو باڵندەیە لە سینگی ئەودا بەندکراوە، وادەزانێ خودی خۆی باڵندەی تۆسە، قەشە جۆلیۆس چەند پەیامبەری عەشق و رۆحی ئۆرانۆسە، چەند خولقێنەر و گەیەنەری باڵندەی تۆسە، ئەوەندەش قاتیل و دڵڕەقە، راستە بەسەر دەستەکانی ئەودا

باڵندەی تۆس گەیشتە ئەو سەدەیەی ئێستا، راستە لەسەردەمی ئەودا زۆرترین باڵندەی تۆس لەویّ ژیا بوون، راستە ئەو یەکەم کەس بوو دوای ئەو عومرە درێژە لە زیندوویی ئۆرانۆس بە ئاگا هات، ئەو بوو لە ناخی کتێبەکاندا دۆزییەوە، بۆ دواجار گوێی لە مۆسیقای رۆحی بوو، بەڵام هەر ئەویش لەو پەڕی دڕندەییدا، چووە ناو کڵێشەی جەللادەوەو بۆ دواجار ئۆرانۆسی کوشت، راستە کەس لە زیندوویی ئۆرانۆس ئاگادار نەبوو، بەڵام ئەو لە لاپەڕە بێکۆتاییەکاندا لە زەمەنە بێبنەکاندا بۆ هەمیشە دەژیا، قەشە ماوەیەکی درێژ لەو لاپەڕانەدا لەگەڵ پاشن کینگ لە نزیکەوە ژیا، لەناو لاپەڕەکانی کەنیسەدا ژوانیان هەبوو، پاشن کینگ بەسەر هەموو بانێژەکاندا، بە ناو هەموو پەنجەرەکاندا، لە ناو سەرداب و ژێر قادرمە هەرە نهێنییەکاندا دەگەڕاو ئاوازێکی لە دوای خۆی جێدەهێشت، ئاوازێک کە چەند رایەڵێکی تیشک لە شێوەی تەلی کەماندا بەدوای خۆیاندا رادەکێشا، ئەو بە پێخواسی بەناو رستە و پیتەکاندا هاتووچۆی دەکرد، ئەو جارێکی دیکە باڵندەی تۆسی هەڵفڕاند، دواجار بۆ خۆشی لە شێوەی باڵندەیەکدا دای لە شەقەی باڵ. قەشە هەر لەو رۆژەدا دەیەویّ کۆتایی بە ژیانی کەسێک بێنێت کە لە دەفتەرەکانی کەنیسەدا تەنها رۆژی لە دایکبوونی نووسراوە لە باوەڕی ئەودا جگە لە رۆحی پیرۆز ئیدی هیچ کەسیّ نابیّ رۆژی مردنی نەبێت، قەشە جۆلیۆس داوا لە باخەوانەکەی ماڵەکەی ئۆرانۆس دەکات کە نامەکەی ئۆرانۆسی بداتیّ، باخەوانەکە دەڵێت:

– من یازدەیەمین نەوەی بنەماڵەکەمانم کە ئەم نامەیەم کەوتۆتە دەست و دەبیّ بیپارێزم. قەشە جۆلیۆس بە زمانی قەشەیەک بە باخەوانەکە دەڵێت:

– تازە بۆ کێی دەپارێزن دەبیّ بیکەمەوە، دەبیّ رۆژی مردنی ئۆرانۆس دیاری کەم.

باخەوانەکە لەو پەڕی سەرسامیدا دەڵیت:

– مردنی ئۆرانۆس!

قەشە لەو پەڕی هێمنیدا دەڵیّ:

– بەڵی مردنی ئۆرانۆس، لەو نامەدایە.

باخەوانەکە دەڵیّ:

– ئەوە تۆنی ئەو نامەیە دەکەیەوە، من لە باپیرانم بۆم ماوەتەوە، ئەو کچێکی باریکی قژ درێژە، بازنەیەکی پەلکەزێڕینەی لەسەر بەرە دەستی چەپیەتی هەر بەو دەستەش سڵاومان لێدەکات و بەودەستەش دەبێ نامەکە بکرێتەوە. کوڕەکەشم ئەو راستیانە لە من چاکتر دەزانێ.

قەشە جۆلیۆس هێمن و مات دەڵێت:

– ئێ، کەنگێ دێت، ئەو کچە دەبوو دوو رۆژ، سێ رۆژ، دوو مانگ، سێ مانگ.....کوڕە پەنجا ساڵ پێش ئێستا بێت و نامەکە بکاتەوە.

باخەوانەکە لەو پەڕی باوەڕ بەخۆ بوونەوە دەڵێ:

– پەلەمان نییە دێت، دێت و پێڵاوەکانی کە لە گەڵای مۆز و پێستی مامز دورست کراوە، دێت هەر لەبەر ئەو دەرگایە، لەو شوێنەی هەر هێندەی پێڵاوەکانی ئەوە هەرگیز پنچکە گیایەکی لێ ناڕوێ، هەر لەوێ پێڵاوەکانی دادەکەنێ و شەپقە فرە رەنگا و رەنگەکەی دەدات دەست من و خاتوونی منیش دێت و کراسەکەی بۆ هەڵدەکات و لە دوایەوە بۆی هەڵدەگرێ و دەچێتە سەرێ و ناوی ئۆڕانۆس کە لەسەر دەرگا تەختەکەی ژوورەکەی نووسراوە ماچ دەکات و دەچێتە ژوورێ.

باخەوانەکە لێرە دەموچاوی دەگۆڕێ و بەردەوام دەبێت:

– باوکی بەڕێز ئیدی هەرکە چوویە ژوورێ بە دواتدا دێم و دەبێ خۆت ئاگات لە هەموو شتێک بێت، من لێرەوە ئیدی کوێرم و هیچ نازانم، نامەکەی دەدەمە دەست و دێم، نازانی بیکاتەوە، ئۆڕانۆسی گەورەم دێتەوە، کچەکە بەرگەی ئەو هەموو چۆڵی و بێکەسییە دەگرێ، دەتوانێ لەو ژوورەدا چاوەڕێ بێت.

قەشە وەک لەگەڵ نەخۆشێک بدوێت، بێ گرێ و سادە دەڵێت:

– ئەو کچە دەبوو پێش یەک سەدەی تەواو هاتبا ئێرەو خاتوونی تۆ نا، هی باپیرە گەورەشت نا، هی باپیرە سەد جار گەورەکەت، هاتباو ئەو نامەیەی لە مردن رزگار کردبا، دەبوو هاتباو ژیانی دابایەوە ئەو وشانەو بە دوای ئۆڕانۆسدا گەڕابا، تازە ئیدی ئەوەندەی ئۆڕانۆسەکەی من، ئۆڕانۆسەکانی نێو کتێبەکانی کەنیسە، ئیشیان بەو نامەیە،

ئەو کچە تۆراوەی تۆ پێویستی پێ نییە.

باخەوانەکە وەک یەکەم جار بێت ئەو قسانە ببیستێت، لەناکاو دەڵێت:

– ئۆڕانۆسەکەی لای بەڕێزتان، باوکە من دێم، بەسەری رووتی دێم و هەتا ئەوێ ڕادەکەم، تەنها ئۆڕانۆسەکەی خۆم ببینمەوە، خانەوادەی ئێمە پشت بە پشت چاوەڕێی ئەون، ئێمە خۆ کارێکمان نییە جگە لە چاوەڕوانی.

ئەو حیکایەتە لە ناخەوە کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ رادەچڵەکێنێ، ئەو هەموو بەڵگەو دۆکیومێنتەی لەسەر ژیانی ئۆڕانۆس هەیە، قەشەیەک بەو هەموو زانست و باخەوانێک، بە چەندان پشت نەوەوە، جگە لەو هەموو بەرد و پەیکەرە تاشراو و ماڵێکی سیحری، ئامێری مۆسیقا، سەرەڕای ئەو هەموو عیشقەی ئێستا دوای تێپەڕبوونی دوو سەد ئەوەندە ساڵە بەسەر ون بوونی پاشن کینگدا، مۆسیقاو دەنگ و لەرانەوەی تەلی ئامێرەکانی دەبیستن، ئەو هەموو ئارامییەی بەسەر ئینسانەکانی ئەو دەوروبەرەدا دێت، کاکۆ هەموو وردە شتەکان بەسەر دەکاتەوە، کارۆلین، نازانێ چۆن ئەو کوڕە بە ڕەچەڵەک رۆژهەڵاتییە و بە پەروەردە ئەوروپاییە لەو فەنتازیایە رزگارکات. ئەو رۆژە بە پەلە کاکۆ لەو خانووە مۆزەخانەیەدا جێدەهێڵێ و دەڕوات و ئارتووش کوردەی دایکی کاکۆ لە ماڵەکەی خۆیاندا دەدۆزێتەوەو پێی دەڵێ:

–دایکی ئازیزم، فریای کوڕەکەت کەوە لە جیاتی ئەوەی ببێتە کەسێک، کارێکتەرێک لەو زەمەنەدا بژیت، بۆتە پیاوێک لە ناو حیکایەتدا، دوای فەنتازیایەک کەوتووە، بوونی من نایگێڕێتەوە ناو ژیان، ئەو تەنها و تەنها بە جەستە، بە جەستەیەکی وشک و بێ جووڵە لەو دنیایەدا دەژی.

ئارتووش کوردە سەرەتا وا هەست دەکات تووڕەبوونێکی عاشقانەو منداڵانەیە، دواتر دەڵێ:

–بۆ وا بیر دەکەیەوە، کچێکی دیکەی خۆش دەوێت؟

–نا، ئەو بۆتە سەرنشینی مۆزەخانەیەک، ئەو ئیدی ئێمەی ناوێت.

دایکی کاکۆ دەڵێت:

–ئێمە کێ؟ مەبەستت کێیە؟

ئەو دەڵێ:

– من، تۆ، هاوڕێکانی. ئەو کچێکی خۆش دەوێت دوو سەد ساڵ پێش ئێستا لە دەزگیرانەکەی توورراوە، ئەو ئێستا هاوڕێکانی خۆی نابینێ و هەمیشە لەگەڵ مۆسیقاژەنێکی سیحرباز دایە، ئەو گوێی لە مامۆستاکانی ناگرێت و هەمیشە بە دوای قەشەیەکەوەیە ناوی قەشە جۆلیۆسە، دایکی بەڕێزم ئەو باڵندەکانی ئەو دنیایەی گۆڕیوەتەوە بە باڵندەیەک کە کەس ناوی نەبیستووە، پێی دەڵێن باڵندەی تۆس. ئەو باڵندەیە تەواو وەک ئورانۆسە هەرگیز ناچێتە سەر دەستی کەس،

دایکی رادەچڵەکێت و دەڵێ:

– باڵندەی رزگاری؟

کارۆلین لەوپەڕی سەرسامیدا هاوار دەکات:

– تۆش ئەو باڵندەیە دەناسی؟

## سێو

کاکۆ گوێ لە کارۆلین ناگرێت و ئەو ترس و خەیالانەی ئەو بە گاڵتە تێدەگات، بەڵام ئەو رستەیەی زۆر بەلاوە گرنگ دەبێت و ناتوانێ هەر وا بە ئاسانی لە بیری بکات کە بە دایکی گوتبوو، کاکۆ بۆ کارێکتەرێک، کەسێک لە ژیانێکی دیکەدا، لە زەمەنێکی دیکەدا، لە حیکایەتێکی دیکە، ئەو حیکایەت و ژیانی ئێمەی جێهێشتووە، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا نەیتوانی دوای قەشە جۆلیۆس نەکەوێ، بە هۆی ئەو کچەوە کە کاکۆ نەیدەزانی عاشقیەتی یان نا بۆ ماوەیەک سەری لێشێواو ئاگای لەوە برا کە بەچ بیانوویەک جەنابی قەشە نامەکەی وەرگرت، تابزانێ ئەو نامەیە بۆ کوێ دەبات، قەشە جۆلیۆس هەر کە نامەکە لە باخەڵی دەنێت، هەر پێ دەخاتە ئەودیو ماڵەکە، خۆشییەکی ئەوەندە بێباک و سەرمەستانە لە ناخی خۆیدا هەست پێدەکات کە خەریکە بفڕێت، جەستەیەکی سووک و بێ ئێسک و بێ نەخۆشی، لەو خۆشییە زەردەخەنەیەک لە ناخی خانەکانی لەشی هەڵدەقوڵێ، ئەوەندە نییە دەموچاوی لەبەر یەک کاتەوە، بێ باک بە بەینی دارەکاندا دەڕوات، سەیری خانووە هەرە کۆنەکانی شار و شووشە بەندی ماڵە گەورەکان دەکات و دڵخۆشی دەکەن، هەست دەکات ئیمانی لێو ڕێژ بووە و دڵنیا دەبێ باڵندەی تۆس

دەردەکەویتەوە، وەک منداڵێک کڵاوەکەی بۆ هەوا هەڵدەدات، کڵاوەکەش لەوخۆشییە بە ناو هەوادا فڕی و ئەوساو ئێستاش نەگەڕایەوە. بۆ یەکەمجار هەست دەکات، هەر بە راستی هەست دەکات کە پیاوێکی چەند گەورەیەو پاشاو حاکمی شار لە چاو ئەو چەند بچووک و بێدەسەڵات و نەزانن.

کاکۆ ئەو کاتانەی لە تەنیشت قەشە جۆلیۆس دەڕۆیشت هەستی دەکرد کە دنیا لە چاو ئەو، لە چاو گەورەیی و مەزنی ناخی ئەو چەند بچووکە. بە رادەیەک بچووکە کە ئەوەندە ناهێنێ تێیدا بژیت. کاکۆ بۆ لەحزەیەک بێزی لە دەست و لاق و سینگ و شان و هەموو ئەو ئەندامە گۆشتنانەی جەستەی خۆی دەبۆوە، کە بۆنی رزینی داهاتوویان هەراسانی کردبوو، هەستی دەکرد ئەوانە هەڵگری مردنن و شایانی فڕێدان و رزینن، قەشە جۆلیۆس هەر دەگاتەوە بەردەمی ژوورەکەی خۆی دەبینێ باخەوانەکە لەوپەڕی بێهێزیدا لە حەوشەی کەنیسەدا چاوەڕێی دەکات، بەلایەوە سەیرە ئەو پیاوە چۆن پێش ئەو گەیشتۆتە ئێرە و لەوەش سەیرتر بەو ماوە کەمە چۆن ئاوا پیر بووە، چۆن ئاوا تەپیوە، خێرا بەرەو قەشە دێت و دەڵێت:

– باوکە دەتوانم نامەکە بەکراوەیی ببینم؟

باوکە کە نایەوێ لە شاگەشکەیی خۆی دوورکەوێتەوە دەڵێت:

– جارێ!

– باوکە ناتوانم؟

– باشە ئێستا وەرە ژوورێ.

باخەوانەکە نەوازشی پەیکەرێکی مەسیح دەکات، ئەو پەیکەرە لە چاوەڕوانیدا، قەشە روو لە مەسیح دەکات و دەڵێت:

– ئیدی کەسێک لە ژیانی ئەبەدیدا هاوبەشی تۆ ناکات.

قەشە تابلۆی هەرە پیرۆز و هەرە بەنرخی کەنیسەی نیشان دەدات، ئەو تابلۆیەی لە ژێرەکەی نووسراوە تۆسی پیرۆز ئامادەم لەگەڵ خۆتم بەرە هەر کە باخەوانەکە تابلۆکە دەبینێ و سەیری پەڕ و باڵی زەردی باڵندەکە دەکات کە هەتاوی کەوتۆتە سەر گەش

دەبێتەوە دەڵێت:

– هەوە، خۆیەتی. ئەوە ئەو باڵندەیە بۆ سۆراخی نامەکە دێت، تەنها باپیرانی من، تەنها ئێمە دەتوانین ببینین. ئەویش بە تەمەنێک.

لەگەلر ئەو قسەیە چاوەکانی پڕ دەبێت لە ئاو، قەشە بە راستی دەگاتە حاڵەتێکی سەیر، باپیرانی ئەو، باخەوانەکە بۆ خۆی ئەو باڵندەیان دیوە دەڕوانێتە گەشانەوەی ناوچاوی باخەوانەکە، چاوانێک پڕ لە کانی ئیمان، پێی دەڵێ:

–ئیدی ئەمڕۆ بەسە، دەتوانی بڕۆی.

ئەو دەڵێت:

– بەڵێ بەسە ئەوە هەموویەتی.

کاکۆ لەوکاتەدا نەقەشەیە و نە باخەوان، نە کارۆلینە و نە دایکی، نە پەیکەری مەسیحە و نە باوکی خۆشیەتی ئەو باڵندەکەیە، باڵندەی تۆس، بە ناو باراندا دەڕوات و لە هەر شوێنێک بێت تیشک لەسەر پشتی دەشکێتەوە.

قەشە جۆلیۆس چەندان رۆژ بە هەمان لووت بەرزی و دەماغی پڕ هەوایەوە بە شاردا دەسووڕێتەوە، خەڵک هەمووی دەزانن ئەو پیاوە بە پێی خۆی ناڕوات و هێزێک لەودیو ئەو بە دەماغیەوەیەتی، هێزێک لە سەر باڵەکانی هەڵیگرتووە، بە ژێر باراندا دەڕوات و دەڵێت:

– با باران لە پەڕو باڵمان دات.

تەواو دوای یازدە رۆژ لە پەڕوباڵ دەرکردنی قەشە ئەو کاتە سەد و یەک ساڵی تەواو بەسەر ون بوونی ئۆرانۆسدا تێدەپەڕێ، ئەو کاتەی ئەو پیاوەی بە پاشن کینگ ناسرابوو، ئاسەوارێکی لە دوای خۆی جگە لەو نامەیە جێ نەهێشتبوو. پیرە قەشە لەو ماوەیەدا هەموو لاپەڕە نهێنی و کونە شاراوەکان بەسەر دەکاتەوە، چەندان جار ئۆرانۆس دەبینێ و لە چاو ترووکانێکدا ون دەبێتەوە، ئەو پیاوە نهێنییە هەرگیز قسەیەک ناکات و لە ئاوازی خۆی ناکەوێ، هەر وەک چۆن باخەوانەکە گوتبووی «ئەو کوڕە خۆ هەناسەو ژیان نییە بیکوژی ئەو تەنها مۆسیقا و ئاوازە» ئەو رۆژانە ئاوازێک لێ دەدات

وەک لە ناوەندی جەنگەڵەوە بێ، وەک لە ناوەندی دارستانەکانی ئەفریقا ون بووبێت و بانگی ڕاوچیانی خێڵەکەی بکات تا بیدۆزنەوە، هەموو ئەو عاشقانەی ئەو ڕۆژانە هاتبوونە دەوری ماڵەکەی، هەموو ئەوان سەردانی ژوورەکەیان کردبوو هەستیان بەو ئاوازە لە رادە بەدەر نزیک و سەرسامکەر و پڕ هاوارانە کردبوو.

بەیانییەک کە هەست دەکات ئەو باڵندەی ئیمانە هێندەی نامەکە لێیەوە نزیکە نامەکە دەکاتەوە، باران وەک بیەوێ بۆ ئەبەد دنیا راماڵێ دەبارێ، تەمەنی درەختەکانی لەگەڵ خۆی دەبات و نزای عاشقەکان لوول دەدات، شار بە هەموو ماڵەکانییەوە سەر ئاو دەخات، قەشە نامەکە دەکاتەوە یەکەم دێڕی دەخوێنێتەوە و هەست دەکات کچێک بە کراسێکی سەوزی کاڵەوە، بە قژێکی درێژی پڕ بارانەوە، لەو دیو لە پەنجەرەکەی دەدات، بەپەلە دێتە دەرو دەرگای بۆ دەکاتەوە، دەڕواتە ئەو دیوی پەنجەرەکەو دەچێتە ناو باخەکەو دەچێتە بەر باران و هاوار دەکات:

وەرە، ئەوتا نامەکەت لای منە

قەشە نا، نا قەشە نا، کاکۆ یەک سەعاتی تەواو لەبەر ئەو بارانە چاوەڕێ دەبێت، دەگەڕێتەوە جێگەی خۆی و لەگەڵ خوێندنەوەی دووەم دێڕ کچێک لەو پەڕی حوزندا حوزنێک بە قووڵایی گەردوون بە ئاستەم وەک شەبەنگ لەو دیو پەنجەرەکە رادەوەستێ، جەنابی قەشە نا، جەنابی قەشە نا، کاکۆ بێ ئەوەی ئەو فەزایە بشلەقێنێ، لەو پەڕی نەوازشدا سەر بەرز دەکاتەوە، کچەکە ئەوەندە نییە بە شووشەکەدا نایەتە ئەودیو، قسەیەک دەکات:

وەک بڵێت: لەگەڵم وەرە.

وەک بڵێ: هاتم.

وەک بڵێ: لێم گەڕێ با بژیم.

وەک بڵێ: بۆ بە ئاگات هێنام.

دەبێ قەشە قسەیەک بکات، شتێ بڵێت، روودەکاتە شووشەی پەنجەرەکە، ئەو شووشەیەی هەر بەناو ماوە، دەڵێت:

-زۆر دەمێکە ئەو نامەیە چاوەڕێتە، دەبوو.....

کچەی ئەو دیو شووشەکە وەک هەڵم بێت وەک بێدەنگی بێت لەگەڵ دەنگی قەشە دەڕەوێتەوە، کاڵ کاڵ دەبێتەوە، قەشە دەچێتە دەرێ و بنداره و بندار دەگەڕێ، بن پەلک و بن لق لەو گەڵایانە ورد دەبێتەوە ڕەونەقێک لە پەلکەزێڕینە لەسەریان بەجێماوە. دەگەڕێتەوە، بەدوای ئۆڕانۆسدا دەگەڕێ، لە ناو کتێب و لاپەڕەکانی کەنیسەدا دەنگی مۆسیقایەک، لەناو دڵۆپەی بارانەوە دێت، دەنگی مۆسیقا لە قووڵایی دڵۆپە ئاوەکانەوە، دەڵەرێتەوە، قەشە هەست بە سووکی جەستەی خۆی دەکات وەک دڵۆپە باران لە ناو ئاوازێکدا، لە ناو لەرینەوەو گەشکەیەکدا هەڵیان گرتبێ. هەمان مۆسیقا، هەمان سووکی و گەشەکەی کاکۆ لە ناو نوێن و شووشەی پەنجەرە و گەڵا دارەکانی بەر دەرگای خانووە بە مۆزە کراوەکەی ئۆڕانۆس هەستی پێدەکات، کاکۆ بە پلیکانەکاندا دێتە خوارێ و هەست بە وجودی کارۆلین ناکات، کە لەسەر پلیکانەی چوارەم دانیشتووە، ئەو نازانێ داخۆ کارۆلین گوێی لە مۆسیقایە یان نا، ئەو نازانێ کارۆلین ئەو کچە کراس سەوزە کاڵەی دیوە یا نا، کاکۆ نازانێ کارۆلین چۆن بیر لەو نامەیە دەکاتەوە کە دەبێتە دوا پەیامی پاشن کینگ بۆ دەزگیرانەکەی، کارۆلین سەرەڕای ئەو چاوەڕوانییە درێژەی لە جێگای خۆی هەڵناستێ، وەک تەیرێک تازە لە دەستی فڕیبێ، گەیشتبێتە نێو هەوا تەماشای دەکا، لەو پەڕی بێ هێزیدا دەڵێت:

– ئەوەتا لێرەم، نامبینی.

کاکۆ ئاوڕ ناداتەوەو تەواو وەک ئەو کاتەی قەشەکە دەچێتە ژێر باران و دۆستەکانی خۆی نابینێ، کاکۆ دەڕوانێتە بن دارەکان و دەڕوانێتە ئەو بارانە توندە و دەڵێت:

– نەتدی ئێستا هەر ئێستا لەبەر پەنجەرەکە بوو؟

کارۆلین دەڵێ:

-کێ، لەبەر پەنجەرەکە بوو؟

ئەو وەڵام ناداتەوەو دەگەڕێتەوە ژوورێ و دەچێتەوە لای ئەو نامەیەی بە چەوری و چڵکی باخەڵی یەک بە یەکی باخەوانەکان و پەنجەی خۆتێهەڵقورتێنی هاموشۆکەران

ڕەنگی گۆڕاوەو ئەستوور بووە.

قەشە جۆلیۆس ئەندریاس لە ناو سیمفۆنیایەک ون دەبێت کە لە ناخی بارانەوە هەڵدەقولێت، پەرجووی هەرە گرنگ و گەورەی دنیا لە دوای ئەو ڕۆژەوە دروست دەبێت، کاتێک خواوەندی تۆس، کاتێک ڕۆحێک لەو دیو مرۆڤەوە دەنگ بە باران دەبەخشێ، دەنگ بە ئاو و دڵۆپەی هەرە بچووکی دەبەخشێت، قەشە جۆلیۆس پڕ دەبێت، پڕ دەبێت لە مۆسیقای باران ، ئیدی پێویست ناکات بە دوای تارمایی پشت وشەکاندا بگەڕێ، نا ئیدی پێویست ناکات یەکە یەکە لاپەڕەی کتێبەکان هەڵداتەوە تا ئۆڕانۆس بە ئاگا بێنێ و ڕۆحی بەرێتەوە ناو مۆسیقای ئەزەلی، ئەوەتا جۆلیۆس بۆتە مۆسیقا، دێتەوە ژوورەکەی، وەک باوەشێک لە ورشەی ئاو، بەو تەمەنەوە بە دەریایەکی پڕ و بە هەیبەتەوە دەڕوات. دێتە شوێنەکەی خۆی و دەست دەکاتەوە بە خوێندنەوەی نامەکە، ئەو ڕستەی یەکەمی خوێندبۆوە ، گەیشتبووە ڕستەی سێیەم، بەڵام کوا ئەو ڕستانە، بەڵام کوا ئەو وشانە، دیسانەوە کچێک بە کراسی ئاودامانی کەسکەوە، بەڵێ بە هەمان کراسی ئاودامانی کەسکەوە، وەک ئەوەی لە دڵۆپەکانی باران دروست بێت، وەک ئەوەی باران بێت و لە هەوادا ڕاوەستا بێ، بۆ یەکەم جار بزە دەیگرێ، بزەیەک هیچی لێ حاڵی نەبی، قەشە بەو پەڕی لێبووردن و لوتفەوە دەڵێ:

– من نا، دەیان عاشق و سەر لێشێواو نا، وەرە ئەو نامەیە چاوەڕێتە.

کچە بە لەبزێک لە باران دەڵێت:

–ئۆڕانۆس

قەشە هێزێک دەچێتە جەستەیەوە، کاکۆ هەست دەکات ئەوە ئێستا دەنگی کچە دەگاتە گوێی، کاکۆ بە حیکمەتی سوکراتەوە، بە حیکمەتی مەیینی بەردەوە، کاکۆی زەویناس بە حیکمەتی ئەو پنجە گیا ناسکەی بەردێک بە هەموو سەر سەختی خۆیەوە کون دەکات، هەر بە هەمان هەست و ئاوازەوە گوێی بۆ دەگرێت.

–ئۆڕانۆس.

کاکۆ ڕوو دەکاتە کاڕۆلین و دەڵێ:

-گوێت لێبوو، بیستت؟

کارۆلین وەک کۆترێکی لە دەست فڕیبێ، تیشکی بەرەڵا کردبێ، دەڵێ:

-لەچی؟

-ئەو دەڵێ بانگی منی کرد، هەر بەو دەنگەی چاوەڕێم دەکرد، بانگی کردم، گوتی ئۆرانۆس. کارۆلین تەماشای گۆڕانی دەنگ و شێوەی دەکات:

-تۆ ئۆرانۆسی؟

قەشە جۆلیۆس شاگەشکە ببوو، دەیگوت:

- باخەوانەکان لە زیرەکترین مەخلووقەکانی خوان. ئەو دەیگوت:

- خێرا خێرا، من کتێب دەخوێنمەوەو ئەوان زەوی، من لە وشە را دەمێنم و ئەوان گەشکردنی گوڵ، من چاو بەفێرۆ دەدەم و ئەوان ئاو دەدوێنن، من چیم بە چەند کتێبێکەوە هاوار هاوارمە ئەوان باخەوانە بەحیکمەتەکان پاشاکانی دار و درەخت و پەیامبەرەکانی باران و مژدەبەخشەکانی هەور، ئەوان باخەوانەکان ئەمر بە گەڵا دەکەن، فەرمان بە گوڵ دەکەن، داوا لە چرۆ و لاسک و لقەکانیش دەکەن گەشە بکەن و بکرێنەوە، ئەوان سەروەری ژیانن، ئەوان لە پشت گەشەی ئاو و گەورەبوونی کرمی ئاوریشمن.

قەشە جۆلیۆس گوێی لە دەنگی کچە دەبێت دەڵێت:

ئۆرانۆس

جۆلیۆس بە دەنگێکی پڕ برینەوە دەڵێ:

- ئا، ئۆرانۆس.. پاشن کینگ، چاوەڕێتە، تۆ تاکە کەسی ئەو لە خەو هەستێنی.

کچە دەڵێت:

-ئەی پیاوی بە حیکمەت ئەو هەستێ، ئەو مۆسیقا زانە هەستێ، ئەو هەموو عاشقە دەمرن، هەر هەموویان دەمرن، ئەوان بە مۆسیقا لە راوەکەی ئەو دەژین لە هەوادا.

قەشە هەروا خەریکە باڵ بگرێ، نازانێ ئەو دەنگە لە بارانەکەوە دێت، لە شووشەی روونی پەنجەرەکەوە دێت، لەو کچەوە دێت لە پشت شووشەکە وەستاوە، نازانێ ئەو دەنگە لە نامەکەوە دێت، دەڵێت:

– تۆ هیچ مەکە، تەنها نامەکە بخوێنەوە، ئەوە لە کوێ بووی، لە کوێ چاوەڕێت دەکرد؟

ئەو بە هەمان نەبزی بارانەوە، بە هەمان دەنگ و سەداوە، گوتی:

– وەختێک ئەو پاشای دەنگ و مۆسیقایە نامەکەی نووسی من مردبووم، مردبووم ، لە شێوەی سێوێک فڕێدرابووم، سێوێک بۆ بۆگەن کردن. ئەو نەمری بە مۆسیقا بەخشی مردن بە من.

قەشە بە پێکەنینێکی نا ئومێدانەوە گوتی:

–تۆ مردبووی؟ تۆ ئەوەتا دوای نووسینی نامەکە، دوای ئەوەی سەد و یەک دانە ساڵ تێپەڕیوە، زیندوو و پڕ ژیان و جوانی، قسە دەکەی، تۆ کە سێویش بیت، دڵنیا بە سێوی ئاخیرەتی.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ، دەتاسێ و هەر بە دیار ئەو دەنگەوە کە بانگی کردبوو ئۆڕانۆس، بە هەمان خۆشی و گەشکەوە، دەیگوت:

–دە وەرە ئەی سێوی ئاخیرەت، ئەو نامەیە بخوێنەوە و ماڵی عەشق و مۆسیقاو ژیان لە بێ خاوەنی رزگار کە. ئەو ماڵە بۆتە مۆزەخانە، بۆتە جێگایەک لە دەرەوەی ژیان، بۆتە ماڵێک بۆ لە بیرکردنەو فەرامۆشی، تۆ ئەی سێوی ئاخیرەت، تۆ ئەی کەسێکی ناو باران، وەرە نامەکەی پاشن کینگ بخوێنەوە، زەمەن تێدەپەڕێ و سەعات و رۆژەکان لە جەستەدا کەڵەکە دەبن و لە رۆحتدا دەتوێنەوە، ساڵەکان وەک با بەلاماندا دوور دوور لە شار و زیندەگی تێدەپەڕن و نامەی عەشق بەبێ چاوێک حونجەی کات، بێ هەناسەیەک بیدوێنێ، ماڵی وەک ماڵی ئاوات و وەک ماڵی گوڵەکانی سەدەکانی سەرەتا تەریک و بێ خاوەن، لەو سەدەی چاوەڕوانییەدا ئەستێرە هەرە دوورەکان دۆزرانەوە، گیا و ماسییە هەرە بچووکەکانی قووڵایی زەریاکان خۆیان ناساند ئاشتبوونەوە. ئەی سێوی ئاخیرەت عەشق و خۆشەویستی و بەرائەت لەو ماڵەدا بەند و یەخسیرە، چۆن توانیت ئەو زەمەنە دوور و درێژە ئەو هەموو ئینسان و زیندەوەرە بێ عەشق و خۆشەویستی کەی. چ زەمەنێکی رەشە ئەو دەمەی نامەی خۆشەویستی ناگات.

کچە بۆ یەکەمجار وەک کچێکی زیندوو، وەک کچێک باران پاراوی کردبێ ، وەک کچێک بەڵێنی بە دایکی دابێ تاسەری کۆڵان بچێ و بگەڕێتەوە، دەستێک بە لێوەکانی دابێنێ، جێ پێیەکانی دەگۆڕێ، چاو دەبڕێتە چاوەکانی قەشە جۆلیۆس و دەڵێت:

- سێوی ئاخیرەت!

قەشە جۆلیۆس وەک لە ناخیدا، لە قووڵایی بیرکردنەوە و مێشکیدا، خۆرێک هەڵاتبێ، خۆرێکی تازەو پیرۆز، تەواو وەک ئەو خۆرەی رۆژهەڵات گەرم دادێنێ، بەو هێزەوە دەڵێت:

- ئا، ئەی سێوی ئاخیرەت، سێوێک ئادەم لە بەهەشت دەردەکات و تا زبڵخانەی زەوی دەیهێنێ، کچی ئاو بێجگە لە سێوی ئاخیرەت دەوایەکی دیکە بۆ ئینسان نییە تا بیباتەوە بۆ بە هەشت، تۆ ئەو سێوەی هەر هەمووومان بە بە هەشت شاد دەکەیەوە.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ روو دەکاتە کارۆلین و بە چاوێک وەک لەو سەری دنیا بڕوانێ دەڵێ:

- سێوێک بمانباتەوە ناو رێگاکانی خۆشەویستی، سێوێک دەستمان بگرێ، کچێ کارۆلین، کچی بەفر و سەما ئێمە کوێرین کوێر، من لە بیرم چۆتەوە رەنگی چاوەکانی تۆ چۆنن، نازانم لەرینەوەی دەنگت چۆنە، نا سێوێکمان دەوێت، پێی دەڵێن سێوی ئاخیرەت، سێوێک ناوی من و تۆ پێکەوە بنووسێنێتەوە، سێوێک دەستەکانمان پڕ تەزوو کاتەوە و پێستمان بخرۆشێنێ.

کارۆلین وەک کاکۆ لە بیابانێکدا ببینێ، وەکو کاکۆی ون کردبێ، وەکو کاکۆ دووکەڵێک بووبێ و لە هەوادا پەرت بووبێ، وەک کاکۆ لەو سەری دنیاوە قسە بکات و رەنگی بە ئاستەم بگات، پێی دەڵێ:

- سێوی ئاخیرەت؟ سێوێک پێکمان شاد بکاتەوە؟ ئەوە قسەی چ زەمەنێکە؟ کاکۆ کوا ئێمە کوێرین؟ کوا ئێمە رەنگی یەکتر نابینین ؟ کاکۆ ئەوە چ سێوێکە، چ سیحر و پەرجوویەکە باسی دەکەی؟

قەشە جۆلیۆس ئەندریاس سەد هێندەی رۆژگاری باڵندەی تۆس دڵخۆش دەبێت،

هەست دەکات ئیمان نەک لە رۆحی، نەک لە کتێبەکانی، هەست دەکات شارەکە لێو ڕێژ بووە لە ئیمان، دەیەوێت ناو و تەمەن و ڕواڵەتی هەموو باپیرەکانی باخەوانەکان بنووسێتەوە، بە ڕاستی لەوە تێدەگاتە کە باخەوانەکان پەیام هێنن ئەوە تەنها ئەوانن توانیویانە ئەو نامەیە بۆو ماوە دوور و درێژە هەڵگرن. پشت لە دوای پشت حیکایەتی بێبڕانەوەی ئۆرانۆس بگێڕنەوە، بێ ئەوەی تاکە وشەیەکیان لێ کەم بێتەوە، ئۆرانۆس بەرانبەر ئاوابوونی خۆر وەستا، بێ جووڵە خۆر لەو دیوی هەورە شۆڕەکانەوە سوور سوور، باخەوانەکە لەودیو پەنجەرەکەوە خەریکی گوڵێک دەبێت کە رووەو خۆر وەستاوەو با خەریکە بیشکێنێ، گوێی لێیە، ئۆرانۆس دەڵێت:

– «مۆسیقاو خۆر ماڵئاوا»

باخەوانەکە سەرسامەو گومڕا، چ ماڵئاواییەک، بۆ تەنها مۆسیقاو خۆر بێگومان قەشە نەیتوانی خودی ئەو باخەوانە ببینێ، بەتەواویش نازانێ ئەو باخەوانەی ئەمڕۆ ئەو نامەی لێوەرگرت چەندەم پشتیەتی یان نەوەی چەندەمە، بەڵام ئەو دەزانێ باخەوانەکان، وەک خۆیان بەهەمان عەقڵ و دانایی، بەڵام حیکایەتی سەیر و پڕ کەماڵ دەگوازنەوە بۆ نەوەیەکی دیکە.

قەشە جۆلیۆس وەک بۆ خۆی گوێی لێ بێت، وەک لەبەر دەمی ئەودا گوترابێ، پشت بە پشت و نەوە بە نەوە، ئەو باخەوانە پڕ عاقڵانە بەیەکتریان گوتووە:

– ئۆرانۆس رووی لە خۆر ئاوابوون کرد و گوتی مۆسیقاو خۆر ماڵئاوا

دوای ئەوە، خۆر لە شوێنی خۆی وەستا، نەڕۆیشت، هەورەکان تێپەڕین و باڵندە لاق سوورەکان فڕین گەڵاکان وەرین، ئاونگ کەوت و ئەو وەستا، قەشە جۆلیۆس هەموو باخەوانەکان دێنێتە بەرچاوی یەک بەوی دیکە دەڵێت:

– پاشن کینگ کێڵگەکەی ئێمە دەناسێت و دەترسێ دنیا بوەستێ، دەست دەبات و بەسەرە پەنجەی هەرە چووکەڵەیدا دەنگێک لە مۆسیقاو ئەوین، لە هارمۆنیای لەرینەوە دەنێرێ، دوور دوور، باڵندەیەک لەوانەی پێیان دەڵێن لاق سوور بەسەرپشتی نۆتەیەکدا، باڵندەی کڵاوزیویش نۆتەیەک، هۆمای بچووک نۆتەیەک، دەندوک مۆر و سینگ سوور

نۆتەیەک، دەریایەک باڵندە نۆتەکان بڵاودەکەنەوەو خۆر دەجووڵێ و دنیا دەکرێتەوەو ئۆرانۆس غەمبارتر دەبێ.

باخەوانەکان نەوە دوای نەوە، بێ ئەوەی رستەیەک، وشەیەک لەو حیکایەتە بپەڕێنن دەیڵێنەوە. قەشە جۆلیۆس گوێی لێیە.

– ئۆرانۆس کراسێکی ئاوریشمی مارۆنی لەبەردەکات، سوورێک بەسەر رەشدا، پانتۆڵێکی رەش، نەمن، نەرۆحی باپیرە گەورەتان ئاگاداری ئەوە نییە ئۆرانۆس سەفەر بکات، دەبوو ئۆرانۆس مۆسیقا بژەنێ، تا گوڵەکان بکرێنەوە، تا باڵندەکان بفڕن.

ئەوان بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە:

– رۆژانێک کە هەتاو دەڕژایە سەر گوڵەکان، پاشن کینگ لە ژوورەکەی دەهات خوارو پێڵاوێکی نەرمی سپی لە پێ دەکرد و بە لای گەڵاکاندا تێدەپەڕی و پەنجەی بچووکی لە گوێی منداڵە ساواکەی باخەوانەکە دەداو، بە دیار گوڵێکەوە دادەنیشێ و لەگەڵ کردنەوەی گوڵەکە، کچێک بە کراسێکی سەوزی کاڵەوە، دێت و بێ قسە و چرپە دادەنیشێ و ئۆرانۆس سەر دەخاتە سەر شانی چەپی و ئەو دەستە بچووک و پەنجە باریک و درێژەکانی ئۆرانۆس دەگرێ و خۆر پارچەیەک هەر هێندەی سینییەک دوو پەرداخی لەسەر جێ بێتەوە، پارچەیەکی ئاوا لە هەتاو لەسەر سەریان جێدەهێڵێ پێش ئەوەی گوڵەکە بپووکێتەوە کچەکە دەڕوات و ئۆرانۆس بەباوەشی هەتاوەکەدا دەچێتەوە ژوورەکەی خۆی و دەنگی مۆسیقا تا سپێدە، لە قووڵایی ژوورەکە هەڵدەستێ، مۆسیقا وەک قووڵی دارستانەکانی ئەفریقا، مۆسیقا وەک تەنوورەی گێژەلووکە لە پنتێکی نادیارەوە بە تەواوی دنیادا هەڵدەکات.

ئەو باخەوانە دنیا دیدەو پڕ حیکمەتانە بە گەنجی و بە کاملی و بە پیری و بێ ددانی ئەو وشانە وەک پشکۆ لە دەمیان دێتەدەر.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ وەک پاسەوان بەرانبەر بە باخەوانێک دەوەستێ، بە هێمنی ئاگرەوە دەوەستێ، نازانێت چەندەمین نەوەی یەکەم باخەوانە، ئەو باخەوانەی لە

ژێر پەنجەرەکە گوێی لە ئۆرانۆس گرتبوو کە گوتبووی:

– خۆر و مۆسیقا ماڵئاوا. ئەو باخەوانە چاوشینەی ئێستا بەرانبەر ژەنیار وەستاوە دەڵێت:

– هەر وا بزانە من بە گوێی خۆم گوێم لێبووە، من تا ئێستاکە کە لەگەڵ تۆ وەستاوم ئۆرانۆس دەبینم، دەیبینم و وەک تۆ دەستەکانم دەگرێ و تەماشای چاوەکانم دەکات.

هەر کە دەڵێ، وەک تۆ، کاکۆ رادەچڵەکێ دەپرسێ:

– وەک من؟

باخەوان بێ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، دەڵێ:

– تاهەموو چیرۆکەکە نەزانی، ناتوانی بە دوایدا بگەڕێی.

کاکۆ دەڵێ:

– هەموو چیرۆکەکە.

باخەوانەکە هەر وەک باسی گەڵایەک بکات، لە لقێک بڕوانێت کە خۆی پەروەردەی کردووە دەڵێت:

– حکایەتەکانی ئۆرانۆس لێرەوە دەست پێ دەکەن، ئێستاش دەتوانی خۆت رزگارکەی و ئەو ماڵە جێهێڵی.

کاکۆ وەک منداڵ بێت و لە وشەکان نەگات دەڵێت:

– خۆم رزگارکەم.!

باخەوانەکە دەستی کاکۆ دەگرێ و دەیباتە سەر نزیکترین کورسی و دەڵێ گوێبگرە:

– تۆ هیچم بۆ باس مەکە، من درەختەکان دەناسم، ئەو دارانەی رۆژێک لە رۆژهەڵات رواون، هەمیشە تەسلیمی خۆر دەبن و گوڵەکانی لەگەڵ خۆر ئاوادەبن، رۆحەکانی خۆرهەڵات لەسەر زەوی ناژین و هەنگاوێک لە هەوادان.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ ئیدی ناپرسێ چۆن دەزانێ رەگی ئەو لە رۆژهەڵاتەوە هاتووە، لە کۆتاییدا پەیمانی دەداتێ هەر رۆژەی حیکایەتێکی ئۆرانۆسی بۆ بگێڕێتەوە.

## رق

هەر ئەو رۆژە کارۆلین زەرد هەڵگەڕاو سیس بوو، زانی ئەو بێ ئەوەی بڕیاری دابێت، بێ ئەوەی بزانێ کەوتۆتە ناو عەشقێکی رۆژهەڵاتیانە، عەشقێک تا بینەقاقای، دەیدی حیکایەتەکان کاکۆ دەبەن، دەیدی کاکۆ دوور لەو وەک تارماییەک لە پشت هەڵمی ئاوەوە، لەپشت سەرابەکانەوە لەگەڵ باخەوانێک، دەڕوات، ئەو دادێتەوە و پنچکە گیایەکی دەداتە دەست، ئەو تەماشای دەکات و بۆنی دەکات و پێست و دەموچاوی دەگۆڕێت. ئەو دەست بۆ پەلکی گوڵێک درێژ دەکات و ئەو بۆ ماوەیەکی کورت، هەر ئەوەندەی ئاوی دەریاچەیەک ببێتە هەڵم لێی ورد دەبێتەوە.

کارۆلین لەگەڵی دەڕوات، زۆر دەڕوات ئەو کچە رۆژئاواییە ناسکە، ئەو کچە یەک تاکە رەگی هەبوو، ئەویش لە قووڵایی بەفردا، دەتوانێت چ بە ئارتووش کوردە بڵێ، دەتوانێ چۆن ئەوەی بۆ روون کاتەوە، ئەو کوا ئەو کچە سادە و بێ پەناو نهێنییەی جاران ماوە، هەر شتێکی لە دڵدا بێت، هەست بە هەر شتێک بکات وەک خۆی بیڵێ، ئەو بە دایکی خۆی دەگوت:

– دایە ئەمڕۆ کوڕێکم دیت ئاو رژایە رۆحم، دایە ئەمڕۆ حەزم لێیە لەگەڵ پیاوێک بنووم، هەر پیاوێک بێت. ئەو ئێوارانێکی درەنگ بە ئاگا دەهات و دەیگوت:

– دایە حەزم لێیە شەڕابێک، شەڕابێکی سوور بخۆمەوە، ئەوەندەی باپیرم کۆن، بەدەستی ژنە قەرەجێک نرابێتەوە، کوڕێکی ئەو قەرەجە کە هەموو لەشی ماسوولکەیە تا قوڕگم بۆم تێکا.

– دایە هەر ئەوڕۆ ئێوارە من وام حەز نەچۆتە شەڕاب، من دەمێکە حەزم لە شەڕابە، لەو کاتانەوەی فێربووم، لە باوەشی کوڕاندا بنووم.

کاڕۆلین سادە و ساکار، ئەو هەموو فەنتازیای ژنانی شارەکەی خۆی دەزانی، دەیزانی ژنانی شارەکەی لە بارینی بەفرن و لە سپیەتیدا بەفرن و لە ڕووناکیدا بەفرن، ئەو دەیزانی لە بەستندا بەفرن، لە کەڵەکەبوون و خنکانیشدا هەر بەفرن.

ئێستا تێپەڕیبوو، لای کاڕۆلین زەمەنی بەفر تێپەڕیبوو، دەیان ژووری نهێنی لە ناخی ئەودا

کرابوونەوە، بەچ سیحر و ئەفسوونێک رازابووە، ئەو ڕاڕەوە دوور و درێژانەی لە نێوان ژوورەکاندا هەبوون پڕ عەشق و دڵسۆزی و تاخوا حەزکات حوزن بوون، بە کوێدا بگەڕێتەوە ماڵە سادەکەی جارانی، ماڵەکەی بەفر، ئەو ئێستا دەتوانێ چ بڵێ، بڵێ ئارتووش کوردە کوڕەکەت بە فڕۆکە سەفەری نەکرد و لە هەورەکاندا ون نەبوو، بەڵکو بە ناو گەڵاکاندا سەفەری کرد و لە هەڵم و سەرابدا شاردرایەوە، بلێ کوڕە تاقانەکەت زۆر دەمێکە سەفەری کردووە.

قەشە جۆلیۆس ئەندریاس، درەنگ زانی هەموو خۆشنودییەکانی ڕۆح تەنها لەناو خەت و هێڵەکانی کتێبە کۆنەکانیدا نین، زانی خۆشنودییەکانی تەنها لە بەختەوەری دنیادا نین، تەنها لە هاتنەدی ئومێدەکاندا نین، ئەو زانی تێکشکانەکانیش، خۆشنودیان تێدایە، ئەو زانی کامڵبوون لە مردنیشدا خۆشنودییە، زوو زوو ڕووی لە کچە دەکرد، کە نەیدەزانی لە کوێی شووشەکەوە هاتۆتە ژووری، دەیگوت:

– مردن.! تۆ هەرگیز نەمردووی، تۆ بمری ئیدی عاشقەکانی مۆسیقا مانایەکیان نامێنێ، کچی ڕەنگ و سەراب تۆ بمری ئیدی ئۆڕانۆس چاوەڕێی کێ بکات؟ تۆ بمری کوا دەنگ لە کتێبەکانی منەوە دێت ؟ تۆ بمری جارێکی کە باڵندەی تۆس ناگەڕێتەوە، ئیدی

تابلۆی خواناسە پیرەکەشمان باڵندەیەکی تێدا نامێنێ هەتاو لێیدا. مردنی چی ئەی ئاگر، ئەی فریشتە، ئەی خواوەندی تۆس، تۆ بمری ئیدی هەتاو چ مانایەکی هەیە؟

کچە هەر بە هەمان کراسەوە، هەر بە هەمان رەنگ و تەنکییەوە، ئاخر قەشە نەیدەزانی ئەو کچەی لەبەر دەمی وەستاوە لە شووشەکە تەنکترە و روونترە، تەنک تەنک، کچە دەڵێ:

– زۆر پێش ئەوەی ئۆرانۆس نامەکەی بنووسێ، زۆر پێش ئەوەی ماڵئاوایی لە خۆر بکات، من مردبووم، باوکی بەڕێزم خۆ مردن هەر ئەوە نییە تۆ ویردی لەسەر بخوێنی و جەستە پیرۆزەکەی بنێژی، ئەو مردنانە مردنی لەزەتن، مردنی پشیلە و مار و کرم و جاڵجاڵۆکەیە، ئۆرانوس منی لە مانایەکی دیکەدا کوشت.

کوشتمی بێ ئەوەی بە تۆ بڵێ و بمشارێتەوە، ئەو مۆسیقاکەی خۆی دابە گەڵاو گوڵ و بەردو بەسەر هەمووانیدا دابەش کرد و کچ و ژنانی شاری لە خۆی کۆکردەوە، ئەو بەدیار پەپوولەیەکەوە دەگریاو منی دەکوشت، ئەو بەدیار فڕینی مێرووولەیەکەوە گەشکە دەیگرت و منی کوت کوت دەکرد، تۆ نازانی ئەو پاشن کینگەی ئێوە، ئەو رووی مۆسیقاو دەنگە چۆن منی رۆژ بە رۆژ وەک مێرووولە دەکرۆشت.

قەشە جۆلیۆس رادەچەنێ و دەڵێ:

– ئۆرانۆس بە دوای تۆدا هات و مۆسیقا و گوڵ و ئەستێرەکانی جێهێشت. ئەو لەسەر هەناسەی تۆ، لەسەر ترپەی روانینی تۆ مۆسیقای دەژەنی.

کچە ویستی بڵێ «لەسەر ترپەی دڵی من، بەڵام بۆ خەڵکی دەژەنی» دواتر هەر بەهەمان رەنگی خۆیەوە گوتی:

–من دەمویست مۆسیقایەکەی بۆ من بێت، من دەمویست پێکەنین و پەنجەکانی بۆ من بێت، ئەو ژیانی منی دابەش کرد و تەمەنی منی لەت و پەت کرد، من نامەوێ کەسێک لە خۆشییەکانمدا بەشدار بێت، کەسێک پێکەنینەکانم لێبدزێت. من تەنها دەمویست چرکەکانمان بۆ خۆمان بێت.

رەنگی کچە تووڕەتر و پڕ ڕقتر دەرژایە سەر شووشەکە، بارانەکە توتی توتی کەمی

دەكردو گوڵاوەكان وشک دەبوونەوە، رەنگی کچە لە نێوان شووشەکە و هەوادا کاڵ دەبۆوە.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ هەر لەگەڵ باخەوانەکە لەودیو دارەکانەوە دەدوا، باخەوانەکە دارێکی وشکی ئەوەندەی بەرە دەستی خۆی هەڵگرت و گوتی:

– ئەوە دارێک بوو باران دەیشووشتەوە، لە راستی ئەو دارە باران راوەستاوە، مۆسقا نەوازشی مێژووی ئەو دارەی دەکرد، ئەو بەردە رەشەش شوێن پێی ئەو کچەیە کە بۆ دواجار هاتۆتە ئێرە، ئەو بەردە شووشەیە شووشە، تاکە شووشەی رەشە لە شێوەی خۆی لە دنیادا.

بە رای کارۆلین کاکۆ گوێی لە ترسناکترین وشەکان دەگرت، بەڵام باخەوانەکە دەیگوت:

– ئێمە ئاگاداری ژیانی درک و گوڵین، دەبێ رەگەکانیش بژین، ژیان لە درکەکاندا هیچی کەمتر نییە لە ژیان لە ناو گوڵەکاندا، ئەو عاشقانەی زیارەتی ئەو بەردە دەکەن هیچیان کەمتر نییە لەوانەی بە دوای نامەکەیدا دەگەڕێن.

جا بە چاوێکی نیوە داخراوەوە، وەک ئەوەی ناخی کاکۆ ببینێ دەڵێت:

– پرچ رەش تۆ لەکامیانی، بە دوای ئەو بەردەدا هاتووی یان نامەکەی ئۆرانۆس؟

کاکۆ دەڵێت:

– بۆ ئەو بەردە رەشە وەک نامەکە ناوێکی نییە؟ ناوی ئەو کچە چی بوو؟

باخەوانەکە دەست بۆ شوێنێک لە تەنیشت بەردەکە درێژ دەکات و دەڵێت:

– ناو، نا. بەڵام ئەوەتا پەیامی ئەو کچەی تەنها ئەو بەردەی لە دوا جێماوە نووسراوە.

« ئەی رق، تۆ توانا بەخشی هەتا لە بێ ئومێدیشدا»

کاکۆ دەتاسێ، لە هەڵگرانی پەیامی رق، باخەوانەکە دەڵێ:

– ئەوانیش پەیام و شیعرەکانیان زۆر لێرە بە جێهێشتووە یەکێکیان نووسیویەتی:

کەوتم و لە خۆشەویستیدا رزیم.

بوومە بەردەباز و دەیان پێ شێلامی.
خیانەت لە گوڵەکانەوە هاتن.
ژەهر لە دڵەکانەوە رژا.
خۆشەویستی پێم پێکەنی و فڕێیدام.
رق لە دوا ساتەکاندا چەکەرەی کرد و فریام کەوت.
رق هێزی پێ بەخشیم و زیندووی کردمەوە.
ئەی تەلەسمی بەردی رەش من بۆ تۆ دەژیم.
کاکۆ چەمایەوەو دەستی باخەوانەکەی گرت و گوتی:
– حیکمەت لەو هەموو رقە چییە لەبەردەم مۆسیقادا؟
ئەو گوتی:
– حیکمەت لە دنیادا ئەوەیە خۆشەویستی و رق پێکەوە لە دایک دەبن، پێکەوە دەژین.

کاکۆ دانیشت و لەبەردەکە راما، بەردەکە رەش بوو، رەشێکی شووشەیی، کاکۆ دیتی رەشیش لە ناو خۆیدا دەیان رەنگ و مانایە، کاروانە بێ بڕانەوەکان، باران و رووبار، فڕین و دنچدان، خلود و رزین. ڕووی لە باخەوانەکە کرد و پاڕایەوە:
– برا رزگارم کە.
باخەوانەکە وەک کەسێکی دوور و نەناس گوتی:
– من رزگارکەری تۆ نیم.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ بیری لەو باوکە موسڵمانەی کردەوە کە تا ئێستا پەنا بۆ کتێبە سەوزەکەی دەبا، بیری لە دایکە دڵشکا و تەنهاکەی کردەوە کە تا ئێستا ملوانکەیەک کە کەس نازانێ چەند ساڵ لەوەو پێش و لە چ دوکانێک لە شاری مووش کڕدراوە دڵئارامی پێ دەبەخشێ، بەڵام ئەو رەنگە رەشە، ئەو بەردە کە تاکە ئەسەری کچێکە چۆن ئەو نەزەرکردە عاشقەی بەرەو قووڵایی نائومێدی بردووە، چۆن ئەوی تاساندووە، چۆن رۆحی خۆی بە رق گۆریوەتەوە، باخەوانەکە کە لە دوورەوە وەک سێبەری هەڵم وایە، لەبەر چاوی کاڕۆلین دادێتەوەو دەستی کاکۆ دەگرێ، پێیدەڵێ:
– لە چی رزگارت کەم ئەی رێبواری گەنج؟

ئەو دەڵێت:

– لە رق، لە شتێک لە ناخی خۆمدا.

باخەوانەکە دادەنیشێ، وەک برِستی راوەستانی لێ برِابێ دادەنیشێ و وەک هەڵم لەگەڵا هەستێ دەڵێ:

– من هەر لەگەڵ درەختەکان ژیاوم، من تەنها دەزانم گوڵە نارنجی و مۆر و سوورەکان کەنگێ سەر دەردێنن، من تەنها دەزانم ئەو رەنگانە پێکەوە موتوربەکەم و تێکەڵیان کەم و لێکیان جیاکەمەوە، من تەنها دەتوانم نامەکانت پیشان دەم و شیعرەکانت بۆ بخوێنمەوە بێگومان ئەوانەی بە جێماون، من پەیکەرەکانت پیشان دەدەم، نووسینە هەڵکەندراوەکانت بۆ دەبینمەوە، بەڵام رق ئەو رقە تۆ باسی دەکەی، نە لەو بەردەدایە نە لە شوێنێکە من دەستم بیگاتێ.

کاکۆ سەر هەڵدەبرِێ و دەستی دەخاتە سەر سینگی خۆی و دەڵێ:

– ئەوەتا، ئەوەتا رق لە ناخی من دایە، ئەوەتا دەبینم لەو بەردەوە تنۆک تنۆک دەرِژێتە سەر دڵم.

باخەوانەکە دەست دەبات لە پەنا بەردەکە، دارێک دەست دەداتێ و دەیسرِێتەوە، دەڵێ.

– برِوانە کورِی گەنج چی لە سەر ئەو دارە نووسراوە.

کاکۆ دەرِوانێتە ئەو جێگایانەی کە وردە وردە باخەوانەکە دەیسرِێتەوە. وەک ئەوەی لەگەڵ سرِینەوەی رووکاری دارەکە وشەکان بنووسرێن، کاکۆش وەک ئەوەی هەر ئێستا فێری خۆێندنەوە ببێت و بۆ یەکەمجار شتێک بخوێنێتەوە:

«رق ئەی خوداوەندی من لە خۆشەویستی رزگارم کە»

باخەوانەکە دەست بۆ نزیکترین گەڵا دەبات و دەڵێ:

– ئەو بەردە کاتی خۆی لەو گەڵایە سەوزتر بوو.

کاکۆ بەترسەوە دەپرسێ:

ئەو گەڵایە کوا سەوزە؟ ئەو گەڵایە رەش رەشە.

باخەوانەکە دەترسێ و ئەو دارەی بە دەستییەوە بوو، کە پێشتر جوان سرِیبوویەوە، دەخاتەوە شوێنی خۆی و بە کاکۆ دەڵێت:

– بابرِۆین رەنگی ئەو بەردە دەپەرِێتە سەر هەموو شتێک سەرەتا دەپەرِێتە ناو چاو.

## رەش

قەشە جۆلیۆس دەیویست وەک کچەکە کاڵ بێتەوە، کاڵ کاڵ. وەک کچەکە بێ ئەوەی بەردەست و شەماش بزانن هەر بە شووشەکەدا بڕوات و کاڵ بێتەوە و نەبینرێ، بێ ئەوەی بجووڵێ، بێ ئەوەی پەلە بکا وەک گڕکانێک سەدان بارستە بەرد و خاکی لەسەر بێت، دەڵێ:

– ئەی کچی نامە، ئەی کچی دەنگ و رەنگ ئەو نامەیە هی تۆیە، ئەو نامەیە سەدەیەک و یەک ساڵی تەواو لەوە و بەر بۆ تۆ نووسراوە، ئەو پاشن کینگەی خەڵکی هەموو دنیا سەردانی ماڵەکەی دەکەن، لەسەر هەموو وشە و خاڵێکی دەیان کاتژمێر مۆسیقای نووسیوەتەوە دەیان کاتژمێر نۆتە و ئاوازی لێداوە، ئەگەر حەز دەکەی ئینسان گەورەترین خەون و خۆشترین لەزەتی، کە لەزەتی مانەوەیە، لەزەتی تەمەن درێژبوون و پیر نەبوونی دەستکەوێ، وەرە پێش ئەوەی کەسێ بیخوێنێتەوە خۆت بە دەنگێکی بەرز، لە ناخی خۆتدا بۆمان بخوێنەوە، لە چاوی خۆتدا بۆمان بنووسەوە.

کچەی نامە، کچەی بەردی رەش بێ ئەوەی رەنگی چیدی کاڵ بێتەوە، دەڕوانێتە گۆڵاوەکان، دەڕوانێتە دڵۆپە بارانێک کە نایەوێ بەر ببێتەوەو لەت بێت دەڵێ:

– ئەو پاشن کینگی ئێوەیەو پاشن کینگی من نییە، ئەو مۆسیقاژەنی ئەو عاشقە شێت

و ماخۆلیا لێدراوانەیە لە دەوری ماڵەکەی خڕبوونەوە، ئەو منی لە خەودا، لە مۆسیقادا، لە خۆشەویستی و قسەی هیچدا کوشتووە، من دەمەوێت مۆسیقا و نۆتەو لەرانەوەکانی هی من بن، ئۆرانۆس تەنها و تەنها بۆ من بژی، پەنجەکانی لە قژەی مندا گەمە بکەن، ئەو گەورەترین و دڵڕەقترین جەللادە زەمەن ناسیبێتی، من دە ساڵ نا سەد ساڵێکی دیکە چاوەڕێ دەبم، تێدەگات خۆشەویستی گاڵتەی سەر لێشێواوان نییە. دەبێ هەموو بێکارەکانی ئاشنای تێبگەن ئەوین هونەری چاوەڕوانی نییە.

قەشە دەبەزێت، دەبەزێت و کاڵ کاڵ دەبێتەوە، هەر ئەوەندەیە جلە سپییەکانی دەبینرێت، هەر ئەوەندەیە لەرزینی پەنجەکانی دەبینرێت، لەو رۆژەدا، لەو لەحزەیەدا لاپەڕەکی تازە هەڵدەداتەوە، لە کتێبی مەرگ، بە خەتێکی درشت دەنووسێ:

«ئۆرانۆس........ ناسراو بە پاشن کینگ، لەو کاتەوەی من ئەو چەند دێرە دەنووسم، مرد»

کارۆلین نەیدەزانی ئەو تارمایی و سێبەری جووڵەیەی دەیبینێ، کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ و باخەوانەکەن یان هەر تراویلکە و خەیاڵی خۆیەتی، ئەوان چووبوونە قووڵایی دارستانەکەوە، ئەوان زەمەنێکیان لە گێرانەوەی رق بڕیبوو، دوا گێرانەوەی باخەوانەکە، لە خوێندنەوەی نامەی گەنجێکی هیندی دەستی پێکرد، ئەو گەنجە هیندییە هیچ نیشانەیەکی لە دوا بە جێنەمابوو تەنها چەند نامەیەک نەبێت ئەوانیشی لە پارچە پێستێک پێچرابوون، لەسەر پێستەکە بە دەرزی و بەرەنگێکی شەرابی تۆخ نووسرابوو:

«ئەی خودا لە خۆشەویستی و رق پاکم کەوە»

چەند نامەیەک لە یەکەوە پێچرابوون، باخەوانەکە دەیگوت:

– ئەو گەنجە هیندییە ئەو نامانەی نازانم لە چ سەردەمێکدا بۆ ئۆرانۆس نووسیوە.

ئەو دەڵێت:

– ئێمەی باخەوانان لە نێوان دوو گەنجی هیندی بە هەڵەداچووین، گێرانەوەکان ئەو هەڵەیەیان تێکەوتووە، یەکێک لەو دوو هیندییە کچە عەشقەکەی بە دوای دادێت و دەیدۆزێتەوە، چەند ساڵێک لە خانوویەکی باشووری شار لەگەڵ ژنێکی دنیا دیدەدا

دەژین، بەڵام ئەوەیان کە نامەکانی جێهێشتووە هەر لێرە فێری ڤێڵۆنژەنین دەبێت و سەردەمێکی زۆر لەو شارانە گەڕیدە بووە، تا هەندێک پێیان گوتووە «ئۆرانۆسی هیندی من نازانم لێم تێکەڵ بووە هیندییەکەی لەگەڵ کچەی عاشقی رۆیشت یان ئۆرانۆسی هیندی کامیان ئەو نامانەی نووسیوە.

نامەکان تەواو نەدەخوێنرانەوە، هەندێ شوێنیان لەکەدار ببوون، کاکۆ لە نامەکان ورد بۆوە

- ئەی خۆشەویستی لە چ دەریایەکەوە هاتووی وا خنکێنەری، ئۆرانۆس وا من بە تاریکیدا رۆدەچم، لە کوێ زانیت شایانم لەو خۆشەویستییەدا بمکوژە.

نامەی دووەم نەدەخوێنرایەوە، نامەی سێیەم رەش ببوو، نامەی چوارەم تەنها کۆتاییەکەی دیار بوو، نوسیبووی:

- رِق ئەی پاشای من، ئەی فریادڕەس و چارەسەر، بمبەوە، ئەو شوێنەی لە ئەزەلەوە لێیەوە هاتووم، بمبەوە سۆراخی یەکەم هەناسەم لە بوون.

باخەوانەکە نامەکانی پێچایەوە وەک خۆی لە پێستەکەی پێچانەوەو گوتی:

- رق ناگەڕێتەوە دوا.

کاکۆ روانییە پەنجەکانی بە هەمان ناسکی گوڵێک بکاتەوە، نامەکانی دەپێچایەوە پێی گوت: - واتا رق هەر کامڵ دەبێت.

باخەوانەکە گوتی:

- جارێ زووە، بۆ تۆ کامڵبوون زۆر زووە.

دواتر دەستی خستە سەر شانی کاکۆ و گوتی:

- لای ئێمەی باخەوان کامڵبوون بەشێکە لە مردن، لەگەڵ مردن هەناسەیەکیان بەینە، کامڵبوون هەر نییە.

کاکۆ سەرسام و بێ هۆش دەوەستێ، لە قووڵایی خۆیدا، لە ناخی پەرتەوازەییدا، بۆ گەنێک خەریکە بیخنکێنێ، داوای یارمەتی و دەستگیرۆیی دەکات لە رق لە خۆشەویستی تا لە کامڵبوون بیپارێزن.

## بارین

وێنەکەی سەید حوسێنی جیهانگیر لە چوار چێوەیەکی تەختە گیرابوو. نەخشێکی ورد سەر تەختەکەی داپۆشیبوو، کاکۆ وای دەزانی سەید حوسێن لەو دیو دەرگایەکی تەختەوە وەستاوە، سەید حوسێن بۆ خۆشی هەر لەو باوەڕدایە هەرچەندە زۆر دەمێکە مردووە. هەر بە هەمان شەرمنی و سەرسامبوونەوە بەرامبەر ئەو ئامێرە ڕەشەی بە نیازە هەروا بە زیندوویی و بە جلو بەرگی کوردی و ریشووە درێژەکانی جەمەدانییەکەیەوە بیخاتە سەر کاغەز.

سەید یەکەمجار بوو بەرامبەر مرۆڤێکی چاوشینی بە دیققەت دانیشێ، ئەو چرکانە زۆر قورس گوزەران، هەستی کرد جووڵەی هەناسە ورد و لەسەر خۆکانی بە هەمان هێمنییەوە دەچێتە کامێراکەوە. کاکۆ دەیڕوانییە سەید حوسێن و بیری دەچووە سەر کامێراکەی جێمس پۆل براون، هەر ئەو کاتانەی خولیای وێنەگرتنی هەبوو، چەندان وێنەی ئەو سندووقە ڕەشەی گرتبوو، ئەو پۆل براونی وەک کەسێک، وەک هونەرمەندێک، وەک فیداکارێک دەناسی، لە شوێنێک، لە زەمەنێک لە فەزایەکی پڕ باران و تەنهادا بە پێ دەڕوات، ئەو پیاوە بێ پەروا دەڕوات، بۆ ئەوەی بگاتە شوێنێک کە کەس نازانێ ئەو شوێنە کوێیە، بەڵام لە ناخی خۆیدا حەز ناکات لەو فەزایە تێپەڕێ. بەردەوام بەو ڕێگا باریک و پێچاو پێچانەدا تێدەپەڕێ، بەردەوام بە خۆی و کامێرایەکەوە لە ژێر باران لە

ڕۆیشتن دایە، بەفر دەبارێت ئەو هەر دەڕوات، بەفر دەچێتەوە ئەو هەر بەردەوامە، گیا دەردەکەوێت و دنیا سەوز دەبێت، باڵا دەکات و جیمس پۆلڕ براون تا ئەژنۆ لە گیادایە ئەو هەر بە هەمان خێرایی دەڕوات، دەڕوات ڕێگا باریکەکان نابینرێن، گیا زەرد دەبێت و با سەما بە گەڵای دارەکان دەکات، جیمس براون هەر دەڕوات و، هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە سێبەری دارێک بەسەرکاتەوە، گەڵا ڕێزان دەست پێدەکات و دۆڵی دوور و درێژی ئەو وڵاتە لەبەر تیشکی لاری ئێوارە مۆر دەچێتەوە، ئەو هەر دەڕوات و دەست بۆ هەنارێک نابات لێی کاتەوە، بەفر دەست پێدەکاتەوە و تەنها جیمس پۆلڕ براون وەک پنتێکی رەش بە ڕێگا نادیار و داپۆشراوەکاندا دەڕوات، کامێرایەک لە بەرگێکی چەرمدا بە دوای خۆیدا ئەو پیاوەی ڕاکێشاوە، ئەو پیاوەی جگە لە کامێرا هیچ شتێک ناتوانێ بە دوای خۆیدا رایکێشێ، ئەو دەیویست بە سەرۆکەکەی بڵێت:

– ئەوان تێپەڕین و زەمەنیان بۆ ڕێگە چۆڵەکان جێهێشت، ئەوان تێپەڕین و کارگ و ڕێواسەکانیان بە بەردەکانی لا ڕێگا سپارد، سەرۆک ڕێگایەکان ئەوانیان برد، دوور بردیانن، من تاکە کریستیان بووم بەو ڕێگایانەدا دەگەڕام، لەودێ بۆ ئەو دێ، لەو شار بۆ ئەو شار، هەموو دیمەنەکان وەک یەک بوون، کامێراکەم وێنەکانیانی هەڵگرتووە من دڵ ڕەقی، کامێراکەم رەنگە زیندووەکانی کردە رەش و سپی و من خوێنی گەرم و فرمێسک و خەونە سادەکانی ئەوانم کرد چەند دڵۆپە فرمێسکێکی سارد. ئەوان خەنجەر و شمشێریان کردە سەرین و من پیربوونم کردە پەنا. کامێراکەم ئەوانی بۆ ئەبەد گرتە خۆی، منیش بۆ ئەبەد ئاوارە، من وەک دوو پێی هەمیشە بەڕێوە، ئەوان لە کاتی حەپەسان و تۆقیندا، ئەوان بە کەلەپچەکراوی، ئەوان لەبەردەم ژووری قەسابەکاندا، ئەوان وەک خوێنی چۆڕاوە بەسەر سندانی مەرگدا، ئەوان بەسەر براوی لەبەردەم مزگەوتەکاندا، ئەوان.. کچە هەرە ڕوو سوورەکانیان بە دەست چەند شمشێرێکەوە، من تەنها و تەنها رقم هەڵگرت، رقێک بۆ سەیرکردن و رقێک بۆ گریان و رقێک بۆ دوورکەوتنەوەم لە ئینسان.

ئەو دەیویست بە سەرۆک بڵێت:

– کەسێک لەوێ، لەو ڕۆژهەڵاتی ئاگرەدا، ئیدی کەسێک چاوەڕێی بەفربارین ناکات، کەسێک بە دوای کۆخێکی گەیودا ناگەڕێ، هیچ کەس، هەر هیچ کەس دەست بۆ هەنارێکی قەڵشیو راناکێشێ، تاکە گەڵایەکی ناکەوێتە ژێر پێی ڕێبوارێکی.

ئەو لەوپەڕی شێتگیریدا قژی خۆی رادەکێشێ و دەڵێت:

– ببوورە سەرۆکی مەزن، ببوورە لەو کەریەتییە گەورەیەم ببوورە، دەبێ من بزانم ئەو قسانە بەلای تۆوە چەند بێزارکەر و بێبایەخن.

جیمس پۆڵ براون تاکە وێنەیەک دەداتە دەست سەرۆکەکەی، پێش ئەوەی قسەکانی تەواو کات لە دەرگا گەورەکەوە دەچێتە دەرێ، لە پەنجەرەکەوە سەرۆک باڵای بەرز و قژی دەم بای براون دەبینێ، لە ژێر بارانەکە تێدەپەڕێ، کەس بڕوا ناکات ئەو پیاوە باران لێی دات، بێ ئەوەی سەختڵەت بێت و یان شێوەی ڕۆیشتنی بگۆڕێت. براون وەک پەیکەرێک لە دەرگا گەورەکەی کۆشکی سەرۆکایەتی تێپەڕی، بە نیگایەک لەبەردەوە تێپەڕی، براون هەستی کرد لە دوای ئەو وێنە ئیدی ئەو پیاوە سەرۆکایەتی پێناکرێت و ناتوانێ ئەژنۆکانی قیت کاتەوە، ئیدی ناتوانێ بەو ئازادییە گوتارەکانی بدات و گەلەکە راشلەقێنێ، ئیدی هەرگیزاو هەرگیز باسی ئازادی و کامەرانی سەرتاسەری ناکات. براون هەستی کرد با ئەو پیاوە سەرۆکی گەورەترین وڵاتی دنیا بێت! ئەگەر جارێکی دیکە لە کاتی نائاگاییشدا وشەی یەکسانی بەدەمدا بێت، بە دڵنیاییەوە زمانی خۆی لەبنەوە دەبڕێت، ئەوەش وەک راسپاردە بۆ سەرۆکەکانی دوای خۆی بەجێدەهێڵا.

دەگاتە سەر جادە و سواری هیچ نابێت و بە پێ بە لای راستدا دەڕوات، بارانێک خەریکە شار لەگەڵ خۆی بەرێت، دەگاتە بەردەم ماڵەکەی خۆی، ڕۆژنامەنووس لە دەرزی دەرگاو لە وایەری کارەباوە، لە هێڵی تەلەفۆنەوە بەسەریدا دەبارن، لە چیمەن و ئەودیو دیوارە نزمەکانەوە، لە پشت گەڵاو ڕەنگی گوڵەوە چاوەڕێی دەکەن، ئەو هیچ ناڵێ و وەک ڕێبوارێک بەلایاندا تێدەپەڕێ، بە شەقام و کۆڵانەکاندا دەڕوات و جگە لە باران کەس هاوڕێی نییە، ئەو نازانێ ئێرە کوێیە، ئەو نازانێ ئەو هەموو خەڵکە لە کوێ پەیدابوون، بە هەمان هەست و حوزنەوە کە بە کێوەکانی دەوری ئارارات و گوندە

چۆڵ و هۆڵەکاندا دەسووڕایەوە هەر بە هەمان حوزنەوە دەگەڕێ، ئەو هەست دەکات هیچ هەر هیچ هاوڕێیەکی نییە، هاوڕێیەکانی ئەو لە ڕیزی دوور درێژدا بێ هەست و بێ بیرکردنەوە چاوەڕێن، چاوەڕێن چەقۆیەک شمشێرێک ڕەحمیان پێ بکات و لە تەماشاکردنیان دوورخاتەوە.

جیمس پۆلر براون دەیەوێ بۆ چرکەیەک بۆ لەحزەیەک خۆی لەو دنیایە دابڕێ و ئەو نیگا چۆل و ولاتی قڕبوونی مرۆڤ جێهێڵێت و بیر لە سەید حوسێنی جیهانگیر بکاتەوە، ئاخر ئەو ئێستا لە ماڵەکەی ئەودا میوانە، بۆ چرکەیەک ئەو لەحزەیە بێنێتە بەرچاوی کە سەید حوسێن دانیشتووە و دەیەوێت بەو هەموو جلوبەرگ و پشتێن و ئازایەتییەوە بچێتە ناو کامێرەکەوە، پۆڵ زۆری لە خۆی دەکرد وێنەی ئەو پیاوە بگرێت، ئەو زۆری لە خۆی دەکرد وێنەی ئەو کەسانە بگرێت بە نیازن دوای ئەو هەناسەیە هەناسەیەکی دیکەش بدەن، دوای ئەو بینینە بینینێکی دیکەشیان هەبێ، ئەو ئەسڵەن لە بیری چوو بۆوە وێنەی کەسێک بگرێت مردن، مردن بەو پەڕی سۆز و گەورەییەوە لە تەنیشتی نەبێت. ئەو فێرببوو بێ ئەوەی کەس وەستا بێ، یان کەس کەوتبێ و نەمابێ، هەر وا لە دارێک، لە بەردێک، لە هەوا رامێنێ و وێنەی مەرگ وەک خۆی بگرێ، کە زۆرترین ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ هەبوو.

سەرۆک لە نامەیەکدا نووسیویەتی:

«من دەستی جیمس پۆڵ براونم کوشی، حەزم کرد بە دەستەکانیدا خۆشەویستی و ڕێزی هەموو گەلەکەمی بۆ بنێرم، ئەوەی بە چاو و دەم بۆم نەکراوە بینێرم، بەڵام ئەو دەستانە، شتێکی دیکە بوون. هەرگیز نەمتوانی زەن بکەم کێ لە پشت ئەو دەستانەوە وەستاوە»

وەختێک سەرۆک لەو بیرانە غەرق ببوو، دیتی پۆڵ وەک پەیکەرێک لە دەروازەی سەرەکییەوە تێدەپەڕێ، باران وەک هاوڕێیەکی دوور دوای کەوتووە، پۆل دواتر چاو لە کامێراو ڕۆژنامە نووسەکانی بەر دەرگای ماڵەکەی دەپۆشێ و دەچێتە ژوورێ، پیاوەکان لە ناو باراندا تلیسابوونەوە کچە ڕۆژنامە نووسەکانیش جلەکانیان پێوە نووسابوو،

هەموو بەرەو پیری چوون و لە چرکەیەکدا دەیان تیشکی وێنەگرتن دەکەوتنە سەر رووکاری دڵۆپە بارانەکان، پۆڵ خەمی بۆ هەموو فلاشی کامێرایانە دەخوارد کە تیشک و فیلمەکانی خۆیان خەسار دەکرد.

کاکۆ تەنها لێرەدا بە دەنگ دەهات و دەیگوت:

– ئەی مامۆستای کامێراو وێنەگرتن، هیچ لە تۆ خەسار نییە هەر هیچ، ئەوەتا دوای دەیان ساڵ، من بۆوە هاتوومە شارەکەت، بۆوە هاتوومە ماڵەکەت، تاکە وێنەیەکی کامێرا بەرگ چەرمەکەت بگرم، مامۆستای ژووره تاریکەکانی کامێرا، ئەواتا من لەو دیو شووشەکانەوە، لەو دیو جامخانەو پاسەوانانەوەوە وێنەی کامێراکەت دەگرم، ئەو کامێرا تاقانەیەی تۆ هێندەی هەموو کامێراکانی دنیا بەهای هەیە،

## کامێر

کاکۆ کاتێک لەوپەڕی دڵخۆشی و سەرکەوتندا وێنەی کامێراکەی پۆڵ دەباتەوە ماڵێ و ئەو کاتە ماڵیان هەمان جێگاو کووخی خۆشەویستی بوو، باوکی بە چاویلکەیەکی پزیشکییەوە دەهاتەوەو هەڵم چاویلکەکەی دادەپۆشی رووی لە دایکی کاکۆ دەکرد و دەیگوت:

– ئارتۆش تۆ هەر هەڵمی هەڵم.

توند بە خۆیەوە دەگوشی دەیگوتەوە:

– کچێ هەموو دنیا جێدەهێڵم و دێمەوە لای تۆ.

بە لەبزێکی شیرینتر دەیگوت:

– لام وابێ ئەو هەموو کاولکارییەی کوردستان بۆیە رووی دا تا من راکەم و بێم و بێم و بەسەر باڵی تۆوە بنیشمەوە.

ئەو رۆژەی هەمان خۆشی لەو ماڵەدا رژا بوو، کاکۆ وێنەی کامێراکەی جیمس پۆڵ براون و چەندان وێنەی عەنتیکەو شوێنی دێرینی بردەوە ماڵێ، کە دایکی کامێراکەی پۆڵی دیت سەرەتا قسەی نەکرد و ویستی هەروا بە راگوزاری سەیرێکی بکات. دواتر رۆژنامەیەکی زۆر کۆنی هێنا کە وێنەیەکی جیمس پۆڵ براون لاپەڕەی یەکەمی داگیرکردبوو، لە ژێر وێنەکە نووسرابوو: «ئەو پیاوە بدوێ دنیا شەق دەبات» ئەو وێنەیەی پۆڵ هەمان رۆژ گیرا بوو، کە لەگەڵ باران و دەریایەک بیرەوەری رەوەیەک جەللاد دوای دیدارەکەی سەرۆک چووبۆوە ماڵەکەی خۆی. ئەو رۆژەی بڕیاریدا کەس لەو رۆژنامەنووسانە نەبینێ و ئەوەشی بە خیانەتی هاورێ نزیکەکەی و سەرۆکی وڵات زانی کە ئەو هەموو حەشاماتەیان لێ بە ئاگا هێناوە. ئارتۆش ئەو رۆژنامەیەی لەگەڵ سندووقی پزیشکی و چاویلکەو هەندێ کەلوپەلی تایبەتی باپیری پاراستبوو.

## بزمار

دواتر زۆر دواتر کاکۆ لەو دیو دەرگاکەوە گوێی لێ دەبێ، کە دایکی لە شەوێکی قووڵ و تاریکدا بە باوکی دەڵێ:

– کوردە، دەبوو کاکۆ ئەو وێنەیە ببینێ، من هەڵواسرابووم ، بە بزمار داکوترابووم، بزمارە گەورەکان گێڕانەوە نەبڕاوەکانی نەنکم بوون، حیکایەتەکان ببوونە زمانە سوور و درێژ و باریکەکەی نەنکم، کە وەکو تۆ کەوتۆتە بن زمانی هەموومان، دایکم باشترین گێرەرەوەی ئەو حیکایەتانە بوو، دایکم زۆر لە نەنکم باشتر ئەو حیکایەتانەی دەگێڕایەوە، پوورەکانم هەر هەموو حیکایەتەکانیان کرد بۆ گۆرانی، ئەوان ئەو پوورە داماو و شوونەکرد و بێوەژنانەم حیکایەتیان نەدەگێڕایەوە، دەنگێکیان لێوە دەهات کە هەر مۆسیقا و وێنە بوو.

ئارتۆش وەک یەکەمجار بێت و بیەوێ لەودیو دەرگاوە خۆی بە کاکۆ بناسێنێ، قسەی دەکرد، جارجار باوکی دەنگێکی لێوە دەهات، زیاتر لە لاوانەوە دەچوو، دایکی دەیگوت:

– دەبوو کاکۆ ئەو وێنەیە ببینێ، دەبوو دوا بزمار، دوا مێخ راست لە دڵم چەقێنێ.

لەگەڵ ئەو قسەیە کاکۆ هەستی کرد ئیدی هەناسەی بۆ نادرێ و لەوە زیاتر ناتوانێ

لەبەر ئەو دەرگایە دانیشێ کە زیاتر لە دەرگای قەسابخانە دەچێت نەک دەرگای ژووری ژن و مێردێکی ئاوارەو بریندار و عاشق. ئارتۆش دەڵێت:

– وێنەی ئەو کامێرایە، کاکۆ تەنها وێنەیەکی نەهێناوە، وێنەیەک کە حەزی کردووە بیگرێ و بیخاتە ناو ئەلبوومی وێنەی هەموو ئەو شتە عەنتیکانەی هەڵیگرتوون، نا. ئەو بزمارێکی هێنابوو، تا من بۆ ئەبەد داکوترێم، تۆ نازانی ئەو وێنەیە چییە، ئەوە سندووقی هەموو حیکایەتەکانە، دەبینم وەک ئێستا لە بەرانبەرم بێت، نەنکم دەبینم بە دوای منداڵە دوو ساڵانەکەیدا دەگری، دەبینم ڕێچکەی هەزاران ئەرمەنی دەبینم، بە رووتی و برینداری تێدەپەڕن و خوشکە بچووکەکەی نەنکم دەبینم منداڵی دەبێت و دەکەوێ، هەر بە پێوە منداڵی دەبێ، هەموو ئاوڕی لێدەدەنەوە، هەموو ملیانی بۆ لا خوار دەکەنەوەو کەس ناوەستێ، ئەوە وێنەی کامێرایەک نییە لەو دیو شووشەی روون و خاوێنەوە دانرابێ، نا ئەو کامیرایە پارچە میتاڵێک نییە بە ڕێکەوت کرابێتە کامێرا، ئەوە سندووقی ڕۆحی هەزاران منداڵی ئەرمەنییە، پڕە لە ناڵەی نهێنی و هەناسەی ئەو پەڕی شکاوی کچە عازەبەکان، پڕە لەو دەسرۆکەو شووشە گوڵاوانەی ڕۆژێک لە خۆشەویستەکانیان وەرگرتووە لە شوێنێکی جلەکانیان شاردبوویانەوە، ئای ئەو کچانە کچەزاکانی نەنکم، ئامۆزاکانی باپیرەی پزیشکەکەم بە چ ناز و ئولفەتێکەوە پەروەردەکراون و بە چ دڵڕەقییەکەوە هەتک کران...

## ترس

کاکۆ لەودیو دەرگاکەوە، لەودیو دەنگی دایکییەوە بەناو ئەو هەموو شەڕانەدا دەهاتە ڕۆژهەڵات، دەهات و دەیدیت دەشتەکان دەسووتێن و خزمەکانی دایکی بە ناو لچکی ئاگردا خەریکن هەڵێن کە بە ئاستەم لە نێو کاروانی پەرێشانی هاوەڵەکانیان دیارن.

بە هەیبەتێکی دیکەوە دەیڕوانییە جیمس پۆڵ براون، ئەو پیاوە مانایەکی دیکەی دایە کامێراو ئەو سندووقە مێتاڵەی لە بێ گیانی ڕزگار کرد، زانی پۆڵ ئەو پیاوەیە دەبوو بێدەنگ بێت تا دنیا بژیت، دوای ئەوە کەس پۆڵ نابینێتەوە، لە شارەکانی ئەو وڵاتە پێشکەوتووە، لە جادە و میترۆکانی جارێکی دیکە دەرنەکەوتەوە، جارێکی دیکە با هەڵی نەگرت و باران لەگەڵ خۆی نەبرد، لە دوای ئەو ڕۆژەوە گوڵێک یادگاری خۆی بۆ نەگێڕایەوەو بە دیار پەپوولەیەکەوە چاوی پڕ نەبوو لە فرمێسک، دوای ئەو ڕۆژە هەڵمی سەر فنجانی قاوە نەکەوتەوە سەر دەم و چاوی و گریانێکی ناوەخت لە ناخەوە نەیتەزاند.

جێمس پۆڵ براون وەک تەنها وێنەو ڕەنگ بێت و تەنها لە کاغەز و بۆیەش دروست کرابێ و تەواو بۆ ماوەیەکی کورت کەوتە سەر رووکاری رۆژنامەکان و لاپەڕەکانی ئەو وڵاتەی کوشت و بۆ هەمیشە خوێناوی کردن. دەنگەکانی تووشی سەرسام بوون

و بێدەنگی کرد، ئەو وشەکانی فێرکرد، بێگومان تەنها بەو وێنانەی لێی گیرابوون، کە لە قووڵایی ئەو وڵاتەدا دەنگدانەوە نەمێنێ و بمرێ. ئەو بووە پیاوی سەر کاغەز، وێنەگری سەر کاغەز و پیاوی بەفری ناو رۆژنامەکان، ئەو لەوپەڕی شێواویدا بە ناو دێر و لاپەڕەکانی ئەو وڵاتەدا غاریدا وەختێک با لچکی پاڵتۆ شۆڕەکەی دەفڕاند و لە ژێر خۆیدا خەندرکەکانی مردنی دەشاردەوە، ئەو بووە رێبواری ناو باخەکانی عەدەم، نووسیان ئەو وێنەگرەی لەسەر لاپەڕەکان لە دایک بوو هەر لەوێشدا مرد، نووسیان بۆ یەکەم جار رۆژنامە بە ئاشکراو لەبەر چاوی هەمووان بووە گۆڕی کەسێک کە جارێ قسەیەکی نەکردبوو، ئەو پیاوە بووە وێنە و بووە کامێرایەک لە نهێنیدا، بووە کەسێکی نەبوو، ئێستا هیچ کەس، هەر هیچ کەس لەو وڵاتەدا باوەڕی بەدەرکەوتنی کەسێکی وانییە، هەرگیز رۆژێکیان لەبیر نییە ئەو پیاوە لەگەڵ سەرۆکەکیان لەلاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکاندا دەرکەوتبێ، تەنها ئەوەندەی ئەو تراویلکە وجودی هەیە، کە لە خەونێکدا دیبێتیان، جگە لە کامێرایەک لەودیو دیوارێکی شووشەوە هیچ شتێک لە وجودی نەماوە، ئەو خەونەیان بیرخاتەوە، کامێرایەک لەوپەڕی ماتی و غەمگینیدا.

کاکۆ هەر بە هەمان قەناعەتەوە وێنەی ئەو کامێرایەی گرتبوو، بەو باوەڕەی کامێرایەکی کۆنە و بەس، بەو باوەڕەی یەکێکە لە کامێراکانی نەوەی یەکەم، لەوانەی دەکرێ بکرێنە کەلەپوور، لە خوار ئەو شووشە بەندەی کامێراکەی دەپاراست نووسرابوو:

«کامێرای جێمس پۆڵ براون»

لە لاپەڕەیەکیشدا تواناو ژمارەو پێناسی تەواوی ئەو سندووقە مێتاڵە و کارگەکەی تێدا دروست کرابوو نووسرابوو، هیچ کەسێک لەوانەی بە تەنیشتیدا تێدەپەڕین بیریان لەو پیاوە نەدەکردەوە کە مێژووی بەو سندووقە بەخشیوە، وەک پارچە کانزایەک دەیاندیت و بەس. ئەو هەموو هاوار هاوار و گریان و ئاگر و خوێنەی لە ناویدا جێگەی ببۆوە، دوو چاوە بێ ناونیشان و دوو چاوە بەرد و خۆڵەمێشەکانی جیمس پۆڵ براونیان نەدەدی و نەیاندەزانی ئاسۆ لەو کامێرایەدا چەند فراوان و تەمەن چەند کورتە.

کاکۆ ئەو کاتەی ئەو وێنەیەی گرت تەنها بەراوردی نێوان کامێرە تازە و سووکەڵە

و بەتواناکەی خۆی لەگەڵ ئەو یادگارەی براون دەکرد، دەیویست وێنەیەک ببینێ کە بەو کامێرایە گیراوە، نەیزانی بۆچی نەچۆتە نووسینگەی ئەو مۆزەخانەیەو داوای زانیاری زیاتری لەسەر ئەو کامێرایە نەکردووە، ئەوەتا براون لە وڵاتەکەی خۆیدا دەبرێتەوەو کۆتایی دێت، تەنها دەبێتە چەند وێنەک بە لاپەڕەی چەند رۆژنامەیەکی کۆنەوە، ئەمرۆ ئەو رستانەی لە ژێر وێنەکان نووسراون هیچ مانایەکیان نییە،

«بەرد لێو دەکاتەوەو جێمس پۆلڕ براون لێو ناکاتەوە»

«پیاوێک لە وێنەی شاخێکی رۆژهەڵاتدا چاوی بە سەرۆک کەوت»

« کامێرایەک تەرمی ئەرمەنەکان دەگەیەنێتە نیۆرک»

کاکۆ هەر لەودیو دەرگاکەوە، لەودیو دەرگای ئەو ژوورەوە دایکی تێیدا بەسەر وێنەکاندا دەگریا، ئەو رستانەی بیر دەکەوتەوە، ئەو دەیزانی جیمس پۆڵ براون ئێستا لەو ساتە وەختەدا بە تووله رێگا چۆڵ و هۆڵەکانی ئاراراتدا دەڕوات، دەڕوات و گەلایەک سڵاوی لێناکات، دەڕوات و گوێی لە هاشەی باڵندەیەک نابێت. کاکۆ هەر لەودیو دەرگاوە بۆ یەکەمجار و وەک خوێن بەربوونی رۆح گوێی لێیە باوکی دەڵێت:

– تۆ هێمن بە با لە هەنسکدا نەخنکێ، ئەوەتا دنیایەک یادگاری و دنیایەک سەبووریت هەیە، وێنەی باپیرت و هەناسە و سمێڵە درێژ و سپییەکانی، ئەوەتا سندووقە پزیشکییە پڕ دەرمان و ناوی نەخۆشەکانیشی، ئارتووش تۆ ئیدی نابێ بگریەی، پوورەکانت، خوشکەکانی نەنکت، ئامۆزاکانت هەموو هەناسەکانی خۆیان بۆ تۆ هێناوە، هەموو تاسەیەکیان بۆ کردوویە گۆرانی، ئەوەتا کاکۆ لەوبەری دەریاکانەوە وێنەی کامێرایەکی بۆ هێناویەوە، کامێرایەک شاهێد بەسەر دنیاوە، ئەوە منم، تەنهاو بەس دەبێ وەک قامیش رەق ببمەوە، وەک قامیش بایەک لێم بدا ناڵەم دێت.

کاکۆ ڕادەچڵەکێت چۆن لەپشت ئەو پیاوە کامڵ و پڕ حیکمەت و قسە خۆشە ئەو هەموو خەفەت و دڵشکانە هەیە، چۆن لە پشت ئەو باوکە پڕ حیکایەت و پڕ لەزەتە ئەو هەموو غەمگینییە هەیە. ئێستا وا دەبینێ باوکی دارێکە، دارێک تاک و تەنهایە بە یاڵێکەوە وشک وەک بیابانەکانی خۆشنوودی، ئەورووپا، خوێندن و دەرس و گوزەران و

ڕەنگەکانی وەک تۆز و تەم لەو دارە نیشتوون، لەو دارەی کە باوکییەتی نیشتوون و لێی ئاڵاون و شاردوویانەتەوە، بەڵام کەمترین جووڵە ئەو دارە رادەوەشێنێ و دەیگەڕێنێتەوە سەر ئەسڵی خۆی، ئەسڵی ئەو دارە تەنها مردنە، ئەسڵی ئەو دارە گوزەرانێکە، ژیان و هەناسەیەکە لە کوشتندا نەشونومای کردووە، باوکی وەک دارێک هەڵاتووە، با هێناویەتی بۆی نەبووە یان ڕێگای بە خۆی نەداوە ساڵانە گەڵاکانیشی بوەرێنێ. باوکی ئەو دارە تاک و تەنهایە، ئەو دارە بە تەنها بەیاڵێکەوە بوو هەرگیز بە رووتی نەدیتراو هەموو ساڵەکانی تەمەنی غوربەتی بە سیپاڵی بەرییەوە بەسەر برد.

ئێستا کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ بۆ یەکەمجار گوێی لە دەنگی قووڵایی ئەو دارەیە و ئەو دارە رادەژێت و لە ناخەوە دەگریەت. ئەو دارە دەنگی کوێی هێناوە، کاکۆ دەترسێ لە راژانی ئەو دارە دەترسێ، لە خودی ئەو دارە دەترسێ، ئەو دارەش دەترسێ لە جووڵانی خۆی زراوی چووە.

## خۆڵ

کاکۆ چەند مەترێک لە سنوور دوور، لەماڵێکی پۆشتە، لە دێیەکی کوردنشین، ماڵێک ئەوی تەنها بە کوڕێکی پەروەردەی ئەوروپا، ناسک و دنیا نەدیو، سەیر دەکرد، ئەو هاتبوو، ئێستا تەواو دەرکەوتبوو کە چ بایەک لە ناخەوە ئەویان هێناوە، هەمان بای باوکی وەک دارێکی تاق و تەنها هەڵگرتبوو،، ئێستا ئەوی هێناوەتەوە، تەنها بۆ ئەوەیان هێناوە شەوێک بە دیار وێنەیەکی سەید حوسێنی جیهانگیر رەش کاتەوە، کاکۆ رۆژ بە رۆژ لە وجودی خۆی دەکەوتە شک. دایکێک کۆمەڵێک یادگار و چەند وێنەیەکی پزیشکێکی کۆن و سندوقێکی پڕ کەمۆڵەو لیستی نەخۆشەکان، کاکۆ نەیدەزانی ئەو پیاوەی سەر رۆژنامە بۆچی دوای ئەو تەمەنە و دوای مردن و ونبوونی لە چ کونێکەوە سێرەی لەو گرتووە. لە ناو کامێرایەکی کۆنی ناو مۆزەخانەیەکدا لێی دێتە دەرو دەبێتە یەکێکی دیکە لەو گەڵا زەرد نەبووانەی ناو پریاسکە و سندووقە نهێنییەکانی دایکی. ئێستا لەو وڵاتی کوردانە لە یەکەم وێنەداو کە بە دیوارێکی فەرامۆشکراو هەڵواسراوە دیسان جێمس پۆڵ براون دەردەکەوێتەوە و کاکۆ بۆ زەمەنی خۆی دەباتەوە. لای ئەو سەید حوسێن پیاوێک نەبوو لە شەڕکەرە ئازاکانی باپیری نا، سەید حوسێن کاغەزێکی رەش و سپییە لە چوارچێوەیەکدا، دوو چاوی زەردە لەودیو ریشووە جەمەدانەکەیەو،

سمێڵێکی رتووش کراو کورتەکێکی کوردی خەت خەتە، دەشێ جیمس پۆڵ براون تەنها ئەو تاکە وێنەیەی بە ئاسوودەیی گرتبێ و دابێتییەوە خاوەنەکەی، چونکە تاکە خاوەنی وێنەکانی هەر بۆ خۆی بووە.

کاکۆ دەزانێ ئەو وێنەیە نەدراوەتەوە سەید حوسێن تا هەڵیگرێ و ببێتە یادگاری بۆی، نا تەنها بۆ ئەوەیان داوەتەوە بەو دیوارە هەڵواسرێ دوای ئەوەندە ساڵە کاکۆ شەوێک، شەوێکی لادێیەکی کوردەواری میوانی بێت.

ئێستا ئەو لە وێنەکە کشاوەتەوە، لەسەر جێگایەکەی خەریکی جانتاکەیەتی، هەموو شتەکان تەماشا دەکات، یەکە یەکە دەریان دەهێنێ تەنها زۆر بە پارێز دەست بۆ گیرفانەکەی ناوەوەی جانتاکەی دەبات، یادگارە هەرە بە نرخەکەی دایکی بێ پرس و ئاگاداری خۆی لە ناوشتەکانی دەرهێناوە و هێناویەتی و لەوێوە شاردویەتییەوە.

کاکۆ لە منداڵییەوە دەیزانی ئەو دەفتەرە بەرگ چەرمە دایکی لێدەستێنێ، لێیدەسێنێ و دووری دەبات، ئێستا ئەوە دەزانێ کە دایکی وەک تەمێک وەک سێبەرێک لایان بووە، وەک بەرگ و قاوغێک بۆ فەرامۆشی ئەوان ماوەتەوە، وەک ئەو چوارچێوە دارەی سەید حوسێنی جیهانگیری تێدایە، ئا چوارچێوەیەکی دار، رازاوە بە نەخش و هێڵ و نیگار.

دایکیشی هەروا وەک دیکۆرێک لایان ماوەتەوە، دەنا کە دەخزایە ژوورەکەی و ئەو دەفتەرە بەرگ چەرمەی دەردێنا، بێگومان زۆر بە پارێز و نهێنی ئەو دەفتەرەی دەردێنا، نەدەبوو کەس ببینێ و کەس ئاگای لێبێت. کاکۆ تا گەورەتر دەبوو نێوانی ئەو و دەفتەرەکە بەرینتر دەبوو، زۆر زوو لە رۆژانی منداڵییەوە، لە رۆژانی هەرزەکارییەوە بڕیاریدا بوو ئەو دەفتەرە بدزێ، بڕیاریدا بوو ئەو دەفتەرە چەرمە هەڵگرێ و بیبا. سەرەتا نەیدەویست بزانێ چی تێدایە، کاری بە دەفتەرێک نەبوو دایکی لێبستێنێ، دەیویست بیداتە دەست پوورێکی، پوورە هاریازی، ئەو پوورە خڕوخەپەی بەپەلە ئەوی لە باوەش دەکرد و دەیگوت:

– کاکۆی بچووک، کوڕە گەنجەکەی پوورێ،

دواتر دەیگوت:

– ئارتووش تەماشا هەر دەڵێی باپیرەیە. تەنها جانتا و چاویلکە و ریشێکی چەنەگەی پزیشکی نوقسانە.

دایکم بزەیەکی پڕ فەرامۆشی بۆ دەکرد و ئەویش هەر بە پەلە دەچووە ژوورەکەی پشتەوە، ئەو ژوورەی کەوتبوو پشت ژووری نووستنی دایکییەوە، کاکۆ دواتر دەزانێ ئەوێ تەنها ژوورێک نییە لە ماڵێکدا، ئەوێ تەنها ژوورێک نییە لە وڵاتێکی ئەورووپیدا، نا ئەوێ مەیدان و کاروانسەرایە، ئەوێ شوێنی کۆچ و کۆچباری ئەرمەنییەکانە، ئەوێ شوێنی نیگای پڕ ترسی ژنان و کچە ئەتک کراوەکانە، شوێنی کوژرانی ئەو منداڵ و پیروپەککەوتانەیە نەیانتوانی بڕۆن و بە جێمان، دواتر زانی ئەوێ ئەو توولەڕێ باریک و پڕ پێچانەیە جیمس پۆڵ بڕاون بە تەنها و بێ هاوکار و هاوسۆز پێیاندا دەڕوات.

کاتێک زانی ئەو لەو ژوورە، لەو ماڵ و دایک و پوور و کەس و کارە کەسی لە دەور نەمابوو کەس. تاکە شتێک ئەو ژوورەی لە تەواوی دنیا جیاکردبۆوە تەنها ئەو دەفتەرە بەرگ چەرمە بوو هەر ئەو دەفتەرەش ئێستا جانتاکەی ئەوی لە تەواوی جانتاکانی دنیا جیاکردۆتەوە، بە هەمان ئەو سادەیەی جارانی هەر زوو دەست بۆ جانتاکەی نابات و ناشتوانێ هەرگیز لە خۆی دوورخاتەوە، هەستی کرد ئەو شەوە، شەوێکی پەراوێزی دنیا، لە ماڵێکی کوردی سەر سنوور، لە ماڵی نەوەیەکی سەید حوسێنی جیهانگیر دەتوانێ ئەو دەفتەرە چەرمە بکاتەوە و هەموو ئەو نهێنیانەی بزانێ کە تێیدایە و چەندان ساڵە دایکی و خانەوادەکەی لێدەفڕاند.

ئەو تا ئەو کاتە نەیدەزانی ئەو دەفتەرە کەسێک دەفڕێنێ کە دوو باڵی هەبێ ئامادە بۆ فڕین، ئەو نەیدەزانی دوو باڵی ئومێد بەکەڵکی فڕین نایەن، دوو باڵی ناو خەونەکان لەو دەفتەرەدا نین، ئەو دەفتەرە دوو باڵی دەوێت بۆسۆیان لێهەستێ. دوو باڵ راست لەژێر پێستەوە سەر دەردەهێنن و بتبەن، بتبەن، بە دوورگەکانی قووڵایی زەویدا، بە دوورگەکانی قووڵایی زەمەندا بتبەن.

کاکۆ لە زەمەنێکدا، زەمەنێک لە تەنیشتی راکشاوە، ئەو منداڵە و ناتوانێ بچێتە ناوی گوێی لێیە دایکی بە پوورە هاریازی دەڵێت:

– نووسراوە مێخەکەکەی کەوت و ویستی هەڵیگرێتەوە، دەستی بە مێخەکەکەوە بەجێما.

دایکی گوتی:

– من دەچم ئەو گوڵە مێخەکە بهێنمەوە.

پوورە هاریازی دەڵێت:

– کێ دەڵێ گوڵە، کێ دەڵێ ملوانکەی مێخەک نییە.

دایکی دەڵێ نووسراوە:

– بۆنی مێخەک دوامان کەوتبوو، وەک دووکەڵێک بە رەنگی با، بە دوای کاروانەکەدا دەهات.

پوورە هاریازی بە هەمان تاسەوە دەڵێت:

– دوایان کەوتبوون، بۆنی مێخەک بە رەنگی باوە، جەندرمەکان بە رەنگی گڵەوە.

دایکی لە قووڵایی زەمەنێکی دیکەوە، زەمەنێک بە تەنیشتیاندا رەت بێ، بە پوورە هاریازی دەگوت:

– من لەوێم، من لەوێم، ئەوەتا شوێن پێیەکانیان، کاروانێکی خوار و خێچ، بۆنی مێخەکەکە دەکەم، خەریکە دەگەمە سەری، ئەوەتا، نازانم گوڵە یان ملوانکە، دەستێک، دەستێکی بە جێماو خەریکە هەڵیگرێتەوە.

کاکۆ دەترسێ ئەو نازانێ دەستی بەجێماو، کاروانی خوار و خێچ چییە، ئەو منداڵە و میزی بەخۆدا کردووە، هێندەش منداڵ نییە، ترساوە، دایکی وەک ئەوەی سینگی دنیا راوەشێنێ، وەک ئەوەی سینگی پوورە هاریازی راوەشێنێ، وەک ئەوەی سینگی ژوورەکە راوەشێنێ، لە قووڵایی دنیاوە، دەنگی دێت و دەڵێ:

– ئەوەتا، دەستێک بە رەنگی خۆڵ، خۆڵێک تەمەنێک بێت، سەربازەکان لەسەری مەشق کەن، دەستێکی بە جێماوە داهاتۆتەوەو بەو نەرمییەی بیەوێ چۆلەکەیەک بگرێ، مێخەکەکەی گرتووە، ئەو بۆنە، بە نێوان پەنجەکانیدا رەت دەبێت.

پوورە هەریازی دەڵێ ئەوەتا نووسراوە:

– هەمان رەنگمان گرتووە کە ئادەم سەرەتا هەیبوو پێش ئەوەی رۆحی بچێتەبەر.

کاکۆ دەیویست ئەو دەفتەرە چەرمە بدزێت و بیداتە دەست پووری، بیداتە دەستی هەر کەسێک، لە ماڵەکەی ئەوانی دوور دوور خاتەوە و بیبات و لە کوێ دەست بە جێماوە، لە کوێ گوڵە مێخەکێک کەوتبوو، لە بن گڵی نێ.

کاکۆ دەترسا دایکی ئەوەندەی ئەو دەستە بە جێماوە دوورکەوێتەوە، ئەوەندەی ئەو گوڵە مێخەکە دوور بێت. بەڵام ئەو تەنها لە چەند وشە و رستەی راگوزاریدا دەیزانی دەفتەرێکی چەرم، دەفتەرێکی نووسراو بەخەتی کۆن و سەیر خانەوادەی دایکی بە پێوە راگرتووە و لە مردن و لە ناوچوون پاراستوونی. هەمووی پێکەوە کۆکردوونەوە، ئەو دەیویست ئەو دەفتەرەیان بداتێ و دایکیان لێوەرگرێتەوە، ئەو دەیویست ئەو دەفتەرەیان بداتێ و ماڵەکەیان لێوەرگرێتەوە. ئێستا ماڵەکەیان تەنهاو تەنها لەسەر نەخشە لە ئەورووپاو لەو شارە بوو، ئەو تەنها بە ناو لە رۆژئاوا بوو، دەنا ماڵی ئەوان لە شوێنێکدا بوو کەس نەیدەتوانی نەخشەی بکێشێ، کەس نەیدەتوانی ناونیشانی ماڵەکەیان بۆ بنووسێ، ماڵەکەیان تەنها بۆ ئەوە لە جێگەی خۆی بوو، کە لە کاتی گەڕانەوەی لە قوتابخانە پێبزانێتەوە، بۆ ئەوەی باوکی لە کاتی هاتنەوەدا بیاندۆزێتەوە. بۆ ئەوەی دایکی لە کاتی گەشتە نەبڕاوەکانیدا بۆی بگەڕێتەوەو ئەوان لەوێدا بدۆزێتەوە.

کاکۆ زۆر دواتر نهێنی ئەو دەفتەرە چەرمەی زانی، زۆر دواتر توانی تەنها بەرگەکەی ببینێ، بەڵام دەیزانی هێزێک لەو ماڵەدا هەیە، رۆحێک، قودرەتێک لەو ماڵەدا هەیە، بەسەر فەزای هەموویاندا زاڵەو لەو فەزایەدا ئەوان هەن و هەر لەو فەزایەشدا پێکەوە دەژین. کاکۆ لە یەکەم جاردا ترسا، ترساو زارەترەک بوو، کە لە فەزایەکدا بژی لە خۆی گەورەتر و بە قودرەتتر، ژیانی لە دەرەوەی خۆی بێت، هەموو جارێ وەک مەرحەمەتێک، وەک دیارییەک دایکی بدەنەوە.

## خوێن

کاکۆ لە تەمەنی دوازدەساڵیشدا کچێکی لە پۆلەکەیاندا ناسی، کچێکی وردی، چاو کوونە شووشەی لووت بچووک، بەڵام پان، هەر بۆیە ئەو کچەی هەڵبژارد کە نابێ ئەو کچە کورد بێت و نابێ ئەرمەنی بێت و نابێ خزم و ناسیاو بێت و چەندی دەکرێ دەبێ دوور بێت دوور، ئەوەش لە سەرەتای فامکردنەوەیدا. ئەو کچە خەڵکی فنلەندا بوو لە خێزانێکی بە رەگەز کۆری، ئەو کچە ناوی هێوژین بوو، هێوژین وەک کرمێک، تەواو وەک کرمی ئاوریشم وردو باریک و نەرم بوو، بێ پەروا چاوەڕێی کاکۆی دەکرد، بێدەنگ لە تەنیشتی دەڕۆیشت و جار جار چاوە بچووک و بریسکاوەکانی بۆ هەڵدەبڕی و دەیگوت:

– کاکۆ ئەمڕۆ دایکت هێندە دوور بۆ کوێ چووبوو؟

کاکۆ کە دەیویست تاوێک لەو فەزایە دوور بێت کە دایکی گەمارۆی داوە، دەڵێ:

– بۆ تاقگە سەهۆڵەکانی فلندە.

هێوژین هەموو رووداوەکانی ماڵی کاکۆی دەزانی، بێگومان هەر ئەوەندەی کاکۆ ئاگای لێبوو، بۆیە زۆر خێرا گوتی:

– تاڤگە سەهۆڵەکانی فلندە؟ لەوێ لەو وڵاتی بەفرە گوڵە مێخەکی بەجێماو چی دەکات؟

کاکۆ وەستاو هەردوو دەستە بچووک و بێ ئێسکەکانی هێوژینی گرت و گوتی:

– من دەمەوێ دوور برۆین، وەرە لەگەڵم، من جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە ئەو ماڵە، بابچین بۆ تاڤگە سەهۆڵەکان، لەوێش دوور تر، ئیدی من نامەوێ هەرگیز بخوێنم، نامەوێ ببمە پزیشک ڕقم لە دەرمان و سندووقی پزیشکییە.

کاکۆ رووی وەرگێڕاو چوو لەسەر لێوی ڕێگایەکە دانیشت، دەموچاوی بەدەستەکانی شاردەوە هێوژین کە تەنها تۆزێکی مابوو لە تەمی ئەو بەیانییەدا بتوێتەوە، تەنها تۆزێکی مابوو چاوەکانی بەیەک جاری بۆ هەمیشە بنووسێن و کاکۆی لە تەمەکەدا لێ ون بێت، چوو بەو بچووکییەی خۆیەو لەبەردەمی دانیشت و دەستی خستە سەر ئەژنۆکانی کاکۆ سەری خستە سەر سەری، هیچ هیچی نەگوت، وەک دوو کۆتر، دوو کۆتر تازە پەڕ و باڵیان دەرکردبێ و لە هێلانەکەیان کەوتبنە خوار.

هەتاوێکی دوور دوور و سارد، لەوپەڕی بێهێزیدا بەناو تەمەکەدا دەهات و بەریان دەکەوت، دوای تاوێک کاکۆ هەستاو بە ڕێگا باریکەکەی نێوان دارەکاندا شۆڕبۆوە، بە ئاستەم پەنجە وردیلەکانی هێوژینی گرتبوو، نەیدەزانی بە کوێ دەگات، دەیویست بڕوات و هەرگیز ڕێگای ماڵەوە نەبینێتەوە، لەو سەری دارستانەکە لە پردێکی بچووک پەڕینەوە، کاکۆ روانییە ئاوەکە، هەر لە خۆیەوە بێ ئەوەی رووی لە کەس بێت، گوتی:

– لەوسەری دنیا، لەسەری ئەو سەری، خۆر هەموو شتێ دەسووتێنێ و کەسێکی فلندی هەرگیز ناتوانێ چاوی هەڵێنێ، لەوێ کاروانێک بە ڕێگاوەیە، ئەو کاروانە هەر هەموویان دایکمن، لەوێ نووسراوە، قامچییەک لەشیان دادڕ دادڕ دەکات، ئەوان شەکەت و ماندوو، یەکێکیان دەڕشێتەوەو دەکەوێ، یەکیان هەڵدەدێرێ و پشتی دەشکێ، کەسێک نازانم کێتە، بەڵام کڵاوێکی سووری خڕی لەسەرە، من لەو کڵاوانەم دیوە، کچێکیان کە تازە تەمەنی ئەوەندەی تۆیە «هێوژین» دەگرێ و وەک دۆشەکێک دەیخاتە بن دەستی و نازانم چی لێدەکات و دواتر دوای ئەوەی پیاوە سمێڵ پڕو درێژو توورەکە

هەڵدستێتەوە دەنگی تەقەیەک دێت کچەکە دەزریکێنێت، دایکم هەر لەو ژوورەی کە نازانم چی تێدایە دەبووریتەوە، دەبووریتەوەو پوورە هاریزایم لە باوەشی دەکات و دەموچاوی بە فرمێسەکەکانی غەرق دەکات، تۆزێک تەنهاتۆزە ئاوێکیشی ناداتێ و من بچووکم و دەچمە بەردەمی دەرگاکەو یەکێکی دیکە هەڵم دەگرێ و دەمهێنێتە هۆڵەکەو کاروانەکەی رۆژهەڵات هەر بە ڕێگاوەیەو یەکێک لەوان دایکم بەدەستە چەپ رادەکێشێ و ناهێڵێ بەجێ بمێنێ، ئەوان کچە منداڵەکە نابینن، بەڵام لەناو عەرەبانەیەکی سەرداپۆشراو و جۆگەلەی خوێنێک دێتە خوارێ، سەرەتا بە جۆگەلەو پلوسکە دواتر کەمتر و ئێستاش کە من و تۆ قوتابخانەمان جێ هێشتووە و من نامەوێ بگەڕێمەوە بۆ ماڵە، هەر ئەو خوێنە لەو عەرەبانە تەختە سەرداپۆشراوە تنۆک تنۆک دەتکێتە ناو ژوورە پەنهانەکەی دایکم، ئیدی خوا دەزانێ کاروانەکەی بابم چ لافاوێکی خوێن لەبەر دەڕوات.

## هیۆژین

هیۆژین دەڕوانێتە گەلایەک چەندان دڵۆپە ئاوی ڕژاوەتە سەر. ئەو دەیەوێ کاکۆ بگێڕێتەوە، ئەو نازانێ ئەو هەموو وشە پڕ غەم و ئەو هەموو دەنگە نووساو و گریانە لە کوێی ئەو هاوڕێیە کوردە یان ئەرمەنییەی خۆیان شاردۆتەوە، لەو پەڕی ترس و لەو پەڕی شپرزەییدا دەستی کاکۆ دەگرێ و دەڵێت:

– من لەگەڵت دێم، بەڵام ئەو هەموو دەردە مەهێنە، لەگەڵ ئێمە وەرە دەچینە ناو تاڤگە بەستەڵەکەکانی فیلندە، ئیدی لەوێ خۆرێک نییە بتسووتێنێ.

کاکۆ نازانێ لە کوێی ئەو کچەوە بچێتە ژووری، پشتە ساف و نەرمەکەی، چاوە روون و بێگرێ و بچووک و شووشەییەکانی، دڵە یەک ژووریەکەی، دەستە هەمیشەکراوەکانی، ئەو دڵنیانییە داخۆ ئەو دەنگە لەو دەمە نەکراوە و بە ئاستەم کونەی دێت، لە پڕ دەڵێ:

– من تازە ناگەڕێمەوە ئەوماڵە، من تازە ناتوانم دایکێک ببینم هەمیشە بە دوای بۆنێک دەکەوێت و من جێدەهێڵێ، دەیەوێت لە دەفتەرێکی چەرمدا دەستی بە جێماوی کەسێک بگرێت و دەستی من بەجێهێڵێ، دەیەوێت لە دەفتەرێکی چەرمدا گوڵە مێخەکێک هەڵگرێتەوە، دەفتەرەکانی قوتابخانەی من نەبینێ.

هێوژین بۆ لەحزەیەک هەست دەکات چۆتە ناو دنیایەکی دیکەوە، دنیایەک نەسحرە و نە ئەفسانە، بەڵام تەواو جیاواز لە دەرگای، هەستدەکات لەو دنیایەدا هاوڕێکانی و کاکۆش هەر لەناکاو باڵ دەردەکەن و بە ئاسمانی قوتابخانەکەیاندا دەسووڕێنەوە و دەیان گیانداری زەبەلاح و مل درێژ و ددان تیژ لە شێوەی دایناسورەکانی وانەی گیاندارناسیدا بە شارەکەدا بڵاوبوونەوە و لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا ئاپارتمانێکی چەند قات خاپوور دەکەن. ئەو دەبینێ لەسەر رێگا و پەنا فوارەی ئاوەکان ئەو مارە درێژ و لاق ئەستوور و دەمکراوانە دێنە دەرێ و زەوییەکە بە کراوەیی جێدەهێڵن، سەیر دەکات جۆرێک لە باڵندەکان هەر کامیان هێندەی دولی دەبن ئەو بەرخەی لە کارگە دروست کرا لەسەر پەنجەرە و دیواری پەرژینەکان نیشتوونەوە، لە هەوادا جۆرە مێش و مێشوولەیەک دەفڕن. بچووکەکانیان بە قەدەر مریشکێک یان کەڵەبابێکی گەورە دەبن. دڵنیایە کاکۆ بەر سیحرێک کەوتووە، زۆر بەئاگاوە گوێی لێیە ئەو کوڕە بچووکەی هاوڕێی لە ناو سیحرێکەوە قسەی بۆ دەکات کە ناتوانێ لێی دەربازبێت.

هێوژین لەودنیا ئامادەو زیندووەدا کاکۆ دەبینێ هەر بە بچووکی خۆیەوە، بەو دەم و چاوە سپییەوە، بەو سەرە بچووکەی خۆیەوە لە بن دارێک کە لە ناوەندی باخچەی قوتابخانەکەیاندایە، خۆی پەناداوە، دایکیشی بە قژێکی درێژی هەورییەوە، بە دوو باڵی پان و پۆڕەوە، بە دوایدا دەگەڕێ و لەو بەرزییەوە دەست بۆ کاکۆ درێژ دەکات و کاکۆ هەر چەندە دەکات ناتوانێ دەستی بۆ درێژکاتەوە و دەستی دایکی بگرێت و لەگەڵی بڕوات.

کاکۆ هەست دەکات زۆر دوورکەوتوونەوە و زۆریان رێگا بڕیوە، دەستی هێوژین دەگرێت و دەڵێ:

– تۆ بەجێم مەهێڵە، من ناگەڕێمەوە ئەوماڵە، دایکم هەمیشە لە سەفەر دایە و دەرگاکەی توند لەسەر خۆی داخستووە، دایکێکی بچووک و بێدەسەڵات و نەگبەت، دایکم کە پێیەکانی هەر هێندەی پێی من دەبێت، دەستەکانی مەنجەڵێکی ناوەنجی پڕ برنجیان بە هەزار حاڵ پێ هەڵدەگیرێ، دایکێک کە هەموو ساڵی چوار جار لە ترسان تای لێدێت

و لێوەکانی دەبنە تامێسکە، دەرگای ئەو ژوورە سەیر و سەمەرەیە دادەخات و لەگەڵ پوورە هاریازمدا دوور دوور دەکەونەوە. سەد جار تا ئێستا کەوتۆتە ناو رووبارە تیژ و پڕ بەردەکانی ئەوێ، پوورم بە دەستێک هێناویەتەوە دەرێ. ئەو باپیرە پزیشکە فەیلەسووف و پڕ زانستە چ نەخۆشییەکی بۆو دایکە قوڕ بەسەرەم جێ هێشت. ئەو باپیرە پڕ کارەم نەک هەر لستی ناوی نەخۆشەکان و جۆری نەخۆشییەکانی جێ هێشت، بەڵکو هەموو نەخۆشییەکانی بۆ دایکم گواستەوە. تەنهاو تەنها باوکم وەک سیبەرێک، هەر ئەو بوو ئەوماڵەی بە ژیانەوە ڕاگرتبوو، تەنها باوکم بوو نەیدەهێشت ئەو ماڵە ون بێت و بناسرێتەوە، ئەو ماڵە لە هەمان شوێنی خۆی بمێنێ، دایکم ئەو ماڵەی دەبرد، بە وێنە بچووکەکەی منیشەوە، ئەو وێنەیەی تەنها کاتژمێرێک بووم گیرابوو، هێوژین من ناگەڕێمەوە ئەو ماڵە، ئەگەر دەتوانی با بچین بۆو سەری فیلندە، بۆ شوێنەی لەوانەی جوگرافیادا خوێندمان، ئا بۆو شوێنەی ماڵی بچووکیان لەناو بەفرە دروست کردووە، بۆ ناو ژوورە بەفرینەکان.

## هۆستاشی

ئەوان لە پەنا دارێک دانیشتبوون، هێشتا کەلوپەلی قوتابخانەیان پێ بوو، دانیشتبوون و سەریان بە شانی یەکتر کردبوو، کاکۆ دەستی لە ناو قژە رەش و خاوو نەرم و پڕختووکەکەی هیۆژین وەردەدا. هیۆژین نەیدەویست ئەو کوڕە تەنها و ترساوە جێهێڵێ، نەیدەویست ئەو برادەرەی بداتە دەست دارستان، هەر بیریشی لەوە نەدەکردەوە، چونکە لەوکاتەدا کاکۆی بەتەواوی بە بەشێک لە جەستەی خۆی دەزانی.

زۆر جار بیری لەوە دەکردەوە، دەشێ کاکۆ بە خۆی و ئەو ناوە سەیر و سەمەرەیەوە، بە خۆی و ئەو خەیاڵە پڕ ترس و خەمبارانەیەوە لە فیلیمێکی هاری پۆتەر هاتبێتە دەرو لە بیری چووبێتەوە بگەڕێتەوە ناوی. راستە چەند ساڵێکە دەیناسێ، وەک خەیاڵ و سێبەر لەناو قوتابییەکاندا دەهات و دەچوو. هیۆژین لەگەڵ ئەو هەموو فیکر و بیرە بڵاوانە ناترسێ و بەلاشییەوە سەیر نییە بیباتە دنیایەک ئیدی ماڵی بە ماڵ نەچێت و ئینسانی بە ئینسان نەچێت و گیاندارەکانی مەخلووقی دیکەبن.

کاکۆ پێی دەڵێ:

– دەچین، ماڵێک تەواو لە بەفر، ماڵێک چۆلەکەکانی لە بەفربن، دارەکانی، قەڵەم

و تەلەفزیۆن و کێک و پسکیتەکانیان لە بەفرین، ئاسکە تووک درێژەکان بەفرین. من جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە ئەو ماڵە.

کاکۆ هەرچەند هاوار دەکات و دەنگی هەڵدەبڕێ ناتوانێ تۆزقاڵێک لەو دەنگە کەم کاتەوە کە هەموو ماڵەکەیانی تەنیوە و هەمیشەش بەدواوەیەتی. دەنگێک نە هی باپیریەتی و نەهی پووره هاریازی و نەهی مامە ون و پووره نەدیتراوەکانی خێزانەکەیەتی، دەنگێک قورس و سەنگین و ڕەوان لەو دیو دەفتەرێکی چەرمەوە دێت، لە ماڵە نهێنییەکانەوە پووره هەریازی لەگەڵ خۆی دەیهێنێ، ئەو دەنگە هەواڵەکان دەگەیەنێ، بەلای دایکیدا تێپەڕیم، ببووە خۆڵەمێش، دیوارەکانی بەسەر لاشەی منداڵ و سەگی پیری ماڵدا لار ببوونەوە و هێشتا نەکەوتبوون، بیرە ئاوەکە چیدی قوڵپی نەدەداو، دار قەیسییەکان لەبن بارستەی خۆڵەمێشێکی لەبن نەهاتوودا چاوەکانیان بۆ هەڵنەدەهات.

ئەو دەنگە لەو پەڕی قووڵی خۆیدا دەیگوت:

– ئارتووش لەو گوندە، لە ماڵێکی لاچەپەک و رووخاودا، لە پشت بیرەکە، منداڵێک بۆ پێڵاوە داکەندراوەکەی دەگەڕێتەوە، دیوارەکە کە ئەویش دەمێک بوو چاوەڕێی دەکرد بەسەر دەرگای ماڵەکەدا بڕووخێ، دایک و باوک و براکانی دەبەن و لە پەنا بیرەکە کەڵەکەیان دەکەن و دەیانسووتێنن، ئەو منداڵە جارێک لە سووتان رزگاری دەبێت و جارێک لە خانوویەکدا بە تەنها دەرگای لێ دادەخرێ، ئارتووش ئەو منداڵە پێڵاوێکی دۆزیوەتەوەو تاکەکەی دیکەی دیارنیە، بە دوای پێڵاوە سەر بە گوڵێنکەکەیدا دەگەڕێ.

کاکۆ گوێی لێیە پووره هاریازی لە پڕ هاواردەکات:

– مەچۆ ئارتووش تۆ مەچۆ، ئەوە من دەچم، من دەچم و ئەو منداڵە دێنمەوە، ئەو منداڵە دەبێ رزگاری بێت.

کاکۆ بەو منداڵییەی کە ئێستا لە بیری نییە سێ ساڵ بوو یان چوار پشتی بە دەرگاکەوە دەدا، دەیەوێ دڵنیا بێ دەرگاکەی ژووری دایکییەتی، هی ئەو ژووره بچووکەی پشتەوەیەو ناکرێتەوە، دەیەوێ دڵنیا بێت دایکی نایەتە دەر و ناڕوات، سەرەڕای ئەوەش گوێی لێیە پووره هاریازی دەڵێ:

– مردی ئازیزم، مردی، منیش دێم، دێم و تاکە پێڵاوەکەی بۆ دەبینمەوە.

ماوەیەک بێدەنگ دەبن، کاکۆ هەست دەکات ئەوان وەک دوو کۆتر لە هەور نزیک بوونەوە، هەست دەکات باڵەکانیان ناجووڵێنن و هەوا هەر بۆ خۆی دەیانبات، هەست دەکات ئاسمان خاوێن و نەرم و شێدارە، دەترسێ بایەک هەڵبکات و تێکیان شکێنێ، دەترسێ، ترسێک دەیەوێ میز بە خۆیدا بکات، لەو دیو دەرگاکەوە دەنگی گریان دێت و گریانێکی بە کوڵ، بەڵام کپ کپ.

گوێی لێیە بێگومان لەو دیو دەرگایەکە، ئێستانا ئەوکاتەی تەمەنی چوار ساڵ بوو، پوورە هاریازی دەڵێت:

– پێڵاوەکەی، من دڵنیام شین بووە، ئەوەتا هەتاو رەش رەشی کردووە.

دایکی دەڵێت:

– بمرم، سەد جار بمرم بۆت، هەر تواوەتەوە، تەنها ئەو پەنجانەی، ئەو ئێسکە باریک و وردانەی پێی چەپی ماوە، ئەویش لە ناو پێڵاوەکەدایە.

کاکۆ هەر وەک ئێستا گوێی لەو قسانەی پووری بێت دەڵێ:

– من ناچمەوە، جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە ناو ئەوماڵەوە.

هێوژین دەڵێ:

– باشە دەچین، دەچین بۆ ماڵێک هەر هەمووی بەفر بێت، بەفرێک ئاگری لەسەر بکەینەوە، من چووم، لەوێ ماڵی سادە و ساکاری لێیە، پشتی گەورە و دۆشەکی نەرمیان هەیە، هەر لەسەر بەفرەکە ئاگردانیان دروست کردووە، هەر ماڵەی رەوەیەک کارمامزیان هەیە، دەچین، بەڵام رێگای ئەو خانووانە بەو دارستانەدا تێناپەڕێ.

کاکۆ تاوێک ئاسوودە دەبێ و ئارام دەبێتەوەو دەڕوانێتە چاوە ورد و برۆ باریک باریکەکانی هێوژین و دەست لە بژۆڵەکانی دەدات و دەڵێ:

– رێگاکەی بە هەرکوێدا بێت من دێم، بەڵام ناگەڕێمەوە ئەو ماڵە کە هەمیشە خۆرێکی لەناودایە دەیسووتێنێ، خۆرێک تەنها مردووەکان دەڕزێنێ. خۆرێک سەد هێندەی ئەو خۆرەی رۆژهەڵات گەرم ئەوەی لە قوتابخانە خوێندمان:

هیۆژین دەڵێ:

– دەبێ بگەڕێینەوە ناو شار، پێڵاوی ناو خوری و جلی ئەستوور بەرین، دەبێ بچمەوەماڵێ و پێیان بڵێین، دایکم هەموو شتێکمان پێدەڵێ، یارمەتیمان دەدات، من هەر لەگەڵت دێم.

کاکۆ هەڵدەستێ و پاڵ بە دارێکەوە دەدات و دەڵێ:

– تۆ دەتوانی، دەتوانی بڕۆی، بچییەوە ماڵێ و چی دەکەی ئازادی، من نایەم من جارێکی دیکە نایەمەوە ئەو شارەش، ئێستا ماڵی ئێمە پڕ پڕە لە دەنگی پوورە هاریازی، دەنگی پوورە هاریازی بە ناو مردووویەکدا دێ، بە ناو بارانێکدا دێت لە ئاسمانی مەرگەوە باری بێت، بارانێک مانای ژیان نەزانێ، بارانێک بە منداڵێک نەکەوتووە جارێک چووبێتە قوتابخانە. دەنگی ئەو پوورە ئاگرەم بە ناو باغی بەهەشتدا بڕوات، بەناو کاروانی بووکاندا بڕوات، دەنگی ئەو پوورەم بە قووڵایی زەریای هێمندا تێدەپەڕی وشکی دەکات، وشکییەک بە فویەک ئاگر بگرێت. تۆ دەتوانی بڕۆیت، تۆ ناچار نیت دوام کەویت.

هیۆژین دەڵێت:

– تۆ دەبێ دوعاخوازی لە بابت بکەیت، با ئەو پیاوە سەرگەردان نەبێت.

کاکۆ رستەیەکی بیرهاتەوە کە لە وانەی مێژوو دەیانخوێند، قەشەیەک رستەیەکی سەیری بۆ خودا بەکارهێنابوو:

«خودا کتێبێکە هەرگیز نایخوێنینەوە»

بۆیە ئەو گوتی:

– بابم کتێبێکە بۆ خوێندنەوە نابێ، ئەو کتێبێکە هەرگیز سەیری خۆی ناکات، لاپەڕەکانی خۆی ناکاتەوە.

هیۆژین دیسانەوە سەرسام بوو، دیسانەوە دەترسا، دەترسا کەسێک لە پشت ئەو هاوڕێیەیەوە قسە بکات، هاوڕێیەکی دوانزە ساڵان ئەو هەموو ترس و دڵەڕاوکێ و فەنتازیاو حیکمەتەی لە کوێ بوو. هەموو لەحزەیەک هەستی دەکرد لە پشت کاکۆوە، لە پشت ئەو هاوڕێ نزیک و دڵسۆز و پاکەیەوە کەسێک دەردەکەوێ، کەسێک کە تەنها

دەنگی لە مرۆڤ دەچێ دیار دەکەوێ. ئەو بە راستی دەترسا ئەو کەسە کەنگێ لەگەڵی هاتۆتە ناو دارستان و بەسەر پردەکەدا پەڕیوەتەوە و ئەو هەموو ڕێگایەیان بڕیوە.

دەترسا کاکۆ نەبێت و یەکێک بێت لەو ژنە سیحر بازانەی لە حیکایەتەکان و فیلمەکانەوە ناسیونی، بۆ نابێ، دەبێ یەکێک لەو سیحربازانە هەر لەوکاتەی ئەو لە سینەما سەیری کردوون، یان گوێی بۆ گرتوون، هەر ئەو کاتە ئەو سیحربازە ئەویان دیاری کردبێ و حەزیان کردبێ بیهێنن بۆ ناو دارستانەکە و بە راستی دەترساو نەیدەویست بیر لەو حیکایەتەش بکاتەوە کە دایکی دەربارەی کچێکی کوری بۆی گێرابۆوە.

کچێکی کۆری دەکەوێتە دەست چەند جەردەیەکی دەریاو لە دورگەیەک لە دەستیان هەڵدێ و خێڵێک لەو سیحرباز و جندانە دەیدۆزینەوە، راستە رزگاری دەکەن و ناهێڵن بمرێ و شیری گیایەکی دەدەنێ پێی دەڵێن

«شیری گیای هۆستاش»

هۆستاش ناوی پیرەی گەورە و پاشای ئەو خێڵە نەدیتراوە دەبێ، بەوە ناسراوە پێ لەسەر دەریا دابنێ دەبێ جوولەی نەمێنێ و پێی بەسەر زەویدا بنێ دەبێ وەک دەریا بجوولێ، ئەو شیرە کچە کۆریەکە رزگار دەکات، بەڵام کاتێک دەیەوێ بگەڕێتەوە ماڵێ ناهێڵن. هەوڵدەدات لە دەستیان رزگاری بێت، هەڵدێت لە کەنار ئاوێک دەڕشێتەوەو لەو جێیە چڵە گیایەکی هۆستاش شین دەبێت و کچەش دەبێتە پارچە تەختەیەکی تەنک و لە شێوەی گەڵایەکی سەوزی رەنگبردوو دەکەوێتە سەر ئاوەکە، تا ئێستا هەر کۆرییەک لە تەنیشت ئاوی دەریا رەت بێ، دەست بۆ هەموو ئەو پەلکە گەڵایانە دەبات کەوتوونە ئاوەکەوە بەو نیازەی ئەو کچە بە تەختەبووە بدۆزنەوە.

هیۆژین لەگەڵ ئەو حیکایەتە ڕادەچڵەکێت و قسەی ئەو مامۆستایەش کە لە کۆتایی حیکایەتەکە هەر بۆ گاڵتە دەیگوت:

«ئەوە مام هۆستاشە شێوەی کچە کۆرییەکانی بە شێوەیەک گۆڕیوە لە هەموو شوێنێ بناسرێتەوە» ئەوەندەی دیکە دەترسێ خەریکە رۆحی بکێشێت. ورەیەک دەداتە بەر خۆی و دەڵێ:

– کاکۆ ئەوە دەڵێی چی، باوکت کوا کتێبە، من دەبینم جانتایەکی رەشی پێیەو بەسەر جادەکاندا دەڕوات و سواری پاس دەبێت و لە دوکانەکەی سەر کۆڵان فستق و کشمیش دەکڕێت، جارێک قەڵەمێکی درێژ و سووری بۆ منیش کڕی وێنەی بابەنۆیلی لەسەر بوو، هەر کڵاوەکەی ئەویشی پێوە بوو، کوا کتێب دەڕوات و قەڵەم دەکڕێت و فستق دەخوات، کوڕە کاکۆ تۆش لە بیرت چۆتەوە کێی، دەڵێی هۆستاشی پیری قسە دەکەی.

کاکۆ تاوێک هێمن دەبێتەوەو دەڵێ:

– هیۆژین، چۆن هۆستاشی پیرت بیر کەوتەوە، خۆزگە کچ و کوڕی مام هۆستاش باین، خۆزگە لە بنی دنیا، لە ماڵێکدا ماڵێک وەک ئەو ماڵە سەیرانەی لە فیلمیدا دیومانە ژیابانین، خۆ هیچ نەبێت شەوێک لەسەر ئەو جۆلانە نەرموخۆشانەیان بە ئاسوودەیی دەخەوتن کە جالجالۆکەکانیان دروستیان کردووە.

هیۆژین جاریکی دیکە هەست بە وجودی کاکۆ دەکات و لێی نزیک دەبێتەوەو دەڵێ:

– هۆستاشی پیر هەرگیز ناهێڵێ بگەڕێینەوە ناو شار، لە مردن رزگارمان دەکات و ژیانمان لێ دەستێنێ.

کاکۆ هەمیشە رێگایەکی بۆ هەڵاتن دەگرتەبەر، دوای ئەوەی هۆستاشی پیر نادۆزنەوە دەگەڕێنەوەو هەموو نهێنییەکانیان دەدەنەوە بەیەک، وەک دوو منداڵ هیچیان نەدیبێ دایکی بەڵێن دەدات هەرگیز کاکۆ جێ نەهێڵێ، بەڵێین دەدات لە رۆژی لە دایکبوونی هەموو پۆلەکەیان بانگهێشتکات و هەر لەو ماڵەدا کێکێکی گەورەیان بۆ دروست کات.

ئەو رۆژە باوکی هەموو هاوڕێکانی دلخۆش کرد، سەرتاپا جلوبەرگێکی سەیری لەبەر کردبوو، ئەوەی لە کۆگاکان دەیفرۆشن و پێی دەڵێن «بەرگی هۆستاشی». لە باخەڵ و گیرفانە قووڵەکانیدا شتی سەیر و سەمەرەی تێدابوو، لە ناو باخەڵێکدا مژمژەیەکی تێدابوو کاتێک دەتمژی وەک پشیلە دەیمیاواند، لەیەکێکی دیکەیان بەلەمێکی لاستیکی بچووکی دەرهێنا کە دەتکردەوە دەنگی رۆیشتنی ئاوی لێدەهات، لەیەکێکی دیکەیان قەڵەمێکی سەرپانی دەرهێنا وەک مراوی لە کاتی نووسیندا دەیگوت غاک غاک، کاتێک

ویستیان کڵاوەکەشی لێبفڕێنین لە ژێرەوە دوو باڵندەی بچووک دایانە شەقەی باڵ.

کاکۆ و هێۆژین لە هەموو منداڵەکانی دیکە زیاتر بەو جلوبەرگەی هۆستاشی پیر سەرسام بوون و وەختێک کاکۆ هەوڵی دەدا گاز لە لووتە بەرز و باریکەکەی هۆستاشی بگرێت، تامی قاوەیەکی خۆش و کرێمدار ڕژایە دەمییەوەو بیری لەو گیایە کردەوە کە پێیان دەگوت گیای هۆستاشی و شیرێکی لێ دەرژا کچە کۆرییەکەی بۆ هەمیشە کردبوو گەڵایەک لەسەر ئاو.

## جانتا

ئێستاش کاکۆ دوای تەمەنێک لە ژیان لەگەڵ هۆستاشی پیر و چەندانساڵی خولیای وێنەگری و گەڕانی چەندان وڵات و سەردانی چەندەها مۆزەخانەو ژیان لەگەڵ ئەو وێنانەی لەگەڵ خۆی دەیهێناتەوە، سەرسام بوون بەرانبەر پاپیەکەی ئەنیشتاین و گریانی نەبڕاوەی بۆ حیکایەتە درەنگ وەختەکانی باوکی و ژیانی هەمیشەی لەگەڵ باخەوانەکەی ماڵی ئۆڕانۆس و دیتنی دەیان پەیکەری بەرد و دار و قوڕ و خوێندنەوەی سەدان نامەی دوا لەحزەکانی ژیانی و فڕین، فڕینی راستەقینەو تەواو لەگەڵ باڵندەی تۆسدا، ئێستاش لە ژوورێکی بچووکی لادێیەکی کوردنشیندا، ژووری تەنهاو چوار دەور گیراو بە بەفر بەرانبەر جانتاکەی دۆشداماوە، جانتایەک نە ئەوەیە بوخچەیەک بێت بۆ سەفەرکردن و نەئەوەشە باڵ بێت بۆ فڕین.

ئیدی لەبەر چاوی جانتا نەمابوو، جارێک یادگار و جارێک بۆنی عەتری باوکی و فرمێسک و خەمەکانی دایکی و سەد جاریش دەفتەرێک، دەفتەرێکی بەرگ چەرمە وەک گەردەلوولێکی پێچراوە وەک کارەسات و دنیایەکی پڕ خوێنی نووستوو، وەک ئاگرێک، ئاگرێکی پڕ سەرە ئەژدیها بە سیحر و جادوویەک لە لۆکە پێچرابێ.

ئەو لە ژوورێکی دوورە دەست و پەراوێزی دنیا، لە ژوورێکدا کە زەمەن و ساتە

وەختی تەمەنی نەبێت هیچی هەر هیچی لەو وڵات و ژیان و شارانە نەچێت ئەو لێیانەوە هاتووە. لەودیو جانتاکەیەوە دەبینێ کارۆلین بە دوو چاوی شووشەیی و سەوزییەوە، بە دوو چاوی بێ ئومێدی و دووره دەستییەوە تەماشای دەکات، تەماشاکردنێک بێ ئەوەی ئومێدی وەڵامدانەوە یان ئاوڕدانەوەیەکی هەبێ. ڕاستە ئەوی لەو شارە قەڵەباڵغ و سیخناخانە جێهێشتووە، بەڵام بە لاشییەوە سەیر نەبوو لەگەڵ کردنەوەی جانتاکەی، جارێک لە جاران ببینێ لەناوی دانیشتووە.

کاکۆ جیمس پۆڵ براونی لە دوای خۆیەوە جێهێشتبوو، لەناو دارە وشک و برینگەکانی ئەو وڵاتەی پێیدا تێپەڕی، دوور دوور دەیدی جیمس پۆڵ براون بەلەز و پرتاو بە ڕێگا باریک و پێچاوپێچەکاندا تێدەپەڕێ و گەلایەک، لقەدارێک، کرووسکە هەرمێیەک تەماشای ناکات و سەری بۆ بەرز ناکاتەوە. کاکۆ ئێستا دەیەوێ لە چاوە مۆلەق و کراوە و سەرسامەکانی سەید حوسێنی جیهانگیری ڕزگاری بێت و کەڵک لەو ماوە تەنهاییەی خۆی وەرگرێ، تا زنجیری گیرفانەکەی ناوەوەی جانتاکەشی کردەوە ئاسایی بوو، تا دەفتەرە چەرمە قاوەییەکەشی دەرهێنا هەر ئاسایی بوو، دەفتەرەکە بە دوو پارچە چەرمی لە ڕەنگی خۆی و قایم بە سترابوو، لە ناوەندیشی بە گرێی قوڵفە بەسترابوون، ئەو دەفتەرە چەرمە هەر لە سەرەتادا لە کیفێکی وەک نایلۆندابوو، کیفەکەی لە تەنیشت خۆی داناو قوڵفەکانی سەر بەرگی دەفتەرەکەی کردنەوە، تاوێک نەیتوانی لێکی بکاتەوە، هەستی کرد بۆنی دایکی لێدێت و شوێن پەنجەکانی بەسەر پەتەکەو ڕووکاری بەرگەکەوە دیاربوو، بە سینگییەوە نووساندو چاوەکانی داخست، هەستی کرد بایەک لە ناخی دەفتەرەکەوە هێواش و توند هەڵدەکات و ڕاست وەک ڕێگایەک بێت سەد ساڵ بێت دۆزیبێتییەوە خەریکە پەڕ دەکەن و لێک دەکشێنەوە، دوو هێز لەلای ڕاست و چەپییەوە سەر دەردێنن و خەریکە پێستی شەق کەن و دەرکەون، ئەو وەک دارێک بێت بۆ گەشەکردن، چاوەکانی نوقاندووە و چاوەڕێی فڕینە. ئەو وەک دارێک بێت، ئەو وەک کانییەک بێت بۆ هەڵقوڵین، ڕووبارێک بێت بۆ لافاو، زەریایەک بێت بۆ گەردەلوول ئەو وەک برینێک بێت بۆ دەمکردنەوە بۆ کێم و جەراعەت.

چاوەکانی نوقاندبوون بەرگی دەفتەرێکی چەرم و نەرم بە سینگیدا دەخشاو، بیری لەوە دەکردەوە ئەو دایک و پوورەی چۆن ئەو هەموو ماوە لەگەڵ ئەو دەفتەرە و سەرنشینەکانیدا ژیاون گەڕاونەوە و بۆ هەمیشە نەیبردوون و لەگەڵ هەورێکدا فڕێیان داونە دوورگەیەکەوە. دیتی وێنەکەی سەید حوسێن چوارچێوەکەی رادەوەشێنێ، رەنگی فەرشەکە هەستاوەتەپێ، ئەو دەگریا ئەوە چ دزییەک بوو کردی، ئەوە چ نەگبەتییەک بوو لەگەڵ خۆی هێنای، ئەو دەیویست باوکی و دایکی لەگەڵ خۆی بێنێ و ئەو دەفتەرە جێهێڵێ، بۆ ئەبەد ناونیشانی نەدۆزێتەوە.

## با

من که ئەو حیکایەتەتان بۆ دەگێڕمەوە وەک بەشێک لە هەموو کەسێک، لە هەموو ژان و مردنێک گوزەرابێ بەسەر کاکۆدا دەفڕیم، وەک بەردێک شۆرابێتەوە، وەک ئەو بەردانەی لە قووڵایی دەریاکاندان، یا لە بنی چۆمە بە خوڕەکان لووس و سەوز بوون، بێ هۆش و بێ عاتیفەو بێ بیرکردنەوە. دەمەوێت لەگەڵ کاکۆ ئەو بەو گیانە برینداره‌یەوە، من بەو رۆحە بەردەمەوە، ئەو بە هەموو وجوودی ئەوروپایانەیەوە من بە هەموو رقی رۆژهەڵاتیمەوە، شان بەشانی ئەو لەگەڵ ئەودا هەموو شتێکتان بۆ بگێڕمەوە.

سەرەتا دەمویست تەنها لەگەڵی بچم بۆ باخچەی ئۆڕانۆس، سەرەتا تەنها دەمویست ئەو باخەوانە دنیا دیدەو ژیرەم پێ بناسێنێ، تەنها دەمویست ئەو لاپەڕە کاڵەوەبووەی لەگەڵ بخوێنمەوە کە پاشن کینگ جێهێشتبوو، من تەنها و تەنها مەبەستم بوو بەشێکی بچووکی کاکۆ بگێڕمەوە ، بەڵام نووسینی سەر ئەو هەموو گەڵایە بردمی، ئەو گەڵا لولکراوانە، من ئەوەی لەو باخەوانە فێربووم، نە لە سوکرات و نە لە ئایەتە پرشکۆکانی هیچ هەورێکدا نەمدیوە، ئەو پەیکەرە لەبەرد تاشراوانەی لە چاوەڕوانی ئۆڕانۆسدا دروست کرابوون، هێڵ و شوێنکاری مۆسیقایان بەسەرەوە بوو، دەنگی پڕ خەم و قووڵی

ئۆرانۆسیان لێ دەڕژا، هەر یەکە لەو پەیکەرانە دەست شوێنەوار ناسەکان بکەون سەد هێندەی پەیکەرە زێڕەکەی زیۆس نرخی بۆ دادەنێن. من تەنها ئەوەندەم دەویست رۆحی بەردینی خۆم لەو حیکایەتانە هەڵکێشم.

کچەی سەوز، کچەی شووشە، کچەی یەک گەڵا، نازانم کچەی چی ناوبنێم، ئەو کچە سەدو یەک ساڵ دانی بە خۆیدا گرت و نەچوو نامە ئاوارەو بریندارەکەی ئۆرانۆس بخوێنێتەوە.

ئەو کچە سەوزە بارانەی لە پشت شووشەکانەوە جۆلیۆسی پیر و پڕ ئیمانی لەگەڵ خۆی برد، من تەنها و تەنها دەمزانی رووی بەردینی من بەرگەی فڕینی باڵندەی تۆس دەگرێ بە یەک جار بفڕێت و بۆ یەک جار ناوی بێت، با بەردبم و لەو بەردانەش بم دەیان جار لە بورکاندا سووتاون، دەیان جار بە جۆگەی ئاگردا تێپەڕیون، چەندان جار لە ناو ئەو ئاگردانەدا لەگەڵ ئاسن و مس و خاک و یۆرانیۆم تواومەوەو سووتاوم. با لەو بەردە رەشانەش بم، کوا بەرگەی دیتنی باڵندەی تۆس دەگرم، باڵندەی تۆس وەختێک لە تابلۆیەکی ئیماندارێکی کۆن و پیر و قامیشیدا هەتاو لەسەر باڵەکانی دەدات و ئەو باڵندە بێ خۆراک و ئاوەش لەناو باراندا تێدەڕێ.

من گوتم باوەک بەردێک لە گرکان بە جێمابێ و ئاو لووسی کردبێ و قەوزەی هەڵهێنابێ و لەگەڵ کاکۆ بژیم و ئەو حیکایەتانەی لەگەڵ بگێڕمەوە و لەوپەڕی لەتبوونی ئەودا گەر پێشنەکەنم بێدەنگ وەک بەرد لەبن سێبەرێک خۆم بشارمەوە.

بەڵام ئەو دەفتەرە کە ئەوە تەنها کاکۆیە پێی دەڵێ دەفتەر! دەنا هیچ ناوێکی لێنانرێ، دەشێ شارێکی سەربەخۆ یان وڵاتێکی ون یان نەتەوەیەکی لەدەستچوو بێت، هەموو بیرکردنەوەکانی منی شەقو پەق کرد و لە بەر سیڕەی هەڕەشەکانی خۆی راگرتم و وەک رۆح لەبەرێکی بێ کەس و بەستەزمان و پڕ کارەسات و کوشتنی لێکردمەوە.

ئەو شەوە لەو ژوورە کوردانەی رۆژهەڵاتەوە تەنها من ئاگاداربووم و بەس، تەنها من دەمزانی کاکۆ لە چ ماڵێکدایە، تەنها من دەمدی هەرکە کاکۆ سەری بەسەر دەفتەرەکەدا شۆڕ دەکردەوە چۆن سەید حوسێنی جیهانگیر لە وێنەکەی دەهاتە دەرو لەگەڵ ئەو

سەری بە سەر لاپەڕەکاندا شۆڕ دەکردەوە. من دەمدی سەید حوسێن چەند تامەزرۆی ئەو دەفتەرەیە، چەند نزیک لە کاکۆ خۆی بەسەر دەفتەرەکەدا شۆڕدەکردەوە.

لەسەر چەرمە قاوەییە رەشەکەی بەرگی یەکەمی وێنەی تایەی گالیسکەیەک هەڵکەنراوە، پارچە قوماشێک کە دیار نییە لچکی ژنێکە یا پارچەی دڕاوی کراسێکی ژنانەیە، لەسەر تایەکەوە شۆڕ بۆتەوەو بەشێکی کەوتۆتە ژێر تایەکەو هەندێکیشی بایەکی نادیار دەیهەژێنێ، وشەیەک لە ژێر تایەکە هەڵکەندراوە، سەید حوسێن پەنجە قامیشی و فەرامۆش کراوەکانی لێدەخشێنێ، من نازانم ئەو دەزانێ ئەو خەتە بخوێنێتەوە یان هەر لەبەر خۆیەوە دەڵێت «سەفەری با» دواتر هەر بە هەمان تۆن و هەر بە هەمان غەمگینییەوە دەڵێت «نەعلەتی تورک» من نازانم ئەو وشە هەڵکەندراوە کامیانە، بەڵام لەوە تێدەگەم کە ئەو وشەیە لەوانە پڕ حوزنترە، لەوانە پڕ کارەساتترە، لەوە سەر پڕ خوێنترە بنووسرێ یان بخوێنرێتەوە. هەر وەک ئەوەی کەسێک لە ناو گەردەلوول و لافاوی دەریادا بخنکێ و دەزگیرانەکەی گوڵێک لەسەر گۆڕەکەی دانێ و لە گەڵایەکی بنووسێ «ئاو».

## کاروان

کاکۆ لەو هەموو ڕێکەوتە نیگەرانە و نازانێ بۆ دنیا هێندە لەیەک دەچێ، بۆ جیمس پۆڵ براون لەو وڵاتە قەڵەباڵغ و پڕ دۆکیومێنتەی خۆیدا ون دەبێت و لە ناو زورگ و تووڵە ڕێتمی وڵاتێکی دوور و تەریک بێ پەروا دەگەڕێ و ئەو نازانێ چ هێزێک ئەو ڕادەکێشێ دوای وێنە گرتن بکەوێت و چەندان ڕۆژی خۆی بەسەفەرکردن بەسەربەرێ و بچێت وێنەیەکی کامێراکەی براون بگرێت. ئەو دەڵێ:

– خودایە ئەو دەفتەر و ئەو وێنەی کامێرایەی من گرتم چەند لێک دەچن، بۆنی ئەو کامێرایە چەند لە بۆنی ئەو دەفتەرە دەچێ، بۆنی هەردووکیشیان چەند لە بۆنی ئەو پیاوە باڵا بەرز و بێدەنگەی سەید حوسێنی جیهانگیر دەچێ.

ئەو وێنەیە زۆر دەمێکە لەسەر ئەو دیوار و ئەو دیوار دەگوازرێتەوە، ئەو وێنەیە عومرێکە لە چاوەڕوانیدا وەستاوە، کاکۆ دەفتەرەکە دەکاتەوە، ئەوە ئەو لەحزەیەیە ئەو وێنەیە بۆی دەژی، دەفتەرەکە دەکاتەوەو دەڕوانێتە لاپەڕەی یەکەمی، ترسێک دەڕژێتە ژوورەکەوە، بۆنی تۆز هەراسانی دەکات، دەترسێ ڕۆبچێتە زەمەنێکی هێندە قووڵەوە نەکرێ بگەڕێتەوە، قەڵەمەکەی هەڵدەگرێ و نامەیەک دەنووسێ، ئەوە چ نامەیەکی بێ ئەمەکییە کاکۆ بۆ دایکی دەنووسێ.

«دەبوو زۆر زوو تر ئەو نامەیەت بۆ بنووسم، ببوورە دایکی ئازیزم من دەفتەرە هەرە بە نرخەکەی تۆم دزی، لە ناو هەموو شتەکانتدا، کە هەر هەموویان بۆ من گرنگن تەنها دەفتەرەکەتم دزی، هەر لە منداڵیمەوە دەمزانی لە ناو ئەو ماڵەدا شتێک هەیە تۆم لێ دەستێنێ، شتێک هەیە لە من گرنگتر بۆ تۆ، من بە پێچەوانەی رای تۆ باوکم و مامۆستاکانم منداڵێکی تا بڵێی دەبەنگ بووم، هەموو ژیانی خۆم واز لێهێناو دوای ئەو دەفتەرە کەوتم، تۆ هەرگیز رێگات نەدا چاوم پێی بکەوێ، زوو زانیم دێوەزمەیەکی ئاوا لە ماڵمان دایە، هەر ئەو کاتە کە پوورم دەهات و منتان لە خەو دەکردو خۆتان دەچوونە ژوورێ، گوێم لە دەنگتان بوو سەرەتا لە خەودا و دواتر بە ئاگا دەهاتم، تۆو هەرگیز ئەوەت نەزانی کە لاوانەوەکانت نەیانهێشت بۆ تاکە چرکەیەک بێ گریان ژیان بە رێ کەم و بە ئازادی بژیم، بۆ تاکە چرکەیەک دڵخۆش بم، پێکەنین و گاڵتەکانم هەموو درۆ بوون، من ئەمرۆ تەنها ئەوەندەت پێدەڵێم، کە من دەفتەرە پیرۆزە بەرگ چەرمەکەتم دزیوە، ئەم شەو رێگام بە خۆم داوە، بە تەنها، لە ژوورێکی کپ و دوورە دەست بیخوێنمەوە، ببوورە دایە گیان ئەوەم لەبیرچوو تەنها وێنەیەکم بەرامبەرە کەهی پیاوێکە بە ناوی سەید حوسێنی جیهانگیر، کە ئەویش بە نیازە ئەو ژیانە کەمەی ماوەمە وێرانی کات، زانیم کە ئەو وێنەیە بە کامێرای جیمس پۆڵ براون گیراوە»

کاکۆ، دوای ئەو نامەیە ئاسوودەتر دەستی بە خوێندنەوە کرد.

یەکەم لاپەڕەی دەفتەرە چەرمەکە لێی نووسرابوو «کاروان»

دواتر بە خەتێکی ورد تر:

(دوای ئەوەی کوڕەکەم یەعقوب بووە چل رۆژ، چوومە کەنیسە بۆ لای باپیرم، بۆ ئەوەی منداڵەکەم پیرۆز کات، لە کاتی ماڵئاوای ئەو دەفتەرەی دامێ تا لەو رۆوە بیرەوەرییەکانم کە پێشتر لە دەفتەرێکی سپی کارگەدا نووسیبووم، لەوە دوا لەو دەفتەردا بیاننووسم، لەگەڵ دەفتەرەکە نامەیەکی دامێ کەناوی کوڕەکەم و رۆژی لە دایک بوونی و مۆری کەنیسەی پێوەبوو)

کاکۆ بۆ یەکەم جار هەستی کرد ئەوە دەفتەری ژیانە، ئەوە نووسینەوەی هەناسە و

لەحزەکانە، ئەو سەدا پڕ مردنەی پووری لە کوێی ئەو دەفتەرەوە دەهات.

لە دامێنی لاپەڕەی یەکەم، بە خەتێکی جیا نووسرابوو

(ئەی ئەرمەنی لە هەر جێگایەک هەی پێ بە خۆڵەمێشدا مەنێ، دەشێ گریانێک لە ناخیدا نووستبێ).

لێرەدا زانی ناکرێ بەپەلە ئەو دەفتەرە بخوێنێتەوە، کاکۆ تێڕوانینەکانی دایکی بۆ خۆڵەمێش دەهاتە بەر چاو، لە ناو ماڵ و لە سەیران و سەفەردا هەمیشە پەنجەیەکی دەکرد بە خۆڵە مێشەکەدا وەک ئەوەی منداڵێک لە خەو هەستێنێ، ئەو کاتە لەوە نەدەگەیشت هەر وای دەزانی پەیوەندی بەو هەموو خۆشەویستییەوە هەیە، کە باوکی بۆ ئاگر هەیبوو. لە دیوی دووەمی لاپەڕەی یەکەم نووسرابوو:

(ماڵەکەی ئێمە لەسەر تەپۆڵکەیەک بوو، چەند ماڵی خزم و ناسیاومان لە دەوربوون، لە دامێنی گردەکەوە دیم دەوری ئەو ماڵانە گیراوە، من تۆقیم و گریام، گریام و هاوارم کرد، ژنێکی بە تەمەن کە ماڵەکەیان لە دامێنی گردەکە بوو دەستی راکێشام و دەمی گرتم و بردمییە ماڵەکەی خۆیەوە. ئێستا لە ماڵەکەی ئەوان دام ئەو لاپەڕەیە دەنووسم.

ئەو ژنە ناوی ئەڤینتوو بوو، گوتی:

– لەبەر خۆت نا، لەبەر منداڵەکەت بێدەنگ بە.

(ئەڤینتوو دەچێتە دەرەوە و بە پەلە دێتەوە و بەکوڵ دەگریا، بەڵام هیچناڵێ، ئەو ژنە دەم و چاوی دەبێتە بەرد، لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوە دەکەم، ئاگر هەموو گردەکەی داپۆشیوە، دووکەڵ دەمخنکێنێ.)

کاکۆ دەفتەرەکە دادەخاتەوە، بە دوو پارچە چەرمەکەی ئەو لاو ئەو لای دەیبەستێ، بەو نیازەی هەرگیز نەیکاتەوە، دەیخاتەوە بنی جانتاکەی، هەست دەکات هەناسەی تەنگە، هەست دەکات دووکەڵ دەیخنکێنێ، نایەوێ بەسەر خۆی بێنێ، دەست دەخاتە بن سەری و چاو دەنووقێنێ و دەیەوێ بنوێ، نیوە شەو هەڵدەستێ و لە دیوی دووەمی ئەو لاپەڕەیەی نامەکەی بۆ دایکی تێدا نووسیوە، دەنووسێ:

(ببوورە شاژنی خەم، ببوورە هەڵەم کرد، تەنها لاپەڕەی یەکەمم خوێندەوە زانیم

شاژنی چ عەرشێکی وێرانی، زانیم تۆ هەمیشە دەچوویە ناو دنیایەکەوە کە ژیان و مردن مانایەکی زۆر جیاوازیان هەیە، ئێستا تێگەیشتم بۆچی ئەو هەموو دالاشە لەسەر ماڵی ئێمە لەنگەریان دەگرت. شاژنی من زانیم تۆ چەند میهرەبانی کە ئەو دنیایەت جێ دەهێشت و بۆ لای من دەگەڕایەوە)

## شووشه

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ، من کوڕی ماڵێکم خەیاڵێکی نەدامیٔ بۆ ڕۆژەکانی خۆم، چاوێکی نەدامیٔ بۆ دیتنی رایەڵەکانی تەمەنم، ئەمڕۆ لە خێزانی ئێمەدا نەبوو، ئەمڕۆ سەردەمێک بوو بۆ گێڕانەوە، گێڕانەوەی کارەساتە قووڵ و بیٔ ژمارەکان، کارێکتەرەکان وەک با بە ناو ماڵەکەماندا بڵاوببوونەوە، وەک قاپ و کەوچک و نوێن لەو لای و لای ماڵەکەمان دانرابوون، من کوڕێکم بە زۆر دەیانگێڕامەوە ناو مێژوو، جەستەم رای دەکرد و دایک و باوکم بە نەعلەت دەکرد، بەڵام زەمەنی من هەرگیز ئەو زەمەنە نەبوو کە تێیدا دەژیام.

من دەمویست هەموو ئەو شتانە بە دایکم بڵێم، یان لە نامەیەکدا بۆی بنووسم، ترسی ئەوەم هەبوو دوایی چۆن تەماشای کەمەوە، چۆن بیدوێنمەوە، دەبوو بۆ ئەبەد سەری خۆم هەڵگرم. دوای ئەوەی کە شووشەی دڵی ئەوانم دەشکاند، وتەیەک، قسە و ورتەیەک جامخانەکانی ناخیان ورد و پڕد دەکرد، ئەوان بەرامبەر من، دوو کائن بوون لە شووشە، دوو کائن بوون لەوپەڕی ناسکیدا، ئەو رۆحەی ئەوان کە دنیا کردبوونییە بەرد، بەردێک فڕێیدابوونە قووڵترین دەریای خۆی، بۆ من دەبوونە کریستاڵ و شووشە و مرواری.

ئەوان هەردووكيان، بابم و داكم، واتا ژەنيارى موراد بەگى سەنگ شێر و ئارتوشى ئارسەن سيراتووش كە لە دواى شووكردنى بە باوكم بە ئارتووش كوردە بانگيان دەكرد، هەردووكيان شتێك نەبوون بۆ تێگەيشتن، شتێك يان جەستەيەك نەبوون بۆ ژيان، من لە شازدە ساڵيمدا هەستم كرد ئەوان شەوێك وەك ئاگر دەسووتێن و بەيانييەكەى دوو پەيكەرى ئێسكى بە خۆڵەمێش بوويان لە دوا جێ دەمێنێ، تا ئێستا ناتوانم يەك رستە لەسەر ناخى باوكم بڵێم.

هاتم بۆ كوردستان تەنها بۆ ئەوەى لە دوورەوە سەدان ميل لە دوور باوكم شتێك لە ناخى شارەزابم. ئەو هەميشە لێو بەخەندەو رەزاسووك، قسە خۆش و زاناو بە ئەدەب، مۆسيقا زان و شارەزا، بەڵام تەنها من دەمزانى و كەسێكى ديكە نا كە ئەو باوكە نەرم و بێگەرد و گوڵەى من جگە لە بووكە شووشەيەك لەوماڵەدا شتێكى ديكە نييە٠

ئەو باوكەى من بەو هەموو گاڵتە و پێكەنينەيەوە جگە لە بووكەڵەيەك جگە لە رۆبۆتێك لەو ماڵەدا شتێكى ديكە نەبوو، مەبەستم ئەوەيە بڵێم لە رووكەشدا، چونكە ئەو ژيانى لە ناو ماڵدا، لەگەڵ خەڵك و ناسياودا تەنها رووگەش بوو.

ئەو كەسيەتى خۆى، هەست و نەستى خۆى لەو پەڕى دڕندەييدا شادبۆوە، ئەو پياوە لەگەڵ هەمووان، لەگەڵ هاوكار و هاوسێ و ڕێبوار خۆشنود، خۆش كەلام و خۆش مەشرەب بوو، تەنها لەگەڵ خۆى دڕندەو بێ بەزەيى و وەحشى بوو.

دۆزينەوەى گۆڕستانەكانى ناخى باوكم ئەستەم بوو، گۆڕستان بە دواى گۆڕستاندا، كە گەورە بووم ئەو فێڵ و تەڵەكە بازيانەى باوكم لەگەڵمدا تا رادەيەك بێ مانا مانەوە، بۆ چركەيەك خۆى لە بير چووبا، نا بۆ چركەيەك لەگەڵ خۆيدا با، هەموو فێڵە دڕندەكانى لە بير دەچۆوەو دەكەوتە مردنێكەوە، دەكەوتە خەياڵ و ئازارێكەو سامناك و رۆحكوژ، دەموچاوى هەڵمێكى لێ هەڵدەستا تەواو لە رەنگى ئەو بۆمبە نايترۆجينييە دەچوو بەر يابان كەوت و بەپێى ئەو فيلمەى لە وانەكانى ژينگە دەمانخوێند، ئەو دەموچاوە بێگەرد و ساكارەى دەبووە كێڵگەى مين و لە هەر كام لاوە سەيرت كردبا پێتدا دەتەقييەوە، ئەوانە لەحزەيەك بوون، ساتێك بوون تەواو، كە لێم دەپرسى:

– بابە تۆ کەسوکارت هەیە؟ ڕەنگی باپیرەم چۆنە؟

ئەو پێدەکەنی دەیگوت:

– ئێستا لەو مانگی نیسانەدا وڵاتی من سەوز سەوزە دەستێکی نهێنی کە دەستی خودایە هەموو دەشت و کەنار ڕێگاو دۆڵ و چیایەکان سەوز دەکات، بۆنێک کە بۆنی خودایە لە گوڵەکانی مانگی نیسانەوە دێن، کوڕە شیرینەکەم، کاکۆ ئەو دەستە نهێنییەی خودا گوڵ لە ناو ڕەگی بەردە سەختەکاندا دەچێنێ، لەو مانگەدا شاخ و گرد ئاو دەردەدەن و بۆنی فریشتەی ژیان هەموو شوێنێک وەک یەک ئاوەدان دەکاتەوە.

من دەمویست باسی ئەو ڕەگە قووڵەی خەمناکی خۆیم بۆ بکات، بزانم داخۆ ئەویش دەستی نهێنی خودا دەیوەشێنێ، ئەو بێدەنگییە ئەو هەموو نهێنییەی ڕووی داپۆشیوە.

ئەو دەیگوت:

– تۆ لە باپیرت دەپرسی، باپیرت پیاوێک بوو لە ئەوروپا بایە یەکەم کەس دەبوو پەتاتەی دەچاند، یەکەم کەس دەبوو قارچکی بەرهەم دەهێنا، باپیرت لێرە بایە ماسییەکانی ئاوە گەرمەکان و ساردەکانی لێک تر چاک دەکرد.

ژەنیاری باوکم پێدەکەنی و دەیگوت:

– باپیرت پیاوێکی بچووک بوو، لەو خاڵخاڵۆکانە دەچوو بە دوای خاڵتدا ناردن و نەیاندۆزییەوە، پیاوێک بوو وەک کرم سەرردارەکان دەکەوت، بەڵام بە هێواشی خاڵخاڵۆکەکە.

دواتر ژەنیار، دەستم دەگرێت و دەڵێت:

– باپیرت زۆر لە من وریاتر بوو، بەڵام کەمێک ترسنۆکتر، ئەویش لە ژنەکەی لە نەنکت دەترسا، نەنکت هەموو بەهارێک لەگەڵ گوڵە نێرگز دەگەشایەوە، کوڵمەکانی پڕ خوێن و چاوەکانی پڕ ڕەونەق دەبوون.

## هەزار

کاکۆ گوێی ڕادەگرت و هەستی دەکرد دیسانەوە باوکی دوور لە خۆی، دوور لەو لەحزانەی کاکۆ لەسەر دەموچاوی دیبووی دەدوا دەیگوت:

– بابە من ئەو بەهارە لە دەموچاوتدا نابینم، کوا ئەو کوڵمە پڕ خوێنانەی نەنکم، جارێک نەمدیت چڵە نێرگزێک لە یەخەت دەی، بۆ دەستی نهێنی خودا تۆی لە بیرچۆتەوە؟

بابی دەیگوت:

– ڕاستە من باسی زستانم بۆ نەکردووی، زستان تا دەهات سەدجار لە دەرگای دەدا، ڕێک سەد جاری تەواو، ئەوجار بە ریشێکی سپی سپی و کڵاوێکی سپیترەوە دەردەکەوت، هەر لەو کاتەدا خوا بە دەستێکی ئارامتر و شیرینتر لە ژوورەکان دەگەڕاو لە سۆپای ماڵەکانەوە گەرمییەکی پڕ تام و پڕ خۆشەویستی بە ژوورەکاندا بڵاو دەکردەوە، هەر هەموومان لە نێو ئەو گەرمییەدا بەرانبەر یەکتر دادەنیشتین و باپیرە ئەوەی دەگێڕایەوە کە چۆن ڕاوی کردووەو بە شەوانی بەفر لەوگەرمییە شیرینەی ماڵ خۆی بێبەشکردووە و لە شاخ ماوەتەوە، باسی ئەو ئاسکەی لە شەوێکی تۆفدا، کە بەفر تا سوێبانەکان

هەڵکشاوە، ئەو ئاسکە لە دەرگای داوە، بە قۆچە کورتەکانی دەنگێکی لە دەرگا هێناوە، کەیبانووی ماڵ، نەنکە رووەمەت پڕ خوێنەکەت، زوو دەزانێ ئەو رۆح لەبەرە بێ زمانە لە ترسی راوچییە دڵڕەقەکان پەنای بۆ ئەو هێناوە، لە باوەشی دەکات و دەیباتە ژووری، لاقە شکاوەکەی بۆ هەڵدەبەستێ و لەسەرەوەی ژوورەکە، لە ناو تاقێک دایدەنێت و ئەو ئاسکە لەو گەرمییە پڕ سیحرییەدا، لە ژێر فریشتەی رۆح سووکی ماڵەکەدا زستان بەسەر دەبات.

کاکۆ سەرەتا حەز لەو وێنانە دەکات بابی لە وشە بۆی دورست دەکات، حەز لەو گاڵتەیە دەکات بابی لە خەیاڵ، هەور بۆی دەچنێ، باپیرەی وەک دنکە خۆخێک دێتە بەرچاو، هەست دەکات نەنکی بە بچووکییەکی نائاساییەوە لە سەندریللا چووە، وا بیردەکاتەوە تا ئێستا لە ماڵە کۆنەکەیان لەو رۆژهەڵاتە دوورە، پێڵاوە کریستاڵییەکانی لە ژێر خۆڵ کەوتووە، هەمیشە دەیدی لەژێر ئەو دارتووەی لە ناوەڕاستی حەوشەی ماڵی باپیریدایە چیلکە لە شوێنی میزی خۆی وەردەدات و بەکونێکدا دەچێتە خوارێ کە شارێک خانووەکانی لەزێڕن، رووبارەکانی کۆلکەزێڕینە، شەقامەکانی شووشەن. بەڵام هەموو ئەوانە وەڵامی پرسیارەکەی ئەو نین، ئەوە بە دوای رەگی خەمووکییەکدا دەگەڕێ سەرتاپا هەیکەلی ئەو پیاوە نەرم و بەشووش و فێڵزانەی داگیرکردووە، کوا خەمی وا قووڵ لە دەستی پڕ نهێنی خودا دایە، ئەو حوزن و زەردبوونە لەگەڵ گەرمی ژوور و هاودەمی ئاسکدایە. ئەو پیاوە سەرتاپای دنیا خەمی پێبوو، بەشی سەرتاپا دنیا چەند جار بەخۆی و تۆپە خڕەکەی زەویەوە تێیدا غەرق بێت.

کاکۆ باوکی وەک سندوقێکی پڕ نهێنی و لە شکان نەهاتوو دەدیت، سندوقێک نیشانەیەک، خاڵێک، هێڵ و وێنەیەکی لەسەر نییە بۆ تێگەیشتن. ئەو تەنها کڵاوێکی هەبوو، ئەو تەنها کڵاوێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بۆنی نیشتیمان و بۆنی وڵات و ماڵ و خێزانی لەو کڵاوە دابوو. کڵاوێکی لە چەند باپیرەوە مابۆوە، کڵاوەکە چنگە خۆڵێکی سوور و دوو بەردی بچووکی تێدا بوو.

کاکۆ زۆر درەنگ زانی ئەو ماڵە شوێنێک نییە بۆ ژیان، بەڵکو شوێنێکە بۆ هەڵگرتنی

نهێنی و شوێنێکە بۆ هەڵگرتنی دوێنێ. ئەوان، باوک و دایکی، هەتا خزم و کەسیشی تەنها ئەوەندە لەو ژیانەدان کە ئەوەی پێ هەڵخەڵەتێنن و بەس ئەو هەر لە سەفەردا بوو، بێ ئەوەی هیچ خەڵکێکی دیاریکراوی هەبێت، جگە لە نهێنی ماڵەکەی، جگە لەو هەموو مەتەڵەی دەورەیان داوە.

لەوێش دێتەوە هەمان گوند و لە دەرگای هەمان ماڵ دەدات، تا دەرگا دەکرێتەوە سەیری سواغی سووری دیوارەکان دەکات، ئەم جارە سەید حوسێنی جیهانگیر بەخۆی و ئەو هەموو قۆپچەوە دەرگا دەکاتەوە، دەستی دەگرێت و دەیباتە پەنا ئەشکەوتێک، دەچنە ناوی و وەک ئەوەی دەستێک بێت ئەو پیاوە بناسێ دوای دەکەوێت، لە ناو ئەشکەوتەکە بەردێک لادەدات و لەو دیو بەردەکە، سندووقێکی بچووکی تەختە دەردێنێ و فیلمێکی تێدا دەردێنێ و دەڵێ:

– ئەو فیلمە ئەمانەتی مستەر جیمس پۆڵ براونە لای من. چەند ساڵە لێرەم شاردبۆوە، بیگەینە شوێنی خۆی.

کاکۆ هەر لەوێ لە ناو ئەشکەوتەکە کە نازانێ چۆن هاتۆتە وێ، جانتاکەی دەکاتەوە و دەیەوێت فیلمەکە لە گیرفانەکەی ناوەوەی دانێ، لە پەنا دەفتەرە بەرگ چەرمە رەشەکە.

سەید حوسێنی جیهانگیر وەک رووناکییەک، کوژەکەیەکی لێدیار بێت بێباک و سەرسەخت دەچێتە پێش و لە قووڵایی ئەشکەوتەکەدا دەنگی خوڕەی ئاو دێت و دەبینێ سەید حوسێن گۆچانێکی قاوەیی لووس، بەڵام وەک مار پێچا و پێچی بە دەستەوەیە، روو لە کاکۆ دەکات و دەڵێت:

– من دەمزانی تۆ دێیت، چاوەڕێ بووم، سەرەتا دەمویست هەندێ شتی زۆر گرنگت بۆ بگێڕمەوە، دواتر بڕیارم دا بۆ خۆت ببیینی، بەڵام تۆ کامێرات پێیە، دەبێ بیشاریتەوە، لەو شوێنە ناکرێ وێنە بگری.

کاکۆ وەک کەسێک بێت لە دەرەوەی خۆی، بە توانا و هێز و شارەزاییەکی تەواوە لە ناکاوەوە گوتی:

–لە درەنگ هاتنم مەڕەنجێ، من هەمیشە لە سەفەردابووم، هەموو سەفەرەکانم بە

نیازی لای تۆ کردوون، هەر لە منداڵیمەوە من لەو ئەشکەوتەدا ژیاوم، من هەڵدەهاتم و ئەو بەدوامەوە بوو، تۆ لە ژوورێکدا خۆت بەند کردووە تەنها سەرگەردانێک بە ڕێکەوت دەتدۆزێتەوە، ببوورە وا دەدوێم، من بۆ وێنەیەک چوومەتە بنی دنیا، بەچنگ بیرەوەرییەکانی بابم هەڵکۆڵی. من لە ماڵی باوکی خۆم، لە شارێک فەزایەکەی لە شووشە بوو ئاوارە و سەرگەردان بووم.

سەید حوسێن کە دەیویست ڕێنوێنی کاکۆ بکات و چۆن لە بەردێکەوە و بپەڕێتە سەر بەردێکی کە گوتی:

– بدوێ، چۆن ئارەزووتە، ڕاستە من لە ژوورێکدام، ڕاستە بەدیوارێکەوە هەڵواسراوم، دوور و عاسێ، بەڵام تا ئاخری دنیا بە هەمان زەوق و سەبرەوە چاوەڕێم دەکرد. من دەمزانی تۆ هەر دێی، بۆنێک لەو ماڵە، لە ڕەگی خانەخوێکانتدا هاتنی تۆی پێڕادەگەیاندم گەڕیدەی هەمیشە ئامادە.

کاکۆ لەو کاتەدا دادێتەوەو دەڕوانێتە ئەو تاشە بەردەی سەید حوسێن لەسەری وەستاوە، ئەو زەویناسی ئەوروپا، ڕەگی زەوی و بەرد و ئاو شارەزایە، زۆر بە وردی لە خاڵ و هێڵ و نیشانەی سەر بەردەکە ورد دەبێتەوە، نابێ ئەو بەردە لە گرانێت، یان کلس و گڵی بە بەرد بوو بێت، چینی بەرد وەک ئەو خوێندبووی لەو بەردەدا دەستنیشان ناکرێ و ناچێتەوە سەر خێزانی هیچ بەردێک.

دەپرسێ:

–جەنابی جیهانگیر ئەوە چ ئەشکەوتێکە منت بۆ هێناوە، ڕووناکی ئەو ئەشکەوتە لە کوێوە دێت، من دەمەوێ ناو و زانیاری لەسەر ئەو ئەشکەوتە بنووسم.

سەید حوسێن بێ ئەوەی لەسەر بەردەکە لاق بگوازێتەوە دەڵێ:

– ئەو بەردە سروشت دروستی نەکردووە، ئەو بەردە ئینسان دروستی کردووە، هەر لە ڕۆحە ئاوارەکانیش بنیادنراوە، لەو وڵاتەی بەردت لێ خوێندووە سەد ساڵی دیکە بتخوێندبا ئەو جۆرە بەردەت نەدەخوێند. ئێرە ئەشکەوتی هەزار دەریایە. ئەوەندەت زانیاری لەسەر ئەو ئەشکەوتە دەست دەکەوێت، هەموو لاپەڕەو دەفتەرەکانت پڕ کاتەوە،

تۆ دەبێ لەوە زیاتر بیت، نابێ تەنها بە نووسین وازبێنی. دەبێ ئاگاداری ڕێگاو لاڕێیەکانی بیت، وریا بە منت لێ ون نەبێت، من ناتوانم بە بێ تۆ ئیدی بگەڕێمەوە سەر زەوی، بەبێ تۆ ناتوانم بچمەوە ناو چوار چێوەکەم. ئەوەش بۆ من گرنگ نییە ئەوەندەی تۆ دەبێ بگەڕێیتەوە شار و ماڵی خۆت و ئەو چەند ساڵەی لە تەمەنت ماوە لەسەر دنیا بەسەر بەری.

کاکۆ لەو رستە پڕ نهێنیانەو لەو ناوە ئەفسانەییە سەرسام بوو، ون بوون لە ئەشکەوتێکدا لە چییەوە دێت، نەگەڕانەوەو ژیان لەنادیاردا چ مانایەکی هەیە، چۆن ئەو پیاوە هێندە راشکاوانە باسی تەمەنی ئەو و جۆری بەرد دەکات. کاکۆ کە زیاتر خەریکی روانین و لێوردبوونەوەیە لە هەموو شتێ کە دیبینێ، دەڵێت:

– جەنابی جیهانگیر، من نامەوێ لەو ئەشکەوتەدا ون ببم، دەبێ ڕێگای ئەو ئەشکەوتەش بۆ خەڵکانی دیکە بکرێتەوە. پێکەوە دەگەڕێینەوە. پێم بڵێ بۆ هەزار دەریا ؟ بۆ بەردی رۆحی مرۆڤەکان ؟

جیهانگیر کە گۆڕانێکی سەیر وردە وردە لە سروشتی ئەودا پێک دەهات، گۆڕانێک لە ژیانی سروشتی ئینسانەکان دەست نەدەکەوت، گوتی:

– هەزار تەنها بۆ ژمارەیەکە بێ کۆتایە، توانات هەیە دوای ژمارەیەکی بێ کۆتایی کەویت؟ دەرگای ئەو ئەشکەوتە بۆ کەس ناخرێتە سەرپشت، سەرەڕای ئەوەی سەدان دەرگای هەیە، وریابە پێ لە شوێن پێیەکانی من نێ.

کاکۆ بە پەلە گوتی:

– ئەوانە بەرد نین، ئەوانە لە بن پێم نەرمن و رۆ دەچن. جەنابی جیهانگیر من خەریکە ئەو بۆنە بمگرێ، خەریکە دەخنکێم، ئەوە چ بۆنێکە، بۆنی ژیانە یان مردن ؟ من ژیانم ناسیوە، من مردنم، خودی مردنم دیوە.

جیهانگیر وەک لەگەڵ ئەوی نەبێ گوتی:

– ئێوە ئەی دانیشتوانی ئەشکەوتی هەزار دەریا لە قورسی و خوێنی ئەو کوڕە گەنجە تووڕە مەبن، رۆحی لە رەگی دوو دەریاوە هاتووە، کە بوونە بەرد، بەڵام دڵی ئەو

بەردانە وەک دڵی ئێوە دەبێ هەر لێبدەن، لە قسە و گوفتاری مەرەنجێن. ببوورن بۆنی ئێوە ناناسێ، ئەی حەزرەتی ئارتووش، مریدان شوهانشی، یاوەرانی حەزرەتی خدر ئێمە تەنها تێدەپەڕین، وەک تیشکێک بە ئاودا بڕوات، وەک تاڵە موویەک هەوا کون کات.

ئەو دەنگە دەکەوتە نێو هەوا، کاکۆ دەیویست بە دوای دەنگەکەدا بڕوات، بەڵام جیهانگیر رووی لە کێیە؟ سەر بەرز دەکاتەوە دەیان پێی رووت بەبێ ئەوەی خاوەنەکەیان دیار بێت وەک بەراڕەوێکی نهێنی و تاقی بەرزی کۆشکێکی کۆندا بڕۆن، دەبینێ، جیهانگیر دەست بەو پێیانەدا دێنێ وەک دەست بەپێی تولفێک یان لاپەڕەیەکی پیرۆزدا بێنێ بە نەرمییەک تەنها لە سروشتی خودا دابێ وەک شێلان و لاوانەوە.

پێیەکان گۆشتێکی روون داپۆشیون، نینۆکی شووشەیی، لە کۆتایی ریزەکە، پیاوێکی گەنج، بە دەموچاوێک لە ئاو، ئاو و تەواو، روون روون، قژێکی درێژ و نەرم لەشانییەوە تا سەر پێیانی شۆڕبۆتەوە، لەسەر بەردێکی لووس، یان دارێکی بێ گرێ دانیشتووە، خەریکی دروستکردنی پێڵاوە، یان خەریکی پینەکردنیانە، کاکۆ دەڕوانێتە چەرمی پێڵاوەکان، دەڕوانێتە چەکوچ و بزمارەکانی. پەنجەو دەست و جلەکانی وەک ئەوە دەچێ لە قولایی دوکانێک لە قەیسەرییەکی کۆن کۆن دانیشتبێ. کابرای پینەچی دەڕوانێتە جیهانگیر، لێوی دەجوولا، کاکۆ هیچ نابیستێ، جیهانگیر دەڵێت:

– تۆزێک پەلەکە دەمێکە بۆ پێڵاوەکان وەستاون.

کاکۆ لە وەڵامی ئەو ناگات، جیهانگیر دەڵێت:

– ئەو مەخلووقە موبارەکانەش دەیانەوێ بڕۆن.

دیسانەوە کاکۆ لە وەڵامی کابرای پینەچی ناگات، جیهانگیر دەڵێت:

– پێڵاوی ناو هەور؟

کاکۆ دەیەوێ بچێتە ناو ریزەوە، حەزی لە پێڵاوی ناو هەورە، سەید حوسێنی جیهانگیر دەستی رادەکێشێ و دەڵێت:

– بۆ کوێ؟ بە نیاز نیت لەگەڵ من بێیتەوە؟

کاکۆ دەڵێ:

– با، ئەوەندە چاوەڕێم ناکەی؟

ئەو دەڵێت:

– تەمەنت بەشی چاوەڕێکردنی ئەو پێڵاوانە ناکات.

کاکۆ دوای سەید دەکەوێت دەڵێت:

– حەزم لەو پێڵاوی هەورانەیە، پێڵاوێکی وات هەبێت تەمەنت بۆ چییە؟

لە دەلاقەی دوور و درێژی ناوەندی دیوارێکەوە دەیان دەست دەبینیٚ، کۆت و پێوەندی قورسیان تێدایە، دەستەکان باریک و درێژن ، لەو سەرەوە پیاوێکی بە هەیکەل و ریشن کولمە سوور و نێوچەوان پان، چەکوچی ئاسنگەری بەدەستەوەیەو خەریکی سوورکردنەوەی ئاسنە، دەیەوێ کۆتەکان بشکێنیٚ، سەید حوسێن هەنگاوێک کاکۆ لە ریزی کۆت بەدەستان دوور دەخاتەوەو ئاسینگەرەکە قسەیەک دەکات و دەموچاوە سووربووەکەی گنجی باریک و درێژی تێدەکەویٚ و کاکۆ لە قسەکانی ناگات و سەید حوسێن بە رستەیەکی نادیارتر وەڵامی دەداتەوە:

– تا ئێستا ژمارەی دەست بە کۆتەکان زیاترن.

ئاسنگەرەکە قسەیەکی دیکەی کرد، کاکۆ لەویش حاڵی نەبوو، سەیدی جیهانگیر گوتی:

– راست دەکەی، خۆت بە ژماردنەوە سەرقاڵ مەکە، مادام ئەو کۆمەڵە گەورە گەورانەی پێوەندی شکاوت لەوێ فڕێداوە من تێدەگەم.

لە هەموو ئەو گەشتەیاندا باڵندەیەک کە خۆی نەدەبینراو رووناکییەکی نەرم و هێمنی لێدەڕژا بە دەوریاندا دەسووڕایەوە دەکرێ ناوی ئەو باڵندەیە باڵندەی نوور یا زێڕین یان هەر ناوێکی دیکە بێت، بەڵام کاکۆ دڵنیا بووە ئەوە خودی باڵندەی تۆسە.

کاکۆ ئیدی نەیدەزانی پیٚ لە چ دەنیٚ، نەیدەزانی ئەو کۆتەڵە بەرد ئاسایانە رۆدەچن لە ژێر پێی یا نا، ئەشکەوتی هەزار دەریا، بەسەدان رێڕەوی نهێنی و نادیاردا درێژ دەبۆوە. جیهانگیر وەک باڵندەیەک خۆی هەڵدا سەر بەردێکی گەورەی سپی لەوانەی پێمان دەگوت (بەردە خۆیٚ) دەستێک کاکۆ هەڵدەگرێت و لە باوەشی دەکات، لە باوەش

کردنێکی پڕ لەزەت و سووک، بایەک لە دەموچاوی دەدات وەک بیەوێ شتێک لە پێکەنین و خۆشنودی بگەیەنێتە رەگە قووڵەکانی خوێنی.

دەگاتە سەر بەردە خوێنییەکە، بارانێک لە شێوەی شووشە بێپچڕان بەسەریاندا دەبارێت، بارانێک کە دیار بوو لە دەستی نهێنی خوداوە دێتە خوارێ، هەست دەکەن بایەک لەناخیانەوە پێستیان پڕ دەکات لە خۆشنودی، پڕی دەکات لە ژیان و هەناسەیەک کە ئەوان بۆ سەرەوەی دنیا بە کێش دەکات، کاکۆ ئاوڕ لە سەید حوسێنی جیهانگیر دەداتەوە باڵەکانی دەکاتەوەو باوەشی پێدا دەکات و هاوار دەکات:

– جگە لە تۆ کەسێکی دیکە نەبوو، ئای چەند بە دواتدا گەڕام.

سەید حوسێن زۆر توند کاکۆ لە باوەش دەکات بە رادەیەک خەریکە قەفەزی سینگی بێتەوە یەک و پێی لەسەر زەوی نەماوە، ئەو پیاوە بە هەیبەتە هاوار دەکات دەڵێ:

– تۆ شایانی ئەوەیت بۆ ئەبەد چاوەڕوانت بم، ئەی خوێنی باغی خوێ.

کاکۆ بۆ لەحزەیەک ئاوڕی دایەوە هەستی کرد یان دیتی ستوونێک، سەدان ستوون دەبینێ، ستوونی خوێ لەگەڵ دیتنی ئەو وەک ژنەکەی نووح کە چاویان لە ژیانە بەسەریەکدا دەکەون و ورد دەبن، سەید حوسێن فریا دەکەوێت و دەڵێ:

– ئەو خوێنەی ژیان دەخەیتەوە ناو خوێ و کاسە سەری ناو گڵ.

باران لەسەر دەموچاوی یەکتر دەبینن، سەدای دەنگێک بەر هەوا دەکەوێت، تێدەپەڕن و دەڕۆن لە دوور ئەوان، لەو سەری دنیا کۆڕی ریش سووران دەبینن، کۆڕێک لە شێوەی هەرمێدا دانیشتوون، بەچاوی سپی و بێ جووڵەوە، نزایەک، دەنگێک، گۆرانییەکیان لەسەر بەرز دەبێتەوە، ئەوان، کۆڕی ریش سووران، دەڵێن:

– لەو سەری دنیا هاتن، جارێ ئێمە لە قۆزاخەدا بووین، جارێ ئێمە لە ناو لانکدا بن خۆمان تەڕدەکرد، جارێ ئێمە چاوەڕێی پشکوتنی خونچەبووین، سەدا، سەدا سەدا، سەدای دەنگ و مردنە.

سەید حوسێن دەستی دەگرێت و لە دوور دەوەستن، ئەوان دەڵێن:

– سەدا، سەدای ئەو دیو با، سەدایەک شاخ وەک خوێ دەتوێنێتەوە. سەدایەک

مردووەکانی تەسلیمی خاک ناکات، سەدایەک رۆحەکان نانێرێتەوە حزووری خودا.

ئەوان، کۆڕی ریش سووران، تەواو وەک هەرمێیەک دانیشتبوون، ئەوان هەموویان دەیانگوت

– بێدەنگ و بێدەنگ و بێهەست، بەسەر گوند و شارەکاندا کۆچمان کرد، فڕین، بە باڵ بەستراوی فڕین، زنجیرێک کە دەستی نهێنی خودا رایدەوەشاند بەر پشتمان دەکەوت، زنجیرێک کە ئایەتێکی جوان بوو، هەڵیگرتین، زنجیرێک شوێنی ئاڵقەکانی بە هەموو جەستەمانەوە بوو، ئێمەی عەبدی خودای بە خشندەو کوژراوی دەستی زنجیری ئاگرین.

ئەو پۆلە ئینسانەی لە سەر شێوەی هەرمێ دانیشتبوون ناڵەیەکیان لێدەهات و لە رۆحی کاکۆ دا دەبوو بە وشە.

پیاوێک کە تا ناو قەدی دیاربوو، ئاشکرا نەبوو لەو ناوەندی دیواری ئەشکەوتە لە سەر چی دانیشتووەو چۆن راگیربووە، بەڵام ئەو پیاوە مروارییەکی بە دەستەوەیە، هێندەی هێلکەیەک دەبێت و تیشکێکی زۆر و نەرم بێ ئازار بڵاودەکاتەوە، وەختێک سەید دەکەوێتە بەر تیشکەکە، رادەوەستێ و دەڵێ:

– سوڵتانی رەنگ و مرواری وەرمان بگرە.

سوڵتانی رەنگەکان دەیڕوانییە لای راستی و لە دوورەوە، قووڵاییەکی ئەبەدی بێ سەدا دیار بوو، کەسێک دەهات، سوڵتان وەستاو دەنگێک لەو پەڕی حوزندا، تا دنیا دنیایە حوزن لە قووڵاییەکەوە دەهاتەدەر، دەیگوت:

– داوای رۆحی سوڵتان بکەن نەک مەملەکەتەکەی.

ئەو دەنگە دیار بوو دەنگی ژنە، لەگەڵ دەنگەی کەسەکە سیمای ژنێک نزیکتر دەبۆوە، لە پشت سەری سوڵتانی رەنگەکانەوە وەستاو، سەید گوتی:

– سوڵتانی گەورە من بە نیازی شکۆی تۆ هاتم.

سوڵتانی گەورە دەمی کردەوە:

– ئەوەتا هەموو رەنگەکان، هەموو تافەکان بۆ ئێوەیە.

سەید حوسێنی جیهانگیر گوتی:

– شکۆداری مەزن، ڕەنگی سوورت داینێ خوێنمان لەبەر ڕۆیشت، ڕەنگی سپیت داینێ ملکەچ و زەبوون بووین، ڕەنگی ڕەشت بۆ ناردین، مردن بە دەنگمانەوە هات، زەرد سەرگەردانی کردین و سەوز ژەهر خواردوو.

سوڵتانی گەورە، مرواریەکەی ناودەستی توند کوشی، کاکۆ و جیهانگیر خەریک بوون دڵیان لێکدەبۆوە، ئەشکەوتی هەزار دەریا تاریک دادەهات، ئەوان هەناسەیان تەنگ دەبوو، وەختێک مرواریەکە لە ناو دەستیدا خەریک بوو بتوێتەوە، هێڵێکی دووکەڵی سپی لە نێو قامکەکانی بەرز بۆوەو هەردووکیان هەناسەیان گیراو لە بەرزییەکی نادیارەوە خەریک بوون دەکەوتنەخوار، جارێ نەکەوتبوونە هیچ جێیان، هەناسەیان تەواو ببوو لە تاریکیدا دیار نەمابوون. ئای حیکایەتەکانی باوکی دڵشکێن و ڕۆحپروێنن. وتەیەکی بابی بیرکەوتەوە کە هەمیشە پێی دەگوت:

– تۆ ئەو مرواریە تاقانەو گران بەهایەی منی کە نابێ بهێڵم کەسەری دنیا بە ئاستەم بتڕووشێنن.

## نوور

کاکۆ بە ئاگا هاتبوو، دەیزانی دەبێ هەناسە بدات و دەستەکانی بجووڵێنێ، بەڵام وەک ئەوەی بەرەو قووڵاییەکی نادیاری رایکێشن تەنگە نەفەسە، لە پشت دەرگاوە دەنگێک دێت، کەسێک وەڵام دەداتەوە، کاکۆ دەزانێ باسی ئەوە، باش دەزانێ ئەو کەسە دەکۆکێ، دەستەکانی تەزیون و خۆی لەو قووڵاییە رزگار دەکات و لێفەکەی لادەدات و ئەو کەسە دەرگاکەی کردۆتەوە هاوار هاواریەتی و پەنجەرەکە دەکاتەوەو بانگی کەسێک دەکات و چەند کەس دێنە بەردەرگا. کاکۆ سەری بەرز دەکاتەوە، هەناسەی هێشتا توندەو دەکۆکێ، دووکەڵ ژوورەکەی تەنیوە، ئەوانەی بەر دەرگا هۆشیان دێتەوە بەرو یەکێکیان لە دڵەوە شوکری خوا دەکات و کاکۆ لە دەرەوە دەبینێ زەردەیان دێتێ و خۆشحاڵ دەبنەوە. هەموو دێنە ژوورێ و هەوای ژوورەکە روون دەبێتەوە و کاکۆ وێنەی دایکی دێتە بەرچاو، بیری دەکەوێتەوەو لەو رۆژهەڵاتە شەو لە ماڵە کوردێک ماوەتەوە، هەڵدەستێ و دەستی دەگرن، دەچێتە دەرێ و هەوای پاکی ئەو بەرە بەیانە سییەکانی خاوێن دەکاتەوەو کابرای شوفێری دوێنێ ئێوارەی دێتە بەرچاو، رەنگ پەڕیو،

بەڵام روو بەخەندە لە بەرانبەری وەستاوە و دەڵێ:

- سەد شوکر سەلامەتی.

کاکۆ دەموچاوی دەشوات و دێتەوە ژووری و جێگاکەی هەڵگیراوەو ئاساوارێک لە دووکەڵ لە ژوورەکە نەماوەو هەموویان دادەنیشن و نانی بەیانی دەخۆن، ئەوان سادە قسە دەکەن، کابرای شوفێر دوێنێ شەو نەیتوانیوە بگەڕێتەوە، دڵی لای ئەو کوڕە گەنجە بووە کە لای سەیارەکەی جێهێشتووە، ئەو دەیگوت:

- ئای لە خەمی دابووم، چوزانم کاکم هاتووەو لە ماڵی جیهانگیر پاڵی داوەتەوەو کەڵەبابی کوردییان بۆ سەر بڕیوە.

جیهانگیری خاوەن ماڵ کە کەس نازانێ کوڕی چەندەمی سەید جیهانگیری گەورەیە، دەڵێ:

- میوانە ئەوروپاییەکەم تا نیوەشەو هەر خەریکی ئەو دەفتەر و کاغەزانە بوو قسەیەکی بۆ نەکردین.

ناز جەواهێرخانی خێزانی جیهانگیری خاوەن ماڵ تاکە کەس بوو هەستی دەکرد ئەو میوانە شەرمن و ناسک و جوانە زۆر تاساوە، ئەو لە چاوەکانی، لە روخسار و روومەتی، لە قژو جووڵەی دەیبینی ئەو کوڕە گەنجە تا رادەی مردن تاساوە، دەبینێ ئەو کوڕەی دوێنێ، ئەو جووڵە و رەنگەی دوێنێ تەواو لە جەستەی هاتۆتە دەرێ، بێ رووح و خامۆش خۆی لێ ون بووە.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ دەڕوانێتە چاوە سەیر و پڕ پرسیارەکانی ناز جەواهێرخان و دەکۆشێ وێنەی ئەوی بێتەوە بەرچاو وەختێک ناوی باوکی مێردەکەی دێنا، هەوڵیدا لە ون بوونێک بەئاگا بێت، دەیزانی مەودایەک لە زەمەن شوێنێک لە دنیادا ون بووە، دەیویست پەیوەندییەک لەگەڵ قسە و باسی ئەو خەڵکە دروست کاتەوە لە دەوری قنج قنج دانیشتوون نان دەخۆن، دەستی کرد بە نانخواردن و رووی لە کابرای سوورفلی درێژ و باریک کرد، کە تەمەنیشی هەڵکشابوو، گوتی:

-دەبوو چاوەڕێی تۆ بکەم؟

ئەوان روانیانە یەکتر و پێکەنین، ناز جەواهێرخان بە نیگای دایکێکی حەیران لە نێوان پێکەنینی ئەواندا، روانییە کاکۆ و گوتی:

–تۆ نەدەبوو بەبێ دایکت لە ماڵ بێیتە دەر.

ئەو قسە بێ پێشەکییە هەر هەموویانی سەرسام کرد تەنها کاکۆ نەبێ، کاکۆ لەبەر خۆیەوە گوتی «ئارتووش ئارسەن سیراتووش» ئارتووش کوردە، ئەو ناوە پڕ نهێنی و ترس و مردنە، ئەو ناوەی هەموو پیتەکانی رەنگی مردنی هەڵگرتبوو.

ناوی دایکی خستییەوە بیری دەفتەرە بەرگ چەرمەکە، بیری خەجاڵەتی و بێ متمانەیی، بیری ئەو ژنەی کوڕەکەی ناوی یەعقوب بوو، ئەو ژنە چی دایکی بوو؟ ئەو ماڵانەی سووتان کێ بوون؟ یەعقوبی چل رۆژە چی لێهات؟ ئیدی کاکۆ نەیدەزانی ئەوانەی دەوروپشتی بۆ ئەوەندە قسە دەکەن و پەیوەندیان بەوەوە چییە، بێ حاڵ و سەر گەرم پاڵی بە دیوارەکە داو سەرینە پەڕە گەورە و نەرمەکان کەمێک ئارامییان پێبەخشی و توانی ئەوەندە بڵێ:

–ئەگەر ئیجازە بدەن چاوەکانم دەنووقێنم و کەمێک پشوو دەدەم.

ئەوان لەو کوڕە غەریب و ناسک و هیچ نەزانە سەراسیمە ببوون، بۆ کوێ دەچێ؟ بۆ هێندە ماندوو بێحاڵە؟ بۆ هەڵناستێ و دوای کارەکانی کەوێ؟ ئەو شەو لە کوێ بووە؟ بۆ هێندە خەوی دێت؟ کاکۆ چاوەکانی لێک نابوو، دەموچاوێکی سپی و تا رادەیەک ترسهێن. ئەوان بێدەنگ ببوون، ناز جەواهێر گوتی:

– باشترە لێی گەڕێن پشوو بدات با بێتەوە سەر خۆی دیارە ئەو شەو دووکەڵ لێیداوە.

ناز جەواهێرخان لە چل رەتی دابوو، ژنێکی پتەو و توند و تۆڵ بوو، چاوەکانی نیشانەی جوانییەکی بێئەندازیان پێوە دیار بوو، روانینی لەسەر هەموو شتێ دەوەستا، قسەکانی وەک بڕیار دەچەقین، ئەو بێ ئەوەی چاو لەسەر کاکۆ هەڵگرێ، گوتی:

– ئەو کوڕە لە دوێنێ شەوەوە زۆر گۆڕاوە؟

کاکۆ لەودیو پێڵووەکانییەوە، هاوخەمی ئەو ژنە نەناسەی دەدیت، دەیویست بزانێ

چۆن گۆڕاوە، لە ناخەوە گوتی:

– بۆ دوێنێ شەو لە کوێ بووم؟

کەس نەیدەزانی دەڵێ چی، لێوەکانی بە ئاستەم جووڵان، گوتیان داوای ئاو دەکات، لێوەکانیان بۆ تەڕ کرد و ناز جەواهێرخان بۆ یەکەم جار دەستە تەڕەکانی خۆی بە ناو چاوانی داهێناو قژی سەرچاوەکانی لاداو خێرا دەستی لابردەوەو گوتی:

–نێو چەوانی هەر دەڵێی ئاگر.

ئاگر کەوتە سەر لێوی هەموویان، خاوەن ماڵ دوا نەوەی جیهانگیر گوتی:

– باشترە لێی گەڕێین، با ئەمڕۆش پشوو بدات.

شوفێرەکە سەرسام و دڵگوشراو گوتی:

–دوێنێ کەسێکی دیکە بوو، دێمەوە سبەی دێمەوە بۆ لاتان.

کاکۆ نەیدەزانی بۆچی دێتەوە بۆ لایان، هەموو دەچنە دەرێ، ئەو ، کاکۆ، دوور لە دنیا، دوور لە قەشە جۆلیۆس ئەندریاس، دوور لە کارۆلین، دوور لە هاوڕێ چاوکونە شوژنە لووت بچووکە بە ئەسڵ کۆرییەکەی منداڵی، کاکۆ دوور لە هەمووان، چاوەکانی لێک نابوو، لە ئارامییەکدا، ئارامییەکی ناو ڕەشەبا، چاوەکانی داخستبوو، هەستی کرد بیری هیچ شتێک ناکات هەر هیچ، تەنها گریانێکی قووڵ لە ناخییەوە سەردەکەوێ، وەک دوورگەکانی ناوەندی ئۆقیانووس، زۆر بە ئاسانی غەرق دەبێت، دەگریا بە کوڵ دەگریا لە گەرداوێک گریاندا رزگارکەرێکی دەوێت، رزگارکەرێک جگە لە دەنگی مۆسیقای ئۆڕانۆس، هیچ کەس و شتێکی کە نییە. دەیەوێ لە ناخی ئەو گریانەدا، لە ناخی ئەو گەرداوەی لە نادیارترین شوێنی ناخی بەڕێ کەوتووە دەنگێکی هێمنی مۆسیقاو نۆتەی ئۆڕانۆس بێت و بیبیستێت.

ئەو دەیەوێت لەگەڵ یەکەم هێرشی ئەو گەرداوەدا، لە ناو تۆزی ئاو و کەفوکۆڵی لافاودا، باڵندەی تۆس بێتە دەرو لە رۆحی ئەوپەڕی نەرم و شل و گەیشتووی ئەو بخواتەوە، تەواو ئێستا وەختی خواردنەوەی رۆحی هاتووە. هاوار دەکات بەبێ ئەوەی لێوەکانی بۆ لێک ببنەوە، بەبێ ئەوەی دەنگی بێت، هاوار دەکات:

– ئەی باڵندەی نوور، ئەی پەڕەوڵی قەڵا سەختەکانی ڕۆح، کە دەتەوێ جارێکی دیکە بە ناو هەتاو و نووردا بفڕی، جارێکی دیکە لەسەر پەنجەرەی دوو منداڵی نووستوو بێگا لە دنیا بنیشتەوە، لەگەڵ ئەو لافاوە، پێش گەیشتنی ئەو، دڵۆپێک لە ڕۆحی تواوەم، لە گیانی تلیساوەم بۆ ئەبەد بژی. من دەمەوێت قەشە جۆلیۆس ئەندریاس لەو دووریەوە، لەو زەمەنە دوورەوە بزانێ ڕۆحی ئۆڕانۆس تا ئێستا ئاوی باڵندەکانی دەدا. هاوار ئەی باڵندەی فریادڕەس یەکێک لە شەهیدەکانت لێرە کەوتووە.

چاو هەڵدێنێ، دەبینێ ناز جەواهێرخان لە پشت سەری دانیشتووە وەک شاژنی خێڵە سەرەتاییەکانی ئەفریقیا بێدەنگ و جووڵە. لە دڵەوە بزەیەکی بۆ دەکات و ناگاتە سەر لێوی، لە ناخەوە سوپاسی دەکات و دەنگی نایە. ئارام چاو لێک دەنێتەوە، هەست بە دڵنیایی ژن دەکات لە تەنیشتی، لە دوای باوەشی خودا، لە دوای میهرەبانی خودا ژن و تەنها ژن ئارام بەخشە. هەست دەکات ژوورەکە پڕ پڕە، لێوان لێوە لە بەزەیی و سۆز و خۆشەویستی، چاو لێک دەنێت و ساماڵێک بەری چاوی ڕەوشەن دەکاتەوە، گوێی لە دەنگی دوا نەوەی باغەوانەکەیە، دوا نەوەی نەتەوەیەکی باغەوان، بچووکترین باغەوان کە تەمەنی تەنها و تەنها نەوەت ساڵ بوو، دەڵێ:

– تا دەتوانی بگەڕێ، تا دەتوانی لەگەڵم وەرە من بێ ئەژمار پەیکەرت نیشان دەدەم، هەموو ئەو پەیکەرانە، دروستکراوی عاشقە بەسەرچووەکانن، ئەوان چوون و پەیکەرەکان بەجێمان، عاشقەکان تەمەن کورتترین نەوەی مرۆڤن، لە گەڵایەکان زووتر دەوەرن.

کاکۆ هەر بە چاو نووقانەوە، بێ ئەوەی دەنگی بگاتە دەرێ، دەڵێ:

– تۆ تەنها نووسینەکانی سەریانم بۆ بدۆزەوە، پێم بڵێ لەسەر ئەو پەیکەرەی لەبەردێکی ڕەش دروست کراوەو هەرچەند دەکەی نایدۆزێتەوە، چی نووسراوە؟

باغەوانەکە دەڵێ:

–ئەو پەیکەرە درێژ و باریکە، خراوەتە شاخی کەڵە ئاسکێکەوە، شاخی حەوتەمی، لەسەر شاخەکە نووسراوە.

«بێ چەکوچ و بزمار، تەنها و تەنها بە لێدانی دڵم ئەو پەیکەرەم هەڵکەندووە، ترپەکانی

عەشق و ترپەکانی شیعر، ترپەکانی تاریکی تا ئەبەد ئینسان نایانبیستێ»
دواتر دەڵێ:

– پەلە مەکە من ئەو پەیکەرەت بۆ دەدۆزمەوە، بۆ ئەوەی بیناسی دەبێ دەستی لێبدەی، دەبێ پەنجەکان بە لووسی و گرنە وردەکانی دابێنی، شیعرێکی سێزدە دێری لە پشتی پەیکەرەکە نووسراوە، لە قوولەی پێیەوە تا پشتە سەری، هەر دێرەی یەک تاقە وشەیە، سێزدە دێر و سێزدە وشە، چیرۆکی ئەو پەیکەرە بۆ خۆی داستانێکە، بۆ خۆی دنیایەکی سەربەخۆیە، کوڕێکی عاشق هات، لەبن دارێک دانیشت، چەند رۆژ دانیشت و چاوەڕێی مۆسیقابوو، لە رۆژی سێزدەهەمدا، لە درز کەوتنە ناو تاریکی، گوێی لە مۆسیقا دەبێت، گەڵا هەرە مردووەکان، بەرەنگی زەعفەرانیانەوە راست دەبنەوە، ئەو کوڕە کە لە گەڵا رەنگ زەعفەرانەکان رەنگ زەرد تر بوو، مووە زەردە زێڕەکانی ریشی دەجووڵێن، ئەو چاوە گەورە و بە تاڵەکانی دەکاتەوە، ئۆرانۆس، یان پاشین کینگ، لە سەر بالکۆنەکە، مۆسیقا دەنێرێ، ژیان و لەزەت، لەزەت لە مردنیشدا دەنێرێ، سەرەتا ئەو کوڕە عاشقە، کە پێشیان دەگوت رەنجسیا، پاڵ بە دارەکەی پشت سەرییەوە دەدات، چاوی دەکەوێتە سەر لەرزینی گەڵاکان، ئەو گەڵایانەی دەیانەوێ لە مۆسیقادا بە مردن شاد بن، ئەو کوڕە کە ناوی رەنجسیایە، ئەو عاشقانەی دەهاتنە دەرەوەی ماڵەکەی ئۆرانۆس، یان عاشقانی مۆسیقا هەرگیز کەسیان نەبوونە هاوڕێی کەس، ئەو کوڕە، رەنجسیا بووە هاوڕێی پەپوولەیەک، سپی سپی، دوای چەندان رۆژی هاوڕێیەتی، رەنجسیا، بە دڕکی گوڵەباخێک، بە خوێنی دەستی، لە سەر باڵی ئەو پەپوولە دەنووسێ «دڵسوور»، ئەو کچەی ئەو خۆشی ویستووە ناوی بەلەک سوورخی بووە، رۆژی چەند خاڵێک لە سەر باڵی پەپوولەکە بە خوێنی خۆی دەنووسێ، هەر ئەو رۆژەی تەواوی دەکات «دڵسوور» دەبێتە ناوی بەلەک سوورخی، تەنها ئەو کوڕە عاشقە ناوی دەنێت دڵسوور. دوای ئەو رۆژە کەس ئەو پەپوولەی نەدیوەتەوە، هەر ئەو رۆژە رەنجسیا دەست دەکات بە دروستکردنی ئەو پەیکەرە، کە ئێستا پێی دەڵێن، «پەیکەری رەنج سوورخی». ئەو کوڕە سێ سەد و سێزدە رۆژ کاری لێ دەکات، پێیەکانی، بەلەک و ئەژنۆی، ران و کەمەری،

دروست دەکات، ئەو بەردە رەشە کە هەر لە سەرەتاوە سی و سێ سانتیمەتر درێژ بوو، تەنها بە دەستی رووت لووس و سازی دەکات.

ئەو رۆژەی کە ئەو کچە بێ رۆح و باریک و کەم خوێنە گەیشت، هەمووان بە پەپوولەکە را زانییان کێیە و بە دوای کێدا دەگەڕێ، بەڵام رەنج سیا تەنها سێ رۆژ بوو مردبوو، بێگومان بەس ئێمەی باغەوان، دەمانگوت مردووە، دەنا کەس لەو عاشقانە وشەی مردنیان بە لێودا نەدەهات، ئێمەش دڵنیا نین، یان دڵنیا نەبووین مردووە، راستە مردن لەو رۆژانەی دوایی هەمیشە لە تەنیشتی بوو، لە ناو دەستی بوو، لە ناو چاوە هەرە هەرە غەمگینەکانی دانیشتبوو، لەو کوڕە عاشقە غەمگینتر مردن بوو. باپیرم ئەوەی ئەوکاتە لەسەر داری باغەوانی بوو مردن دەبینێ لە تەنیشت ئەو کوڕە سیگار دەکێشێ.

لەو رۆژەوەی پەپوولەکە رۆیشتبوو ئەو بۆ تەنها جارێکیش سەری بەرز نەکردبۆوە سەیری رێگا یان دوور بکات، ئەو تەنها جارێک هەناسەیەکی چاوەڕوانی هەڵنەکێشابوو تەنها ئەو رۆژەی کە مرد، لەگەڵ سپێدە سەیری دوور دەکات و دوایی تەماشایەکی ئاسمان دەکات و دەڵێ:

– چاوەڕێی دڵۆپە بارانێک بووم.

دواتر دەڵێ:

– بەلافاو باران باری، بەڵام من چاوەڕێی تاکە دڵۆپێک بووم.

دوای ئەو رۆژە کەس ئەو کوڕەی نەدیوەتەوە، کەس نەیدیوە بڕوات و ماڵئاوایی بکات، لە شوێنەکەی خۆشی نەمابوو، وەختێک کچەی سوورخی هات، هەموو ناسیمان، هەموو خۆمان بێئاگا کرد، کەس راستەوخۆ سەیری نەکرد و کەس دەنگی لێوە نەهات، بە خۆی و پەپوولەکەیەوە دەگەڕا، تا گەیشتە بن ئەو دارەی شوێن پشت و پاڵ پێوەدانی رەنجسیای پێوە بوو، بۆنی ئەوی لێدەهات، داهاتەوەو پەیکەرە نیوە تەواوەکەی هەڵگرتەوە، ئێمە هەر ئەودەم زانیمان ئەوە پێی و لاق و کەمەر و رانی ئەوە دروست کراوە، پەیکەرەکەی هەڵگرتەوە، بەو پەنجە باریک و بێ گیان و قامیشیانەی نووسی «درەنگە زۆر درەنگ بۆ مانگ هەڵاتن».

ئەویش سێزدە دانە شەو لەوێ دانیشت، سەری بە ئەژنۆکانی کرد و پرچی بە خۆی دادا، تا ئەو بەیانییەی، دەنگی مۆسیقای ئۆرانۆس، لەگەڵ سپێدە گەڵاکانی لەراندەوە، ئەو چاوێکی هەڵێناو روانییە ئەو گەڵایانەی دەلەرنەوەو دەیانویست لەگەڵ مۆسیقا بەربنەوەو بمرن، بەو پەنجە باریکانەی دەستی کرد بە تەواوکردنی پەیکەرەکە، شوێن دەست و زبرایی هێڵەکانی دەستی بە پشت و سینگ و سەری پەیکەرەکەوە دیارە، لەکەمەرییەوە بەرەو سەر، شێوەی پیاوێک دەدات، تەنها ریش و چاوەکانی ئەو پەیکەرە لە رەنجسیا دەچێ، ئەو پەیکەرە ئێستا بە پەیکەری «رەنج سوورخی» ناسراوە، نیوەی ژنە و نیوەی پیاوە، بەڵێ نیوەی خوارێی بەلەک یان لاق سوورخی بوو، هەموو دەمانزانی ئەو ئافرەتە باریکەیە، بەڵام نیوەکەی دیکەی تەنها ئەو ژنە دەزانێ رەنجسیایە، چونکە رەنجسیای ئەو پاڵەوانێک بوو، ڕەنجسیای ئێمە دەروێشێکی مۆسیقا بوو، کە تەنها مۆسیقا بە ژیانییەوە بەستبۆوە نەک جەستە بێهێز و داماوەکەی.

## سیحر بانوو

– ناز جەواهێرخان هەر لەپشت سەری کاکۆ دانیشتبوو، ئەسڵەن نەیدەزانی دارستانی عاشقان لە کوێیە وماڵەکەی ئۆرانۆس چییە. ئەو لە کوێ ناوی باڵندەی تۆسی دەزانی، پەیکەرەکان چ مانایەکیان لای ئەو نەبوو، شاخی کەڵە کێوی و گەڵا رازاوەکانی حیکمەتی باغەوانەکان شارەزا نەبوو. دەبێ ئەوە بزانین کە ناز جەواهێرخان ئەسڵەن گوێی لە دەنگی کاکۆ نەبوو، ئەسڵەن کاکۆ لە قووڵاییەکی کپ و بێدەنگ و بێ رووناکیدا دەدوا. ئەو بێدەنگ لە رەنگ و روخساری میوانەکەیانی دەڕوانی، ئەو نەیدەزانی لە دوێنێ شەوەوە تا ئەم بەیانییە چی روویداوە، ئەو ژوورە چ رووداوێکی بۆ کوڕە پێبووە، نازجەواهێرخان بۆنێکی کامڵ و ژنانەی لە ژوورەکە بڵاوکردبۆوە، ئەو دەیگوت:

– منداڵی بێ دایک تا ئەبەد مەزڵوومە.

دەیویست پێیەکانی بۆ بشێلێ و پەنجەکانی بۆ چەور کات، هەستاو چوو شیری کوڵاند و گوڵە هێرۆی تێکرد، دەستی بە قژی کاکۆ داهێنا، کاکۆ جووڵا، بەڵام چاوەکانی نەکردەوە، دەستی خستە پشت سەری و هەڵیستاند.

کچێکی باڵا بەرز، چاو رەش، بژۆڵە درێژ و رەشەکانی زوو زوو دەترووکان، قژی

ڕەش و قورس و قەترانی بەسەر شانیدا شۆڕببۆوە، خەریک بوو دەگەیشتە ئەژنۆی، دایکی دیتی و بانگی کرد،:

– سیحر بانوو، وەرە ئەو شیرەم دەیە.

سیحر بانووکە وەک جووڵانی مار دەڕۆیشت، دوو هەنگاو هاتە پێش و شیرەکەی، لە لێوی کاکۆ نزیک کردەوە، کاکۆ بێ ئەوەی چاو بکاتەوە، شیرەکەی خواردەوەو بۆنێک لە رووی نیشتبوو، بۆنێک لە ناخەوە هەژاندبووی، وەختێک سیحر بانوو چووە دەرێ و دەرگاکەی داخستەوە، کاکۆ بە ئاگا هات و، رووی لە ناز جەواهێرخان کرد و گوتی:

– ئەم جارە، من نەبووم، بایەک لە بەهەشتەوە کە بۆنی مسکی لێدەهات هەڵیگرتم و فڕێ دامەوە ئەو ژوورە.

ناز جەواهێرخان بە چاوکردنەوەو قسەکردنی کاکۆ دڵخۆش بوو، بەڵام لە مەبەستەکەی حاڵی نەبوو گوتی:

– بە هەشت بۆ؟ چ با و مسکێک؟ ئەوە تەنها گوڵە هێرۆم لە شیرەکە کردبوو.

دەنگێکی پڕ بەختەوەری و دڵنیایی کاکۆی گەمارۆدا بوو، گوتی:

– من لە ستوونێکی ڕەشەوە بەر دەبوومەوە، بایەک هات، هەناسەیەک هات و منی هەڵگرتوو بۆ ئێرەی هێنام. ئەوە تەنها تۆ لەو ژوورەدا بووی؟

ئەو گوتی:

–نا، وێنەکەی سەید حوسێنی جیهانگیریشمان لەگەڵە.

لەگەڵ ناوی سەید حوسێن کاکۆ ڕاچەنی، چی لێهات، کوانێ، منی بۆ سەفەرێکی دوور دوورو پڕکارەسات برد. ئەوان لە کوێن، کوا ریزی دەست بە کۆت و بەند؟ کوا ئاسنگەری ئەفسووناوی؟ ئەو ڕیزە پێیە دوور و درێژە، سوڵتانی ڕەنگەکان، سوڵتانی هێز و دەسەڵات، لە کوێ لە عەرشی کوێ دانیشتبوو؟ ئەوان ((کاکۆ و سەید حوسێنی جیهانگیر)) لە کوشینی مرواریییەکدا ڕەنگیان پەڕی بوو، دەنگیان کەوتبوو، لە کوشینی مرواریییەکدا کە دووکەڵێکی سپی لێ بەرز دەبۆوە. کاکۆ گوتبووی:

– من کامێرام بۆ چییە تەنها وێنەی ستیانەکەی مارین مۆرۆ بگرێت و ئەو مرواریییە

نەگرێت.

زوو لەو قسەیە پەشیمان بۆوە، چونکە زانی ئەو مرواریيە رەنگێک نییە بۆ وێنەگرتن، بێ ئەوەی چاوهەڵبڕێ، یان هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشی گوتی:

– خاتوون ئەو وێنەیە لە کەیەوە لێرەیە؟

ناز جەواهێرخان، بۆلای وێنەکەی روانی و گوتی:

– سەید حوسێنی جیهانگیر دەڵێی لەوەتەی من هەم ئەو وێنەیەی جیهانگیری گەورەش هەیە، زۆر زۆر پێش منیش، لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەک کارمان تەنها پاراستنی ئەو وێنەیەیە، لە هەڵاتن و کۆچکردندا ئەومان لە پێش خۆمان رزگار کردووە، تا ئێستا بە دەستی خۆم یازدە جار گوازتوومەتەوە، تاقە براکەی جیهانگیری مێردیشم کە بەناوی ئەو کراوەتەوە هەر لەسەر ئەو وێنەیە تیاچوو.

کاکۆ وەک لەودیوی چیایەکەوە بێ، یان لەودیو رێزەداری چڕ و بەتەم تەنراوەوە بێت، پرسی:

– سوڵتان جیهانگیر بووە قوربانی ئەو وێنەیە، رامان دەکرد و هەڵ دەهاتین ، دەنگی تەقەو پەلامارمان زۆر لێ نزیک ببۆوە، لە دواساتدا گوللەیەکی سوور و گەرم بەر سینگی ئەو ئەسپە کەوتبوو کە وێنەی جیهانگیری گەورەمانی لەسەر بارکرابوو، ئەسپەکە دەکەوێ بێ ئەوەی کەسمان ئاگاداربین، کاروانەکەشمان لە ترسان و لە دەنگی تەقە خێرا لە گوند چووە دەرێ، لەودیو گردەکانی تەیمان پیرەوە، جیهانگیری مێردم هاواری کرد و گوتی:

– کوا وێنەی جیهان نیا؟

ئەو وای بانگ دەکات ئێمە هەر هەموو حەپەساین، چۆن ئەو ئەسپەی وێنەکەی هەڵگرتووە پێ کراوە، چۆن نەمانزانیوە؟

ئەوجار هاواری کرد:

– کە دوژمن وێنەکە بەرێ ئیدی ئێمە بۆ بمێنین؟

خەنجەری هەڵکێشاو رووی لە خۆی کرد و گوتی:

– باخوێنی منیش بڕژێ، خوێنی من هیچ لە خوێنی ئەو وێنەیە گرنگتر نییە.

گریاین و پەلاماری دەستیمان دا، هاوارمان کرد و خۆمان خستە سەر پێڵاوەکانی کاروانەکەمان سڕ و پڕ هاوار و مردن بوو. پیاوەکانی، کوڕە لاو و هەرزەکارەکان، ریش سپی و پیاو ماقوڵان خەنجەریان لێستاندو پێیان گوت:

– خوێنی ئێمە لە هی تۆ خۆشەویستتر نییە، با بزانین کارمان چییە، دەست هەڵنەگری هەمووومان خۆمان دەکوژین.

کاکۆ گوێی لێبوو، بێ ئەوەی چاوی بکاتەوە، هێڵەکانی دەموچاوی، هەناسە و رەنگ و رووی دیار بوو، لە ناو کاروانەکەدا بە دوای کەسێکدا دەگەڕا، کەسێک مەتەڵێک بۆ ئەو هەڵبێنێ، ئەو وێنەیە دەگاتە کوێ، چاوێکی هەڵبڕی، چاوێک تەنها بۆ ناز جەواهێرخان بێت:

– تۆ چیت دەکرد، تۆش دەگریای، یان دەتویست بڕۆن و رزگار بن؟

– من لە بریسکەی ئەو هەموو خەنجەرە زراوم چوو، من لە رژانی خوێنی کەس و کارم، مێردو باوک و برا دەترسام، من دەترسام بە هۆی ئەو وێنەیەوە هەر هەمووومان لە ناوچبین.

چوومە پێش جیهانگیری مێردم و وەک پەیکەر لەبەردەمی چەقیم و گوتم:

– من بکوژە، من تاوانبارم، ئەو کەسەی دەبێ خوێنی بڕژێ بۆ ئەو وێنەیە، کەسێک نییە جگە لە من.

ئەو لەو پەڕی بەدبەختی و شکستیدا، شکستێک لە خەنجەرەکەی و دەنگی وەک یەک دەڕژان، بە دەنگێکی گڕ و توند و پچڕ پچڕ گوتی:

– خوێنی تۆ چ دادێکم دەدات کە وێنەکە بکەوێتە دەست دوژمن، رژانی خوێنی تۆ چ دادێک دەدات کە خوێنی من بەبێ شەرمی بێت و بچێت.

من گوتم:

– ئەی بۆ خوێنی خۆت:

– ئەو گوتی:

– چونکە ئەو وەک مردوویەک لەو دنیا دوورە چاوەڕێمە.

لەگەڵ ئەو قسەیە هەموو نەوەکانی جیهانگیر، هەموو کاروانەکە، سپی بوون و خوێنی هەموو لەشیان داچۆڕاو تا ئەژنۆیان خوێن دابەزی، هەموو وەک پەیکەری سپی دەیانڕوانییە یەکتری، بەیەک دەنگ گوتیان:

– بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو ئەسپە شەهیدە.

وەک با روویان وەرگێڕاو گەڕانەوە، سوڵتان جیهانگیر، ئەو پیاوە نازدار و بە جەرگ و شیواشە، لە پێش هەموویانەوە، چووە سەر بەردێک و هاواری کرد:

– ڕێگەم بدەن بۆ جارێک تەنها جارێک بە تەنێ کارێک بە دڵی خۆم بکەم. ئەوە کاری منە، من دەتوانم وێنەکە بهێنمەوە و کەس نەزانێ، کەس بریندار نەبێت و نەکوژرێ.

جیهانگیری مێردم وەستاو سەیری هەمووانی کرد، دیار بوو ئەو پێشنیارە هێزی لێ بڕیوە، شالیاری پیر خدرکە ریشە سپی و نەرمەکەی تا سەر زینی ئەسپەکەی هاتبووە خوار. ئەو پیاوە نوورانییەیساڵی جارێک دەهاتە قسە، چووە بەردەمی جیهانگیر گوتی:

– با هەمووان بە هیلاک نەچن، سوڵتان بە ناو ئاگردا تێدەپەڕێ، ڕێگەی لێ مەگرە.

هەمووان شالیار و جیهانگیریان گەمارۆ دابوو، سوڵتان لەسەر زینی ئەسپەکەی خۆی کووڕ کردبۆوەو وەک با دەفڕی.

کاکۆ لە دنیایەکی دیکەوە گوێی گرتبوو، دوور دوور گوێی گرتبوو، دەیڕوانی ئەسپێک ببینێ، بێ ئەوەی لە شوێنی خۆی بجووڵێ، بێ ئەوەی چاو بکاتەوە، ئەسپێک تەنها تۆز جێ دەهێڵێ، دەیەوێ بزانێ چۆن ئەسپێکە، سپییە، بۆرە، یان سوورە ئەسپە، بەو هێزەی دەڕوانێ بۆ ژوورەوە دەگەڕێتەوە. دەیەوێ بڵێ «ناز جەواهێرخان تۆ ئەو ناوە دوور درێژەت بۆ چییە، تۆ لە هەموو ناوەکان جوانتری، دەبوو تۆ لە سەنتەری سان دی مۆ ببیتە حیکایەتبێژ، تۆ دەتوانی هەموو دنیا بهێنیتە ئەو دێ لاچەپەکە، دەتوانی هەموو دنیا حەیرانی وێنەیەک کەی، هەمووان دوای ئەسپێک خەی».

## پەیکەر

دیسان دەرگا دەکرێتەوە، دیسان بای بەهەشت، لەو دیو دەرگاکەوە بۆن دێت و لەبەردەمی دایکی لەپشت سەری کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ لەسەر ئەژنۆ دادەنیشێ، جامە شیرێکی بەدەستەوەیە، کاکۆ پشتی بە دوو سەرینی گەورەی پەڕ داوە، بێ ئەوەی چاو بکاتەوە شیرەکە دەخواتەوە، ئەو قژەی بۆن بەهەشتی لێدێت خەریکە بکەوێتە سەر رووی، شیرەکە دەخواتەوەو هەستدەکات، ئیدی دەتوانێ چاو بکاتەوە، هەستدەکات دەیەوێ لێو بکاتەوە، ورتەیەک، جووڵە و هەناسەیەک کە بەڕاست لە بەهەشتەوە هاتبوو دەچێتەوە دەرێ و کاکۆ دەڵێ:

– دەبێ ئەو ئەسپە بگەڕێتەوە؟

ئەو دەنگە بە ئاستەم دەگاتە گوێی ناز جەواهێرخان، ناز جەواهێرخان تا ئەوساتە، وێنەی ئەسپەکەی لەبەرچاوە لە رێگایەکە لادەدات و بە ناو دەشتەکەدا دەڕوات، ئیدی تۆزی لە دوا بڵند نابێت و گیا دەشێلێ. چاوەڕێمان کرد، وەک تاساو و بێگیان چاوەڕێمان کرد، دەمانڕوانییە گڵمە تۆزێک لە دوور با دەیهێنا، دەمانڕوانییە هەڵفڕینی چۆلەکەیەک،

وrووژانی پەپوولە و مێشوولەی ناو گژ و گیا، کاکۆ وەختێک چاوەکانی بڵند دەکات و بۆ یەکەم جار دەڕوانێتە ژوورەکەو لە ناز جەواهێرخان دەپرسێ:

– سوڵتان جیهانگیر، ئەو تاکە سوارە، چۆن هاتەوە، چۆن وێنەکەتان دەستکەوتەوە؟

– هەر لە گردەکانی تەیمان پیر بووین، دووکەڵێک لەسەر گوندەکە بەرز دەبۆوە، دووکەڵێک گەورەو گەورەتر دەبوو، شالیاری پیر خدر، چووە پێشی هەمووان وەختێک با ریشە سپییە درێژەکەی دەبرد، گوتی:

– دەبێ چاوەڕێ کەین.

زوو زوو دەیگوت:

– دێتەوە، سوڵتانی من دێتەوە.

شەرەفەدینی مێردم ئۆقرەی نەما:

– شالیاری موبارەک، رێگەمدە، رێگەمدە، بابڕۆم، من، تەنها من دەبێ بڕۆم و بیانهێنمەوە، خۆ سوڵتان باڵندە نییە، من باڵندەم، من دەفڕم و بە چاوترکانێک دێمەوە، چی دیکە بێ خەنجەر و گوللە مەمکوژە.

شالیار تۆزێک سووڕا وەک ئەوەی رێگای بۆ بکاتەوە، ئەو خەریک بوو خۆی تاو دەدا، بۆ ئەوەی کار لە کار نەترازێ، بۆ ئەوەی بە تەنها نەڕوا، پڕم دایە پێیەکانی توند گرتم، گوتم:

– من دێم، من دەبوو ئەو وێنەیەم هێنابا، بشمکوژی لەگەڵت دێم.

ئەو بە هەموو هێزی پێیەکانی راوەشاند و منی فڕێدا، خوێن بە رووومدا هاتە خوار و کەوتم، ئەو فڕی، بە راستی فڕی، لە پڕ دیتمان، هەر هەموومان دیتمان، ئەسپەکەی وەک پێیەکانی چیمەنتۆ کرێن چەقی، رێک و قیت و ئاشکرا چەقی، روانیمانە دوور، دوور تر، ئەسپەکەی سوڵتان جیهانگیر دەهاتەوەو تەنها و تەنها، هورژممان برد، ئەسپەکەی شەرەفەدینی مێردم نەجوولا، بۆ خۆشی دەنگی لێوە نەهات، لەو تێپەڕین، بە تەنیشت ئەودا تێپەڕین، بەرەو ئەسپە تەنهاکە، چی لەو ئەسپە بزانین، چیمان پێدەڵێ؟

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ کە چاوەکانی کردبوونەوە، دەپرسێ:

–بێگومان ئەسپەکەی جەنابی سوڵتان شەرەفەدینی بووە؟

–بەڵا، ئێمە شێواو، کەس مردوو، حەوت پشت مردوو، دەستمان لە ئەسپەکەداو بەلایدا تێپەڕین، بۆ سۆراخی سوڵتان تێپەڕین، گوند هێشتا دووکەڵی لێهەڵدەستا، هێشتا ئاگرمان دەدیت، وام زەن کرد شەرەفەدینی مێردم لە شوێن خۆی، بە خۆی و ئەسپەکەیەوە بووبێتە پەیکەر.

ئەوە ناز جەواهێرخان دەڵێ ئەسپەکە بووبێتە بەرد، کاکۆ دەیان پەیکەری ئەسپی دێتەوە بیر، پەیکەرە بە هەیبەت و گەورەکانی رۆما، ئەسپەکەی پترۆسی یەکەم، ئەسپی خواکانی یۆنان و ئەسپە هەڵخەڵەتێنە تەختەکەی تەروادا، بەڵام ئەو ئەسپەی بنەماڵەکەی جیهانگیر، ئەسپێک بۆ لەحزەیەک هەناسەی راوەستێ و ببێتە بەرد. ئەسپێک کاروان بە لایدا تێپەڕێ و ئەو لە سەرسامیدا بمەیەت، جەواهێرخان دەڵێ:

– لە دووری گوند وەستاین، ئاگرەکە دادەمرکا، جارێ تەپو تۆزی کاروانی دوژمن لە هەوادا مابوو، هەستمان نەدەکرد ئەوە ئەو گوندەیە هەر ئەورۆ جێمان هێشتووە، لەوە دەچوو لە سەفەرێکدا بەسەریدا بکەوین، هەناسە و رێگاو دارو درەختی گۆڕابوو، چووینە ناو گوند و ئەسپەکەی وێنەکەی هەڵگرتبوو هێشتا لەوێ کەوتبوو، هێشتا چاوی زەق و هێشتا زیندوو، ئەو حەیوانە لە ئازاری خۆی و لە غەریبی، هێندەی سەد کەس گریابوو، وێنەکەی لەسەر پشت نەبوو، ئەو سندووق و قوماشەی لێمان پێچابوو لەوێ کەوتبوون، ئێمە سوڵتان جیهانگیرمان دەویست، ئەو لە کوێیە، دوژمن بردوویەتی؟ لە پەنایەک کوژراوە؟ کێ وێنەکەی بردووە؟

## شمشاڵ

ئەو ژنە زۆر سەیر حیکایەتی ون بوونی وێنەکەی دەگێڕایەوە، زۆر سەیر دەگۆڕا، دەتگوت لەو ئان و ساتەدا بە دوای وێنەکەدا دەگەڕێ، پیاوێکی ئازیزیان دیار نییە، مێردەکەی لەو بانوانە بە خۆو ئەسپەو تاساوەو بۆتە پەیکەر، کاکۆ پێیوایە دەکرا وردتر لە ناو وێنەکانی پۆڵ جیمس براوندا بگەڕێ، لەوێ شتێکی لەو کارەساتە دەست دەکەوت، وێنەیەکی سوڵتان یان جیهانگیر، نەیدەزانی چ پەیوەندییەک لە نێوان کورد و بەرد یان پەیکەردا هەیە، ناز جەواهێرخان دەڵێ:

–شالیاری پیر خدر بە ناو هەمووواندا هاواری کرد:

– کوا؟ ئەسپەکەی سوڵتان کوا؟ تەنها ئەو ئەسپە کارەساتەکە ئاگادارە، ئێمەش بێ وەفاو سپڵەبووین ئەو ئەسپەمان فەرامۆش کرد و هاتینەوە ئێرە. ئەو ئەسپە ئێستا لە هەمووومان زیاتر لەو نزیکترە، ئەو حەیوانە هاوڕێ و هاوەڵی بووە، دواسات و دوا چارەنووسی لای ئەوە.

هەمووومان بەرەو ئەسپەکە ئاوڕمان دایەوە، دیتمان شەرەفەدینی مێردم دەستی لە ملی ئەسپەکەی سوڵتانی برای کردووەو وەک هاوڕێ و هاو تەمەنێکی سەری خستۆتە

سەر سەری و هەردووکیان چاویان بۆتە گۆمی خوێن. شەرەفەدینی لێو دەجووڵێنێ وەک قسەیەک بۆ ئەسپەکە بکات، ئەسپەکە وەک تاکە کۆست کەوتوو، وەک غەمبارترین هاورێ هەنگاو دەنێ و چاوەکانی بۆ لای جیهانگیر هەڵدەبرێ، ئێمە قسە ناکەین و دەڕوانین، ئێمە هەناسە نادەین و تاساوین، ئەسپەکە بەرەو جۆگەلە گەورەکەی دێ دەڕوا، هەر بە ناو جۆگەلەیە، ئاوی کانی وکارێزەکەشی دێتەوە سەر. ئێمە، ژنەکان وەک باپێش ئەسپەکە دەگەینە سەر جۆگەلەکە. با کراسە فش و ڕەنگا و ڕەنگەکانمان پڕ با دەکات، خوایە چ ببینین، ئاوەکە سوورە، خوێن بە ئاوەکەدا دێت، جۆگەلەیەک لە خوێن هێندەی شمشاڵێک ئەستوور بە ئاوەکەدا دێت، وەک شێت بۆ سەرچاوەکە دەفڕین، بزانین لە کوێوە ئەو خوێنە تێکەڵ ئاوەکە دەبێت، دەگەینە ئەو شوێنەی ئاوی کانییەکەی تێکەڵ دەبێت، ئاو روونە و ئاوی کارێزەکە سوورە، زیاتر دەپەشۆکێین و بە ئاوەکەدا دەڕۆین، ژنەکان هەموو هاوار دەکەن:

«بۆ کارێزی هەزار دەریا» ئەو کارێزە ناوی هەزارە، هەزار دەریا و هەزار دەریای لە بن هەیە. بەڵام دەریای ئاو نا.

## گوڵە سوڵتانی

کاکۆ لەگەڵ وشەی هەزار دەریا رادەچەنێ و بە تەواوی هۆشی دێتەوە بەر، چ گەشتێک بوو؟ گەشتێک بۆ ئەشکەوتی هەزار دەریا، ئەوێ، ئا، ئەوێ ئەشکەوتی هەزار دەریا بۆ خۆی شارێکە، وڵاتێکە. لە پڕ وەک کەسێکی دیکە لە ناخییەوە قسە بکات، رووی لە نازجەواهیرخان کرد و گوتی:

–ئەشکەوتی هەزار دەریا؟

ناز جەواهێرخان زانی هەڵەی کردووە، زانی هەر بۆ ئەوەی قسەکان بە شەوقەوە بگێڕێتەوە ئەو ناوەی گوتووە، بۆیە خێرا گوتی:

–هەرگیز ناوی ئەشکەوتی هەزار دەریا نەڵێیەوە، منیش نەمگوت ئەشکەوت، گوتم کارێزی هەزار دەریا، ئەویش مەڵێ ئەو کارێزی پیر خدرە.

کاکۆ بۆ ئەوەی بە راستی پیشانیدا کە هەزار دەریای لە بیر چۆتەوە، دەڵێ:

– بۆ پیر خدر؟ هەر ئەو پیاوەیە کە کوڕەکەی ناوی شالیارە؟

ناز جەواهێرخان دەڵێ:

– نا، نازانم، ئەو پیر خدرە لە فکری ئێمە نییە، ئەویش ئەو کارێزەی لێنەداوە، ئەو کارێزە بۆ ئێمە ئاوی زمزمە، بەڵام من تەنها دەمویست، ون بوونی وێنەکەت بۆ باس کەم، دەمویست تەنها دیار نەمانی سوڵتان جیهانگیرت بۆ باس کەم.

دەنگێک لەو دیو دەرگاکەوە، دەنگێک لە دەنگەکانی بەهەشت، بانگی نازجەواهێرخانی کرد، ئەو هەستاو گوتی:

– نەجووڵێی جاریێ هێزت نەهاتۆتەوە بەر هەر ئێستا دێمەوە.

کاکۆ خێرا تەکانی دا هەستێ، چاوی سوڕاو پاڵی بە سەرینە پەڕە گەورەکانی پشتییەوە دایەوە، دیسانەوە هەوڵی دا چاوی بکاتەوە، دەستی درێژ کرد بۆ لای جانتاکەی، دەستی برد و هەستی بەبوونی دەفتەرە چەرمە قاوەییەکە کرد لە بنی بنەوە، ئۆخەیەک بە دڵی داهات، نەرمی و سۆزێک لە ناخی دەفتەرەکەوە رژانە ناو پەنجەکانی، بزەیەکی کرد، بزەیەک وەک ژەهری مار تاڵ، بەڵام شتێک لە لەزەتی تێدابوو، چاوی نووقاند و دەستی گێڕا بۆ پاکەتەکەی شەو لە ئەشکەوتی هەزار دەریا دایانێ، پاکەتێک فیلمێکی تێدایە، کە دەشێ یەکێک لە فیلمەکانی جیمس پۆڵ براون بێ، هەستی بەبوونی نەکرد، نەهاتە بەردەستی، وردترگەڕا، گیرفانی و پەنا جلوبەرگەکانی، نییە، ئەو سندووقە، ئەو فیلمە چی لێهات هەر بەدەستی خۆی لێرەی شاردبۆوە. دیسانەوە لەو پەڕی ئاگاییدا دەستی لە ناو جانتاکەی گێڕایەوە،

«ئەوە کامێرا پێنتاکسەکەم، ئەوە یەخەی کراسەکەم، ئەوە کابۆیەکەی کارۆلین بۆی کڕیم، ئەوە خاولی، ئەها ئەوەش دەفتەرە چەرمە قاوەییەکەی لە داکم دزی، ئیدی کوا؟ کوا فیلمەکەی ئەو بە ئەمانەت دایانمێ، فیلمێک یەک سەدەی تەواوە پارێزراوە، نابێ لە دەستی من ون بێ، یەک سەدەیە دوور لە دید و دەستی مرۆڤ هەڵگیراوە، چۆن دەبێ ون بێت، تاچەندی دیکە ئەو ئینسانە کەساسانە دەبێ لە ناو ئەو فیلمەدا چاوەڕێ بن؟ بە چ حەسرەت و بە چ مردنێکەوە؟ بۆ ئەوان دنیا چ سەختە. بۆ ئەوان زەمەن چ بێ رەحمێکە!»

ناز جەواهێرخان بە باوەشێک بۆن و بریق و باقەوە هاتەوەو روانییە کاکۆ، نەخۆش

و بێحاڵ و سەرگەردان، پێی گوت:

– جارێ هەڵمەستە، تۆ نەتگوت بە شەوێک چۆن وا بێ هێزبووی؟ بە دوای نەخۆشیدا هاتبووی؟

کاکۆ زۆر نائاگایانە گوتی:

– بۆ یەک شەو؟ من هەر یەک شەو لێرە بووم؟ سەفەر لە ماڵی ئێوەدا چ درێژە!

ناز جەواهێرخان حەزی کرد گاڵتە لەگەڵ میوانە شیرین و رۆح سووکەکەیدا بکات، گوتی:

–سەفەر بەخەوەوە؟

کاکۆ وایزانی دەبێ ئەو ژنە ئاگای لە هەموو شتێک بێت، بۆ ناڵێ «سەفەر لە خەودا» بۆ ناڵێ «سەفەری خەو» بۆ وا راستەوخۆ دەڵێ «سەفەر بەخەوەوە»، ویستی بپرسێ ئەو کارێزە چەند لێرەوە دوورە، یان بپرسێ داخۆ ماڵەکەیان دەرگایەکی لەسەر بەهەشتە ئەو بۆنە دێت، بۆنێک کە دەشێ تەنها لە بەهەشتدا هەبێ، بەڵام لە پڕ وەک شتێکی بیر کەوتبێتەوە گوتی:

– داکیشم وەک تۆ حەزی لە حیکایەتە، بەڵام وەک تۆ حیکایەت ناگێڕێتەوە، ئەو بە زیندوویی، هەر بە دوو پێی خۆی دەچێتە ناو حیکایەتەکان دواتر لە شێوەی جەنازایەکدا فڕێی دەدەنە دەرێ. ئەو چاوەکانی لە ناو حیکایەتەکاندا کزبوو، دەنگی لەوێدا نووسا، لە دەست پاڵەوانەکانی ئەوێ پەژموردە و دەستەپاچە و رەنگ زەردە.

ئێستا پێم بڵێ، رێچکەی خوێنەکە گەیشتە کوێ؟ ئەو خوێنەی بە ناو ئاوی کارێزەکەدا دەهات، خوێنی سوڵتان جیهانگیر بوو؟.

ناز جەواهێرخان وەک چاوەڕێ بێت، وەک شێت و شەیدای گێڕانەوەی حیکایەتەکە بێت، دەڵێت:

– ئێمە هەر هەموو ژنەکان، بە هاوار و گریانەوە، کە ئێستا نەمانزانی پیاوەکان ئەوکاتە چیان دەکرد، بۆ بەدەنگمانەوە نەدەهاتن کە بەڕاستی ئێمە خەریک بوو بمرین، لە هەیبەتان شێت و سەراسیما ببین. نەماندەزانی ئەسپەکە لمووزی شۆڕکردۆتەوەو بە

دوای ئێمەدا دێت، دەنگی منداڵەکانمان نەدەبیست. دووکەڵ دێیەکەی گەمارۆ دابوو، ئاگر لەو لاو لای دێکە دەسووتاو کەس نەچووبۆوە ماڵی خۆی تا بزانێ چی رووی داوە.

– پێش ئەوەی بگەینە سەر کارێزەکە، هەستمان کرد کەسێک، تارماییەک لەبەردەم کارێزەکەیە، هیچمان پێ نەگوترا، کە گەیشتین، سوڵتان وەک بەسەد مەلائیکەت، وەک بەسەد دەستی فریشتەو پیاوچاکان هێنابێتیان، لەبەر دەمی ئەشکەوتی کارێزەکە، لەسەر تاتە بەردێک دانیشتبوو پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو، لە ئێمەی دەڕوانی، چاوەکانی کراوە بوون و وریاو زیندوو، شاگەشکە بووین، دیسانەوە لە خۆشیان گریاین، ئێمە دەمانزانی گریانی خۆشی چاو ڕوون دەکاتەوەو گریانی ناخۆشی چاو رەش دەکاتەوە. نەیدەتوانی بدوێ یان نازانم قسەی نەدەکرد و بزەیەکی نادیاری لەسەر روو بوو، من چوومە پێش و لەبەردەمی دانیشتم و شانەکانیم لە باوەش کرد و گوتم:

– چی رووی داوە، سەلامەتی؟

هەوڵی دا دەمی بکاتەوە، لێوی دەلەرزی و دواتر گوێم لێبوو گوتی:

– گەیشتن؟

هەستم کرد، دەستم بە لینجییەکی ساردا رۆدەچێ، دەستم سوور سوور ببوو، ئەو ملی لار بۆوە و منیش دەستە بە خوێنەکانم بەسەر و چاوی خۆمدا هێناو پرچەکانم سوور کرد، ئێستاش دەبینی بسکێکم هەر سوورە، هەموو ژنانی ئەو ئاواییە بسکێکیان دەبێ بۆ هەمیشە سوور بێت، ئێمە ژنە بسک سوورەکانمان پێدەڵێن، بسک سوورانی سەرکارێز، پیاوەکانیش گەیشتن، شالیاری پیر خدر دەگریا و دەیگوت، بۆ وا دەکەن، بۆ دەگریەن، خۆ نەمردووە، ئەو تەنها خوێنی زۆر لەبەر رۆیشتووە.

کاکۆ دەیڕوانییە بسکە سوورەکەی ناز جەواهێرخان، ئەو لە سەر گریان بوو، ئەو دەبوو حیکایەتخوێن بایە، ئەو ژنە دەبوو چیرۆکی باڵندەی تۆس بگێڕێتەوە، ئەو دەبوو حیکایەتی پاشن کینگ دەست پێ بکات، دەبوو ئۆڕانۆس لە سەر تەلەفزیۆن بە هەموو دنیا بناسێنێ، کاکۆ وەک باوەڕی بە شالیاری پیر خدر کردبێ، گوتی:

– جا نەمردبوو؟ بۆ گەیشتبووە سەر کارێزەکە؟ سوڵتانی جیهانگیر هیچ قسەیەکی

دیکەی نەکرد؟

– شەرەفەدین جیهانگیر کە ئەوە ناوی ئەسڵی مێردەکەمە، هەر پێی دەڵێن جیهانگیر، بە خۆی و ئەسپەکەی سوڵتانەوە گەیشتە وێ، من بە دەستی پڕ خوێنمەوە، پشتێنەکەیم توند گرت و گوتم:

– غەدرت لە من کرد، من دەبوو بگەڕێمەوە.

ئیدی ئەو قسەیەکی نەکردو، نەشگریا، دڵۆپێک خوێن، فرمێسکێکی سوور، بەڵام روون لە چاوی ترازاو کەوتە سەر رووومەتی چەپی، نەتدیت، ئەو دڵۆپە خوێنە روونە چۆن لە سەر کوڵمی چەپی تەقیوەتەوە، ئێستا و ئێستاش لێی نەبۆوە، ئیدی ناوی ئەو بووە شەرەفی چاو بە خوێن، قسەیەکی دیکەی نەکرد، زۆر دواتر گوتی:

«قسە دنیا وێران دەکات»

وەک سوڵتان لەوێ دانیشتبێ و زیندوو بێ، بەو رووومەتە بە خوێنینەیەوە روانییە سوڵتان، روانییە قووڵایی چاوەکانی، چاوێک لەو پەڕی کراوەییدا دەیڕوانییە ئاوی کارێزەکە کە هێشتا خوێنی لەگەڵ خۆی دەبرد، شەرەفی چاو بە خوێن، یان شەرەفی خوێنین دەیڕوانی بە دوای شتێکدا دەگەڕا، دەیزانی چاوەکانی سوڵتان بە دوای شتێکدا دەگەڕێن، هیچی نەدەدیت و دەیویست لە چاوەکانیدا شتێک ببینێ، هەمووومان بە دوای شتێکدا دەگەڕاین، هەموو چاوە ئاوارەو دڵ ئاوارە بووین، کەسمان قسەمان نەدەکرد، کەسمان نەمان دەگوت بە دوای چدا دەگەڕێین، ئەو رۆژە چەند لە مەرگی سوڵتان ترساین، سەد هێندە لە ناوی (جیهانگیر) ئەو ناوەمان لەسەر زمانی خۆمان سووتاند، لە دڵی خۆماندا بێدەنگ و کپ شاردمانەوە، کەس ئەو ناوەی نەهێنایەوە، هەموو وامان دەزانی تەنها بڵێین(وێنە) ئیدی خوێن دەڕژێت و دێیە سووتاوەکەمان دەکەوێتە بن دەریای خوێن، کەسمان سەیری ئاوێنەمان نەدەکرد، ئەلبوم و جانتای کۆن و سندووقی کەلوپەلمان نەدەکردەوە نەک وێنەیەک، شێوەو سێبەرێک بەرەو رووومان بێتەوە یان وشەی وێنە لە دەممان بترازێ، بە چاوێکی پڕ نهێنی و هەستێکی شارەوەوە دەگەڕاین، کون و قوژبنی ماڵەکانمان و تەویلەو دیوەخان و بن دیوارە رووخاوەکان و سەربانە

تەپیوەکان، هەموو شوێنێک دەگەڕاین، بێ ئەوەی کەس بڵێ، یان پرسیار بکات لەچی دەگەڕێین و ئەو هەموو شێواویە چییە ژیانی داپۆشیوین!

گوندەکەیان سووتاندبوو، جگە لەو ئەسپە بەستەزمانە جووجەڵەیەک لەوێ جێنەمابوو، کەسێک لە ناو گونددا نەمابوو، ئەوان، ئەو وێرانکەر و برا دێرینانە گوندەکەیان سووتاندبوو، کەس بیری لەوە نەدەکردەوە ئەوان چۆن هاتن و بۆچی ڕۆیشتن کەس نەیگوت ئەوان چیان بردو چیان سووتاند، هەموو هەر دەگەڕان، هەر خەریکی هەڵکۆڵین بوون، تەپوتۆز پرچی کچەکانی شارد بۆوە، ریشی پیاوەکانی سپی کردبوو، شەڕەف خوێنینی مێردم، دەچووە لای ئەسپە بریندارەکە، چونکە ئەسپەکە چەند ڕۆژ گیانی نەدابوو، هەر بە چاوی گەورە و فراوانەوە بۆ هەمووانی دەڕوانی، کەسیش جورئەتی ئەوی نەبوو بیکوژێت و لە ئازار رزگاری کات. دوای سێ شەو و سێ ڕۆژ شالیاری پیر خدر ماڵ بە ماڵ گەڕاو هەمووانی کۆکردەوە، هەموو گوندی بردە سەر گۆڕە تازەو غەریب و بێنازەکەی سوڵتان، گوتی:

– ئەو پیاوە سێ شەوە دێتە خەونم، هەر چاو لێک نێم بانگم دەکات، دەڵێ چاوەکانم بۆ نانووقێنرێن، پێڵووەکانم داناخرێن، بۆ هێندە شپرزەن، ئیدی پشوودەن، ئەمانەتەکەتان لای منە. لەگەڵ وشەی ئەمانەت ئێمە هەموومان هەستمان کرد، خوێنمان رژایە بەر پێمان، هەستمان کرد خوێنمان لەبن پێیەکانمان گومێلکەی کردووە. سەرنجی هەموومانی بۆ لاسکە گیایەک راکێشا لە پشت سەری گۆڕەکەوە هاتبۆدەر، بەو سێ ڕۆژە گوڵێکی چاوکراوەی سپی کە دوو هێڵی رەش بە نێوان پەلکەکانیدا هاتبوون. ئەو دەم ناومان نا «گوڵی چاوەڕوانی» و ئێستا هەموو ساڵێ لەسەر وەختی کوژرانی سوڵتاندا ئەو گوڵە هەموو گۆڕستانەکە دادەگرێ پێی دەڵێن گوڵە سوڵتان، یان گوڵە سوڵتانی.

کاکۆ کە تەواو هۆشی هاتبۆوە بەرو دەیویست هەستێ و بەرانبەر ئەو حیکایەتخوانە ئەزەلییە دانیشێ و دەستی ماچ کات، ئەویش دەستێکی لەسەر شانی کاکۆ داناو وەک بیەوێ هەڵنەستێ. کاکۆ گوتی:

– دەکرێ ئەو گوڵە سوڵتانییە ببینم؟

– هەموو کەس دەکرێ ببینێ، یەکەم دەبێت بێتە ئەو گوندە، چونکە ئەو گوڵە تەنها و تەنها لەو گوندەی ئێمەدا هەیە، دووەم دەبێ لە وەرزی گوڵەکاندا بێت.

کاکۆ دەپرسێ:

– وەرزی ئەو گوڵە زۆری ماوە؟ گوڵە سوڵتان بەڕاستی ناوێکی جوانە، گوڵێک تایبەت بە گوندەکەتان، ئەو هیچ نیشانەیەکی سوڵتانی پێوەیە.

– گوڵێکی ئارام بەخشە، پەڕ سپی و میل ڕەش، دوو میلی نە باریک و نە پان، من بۆنی سوڵتانی لێدەکەم، فەرامۆشیم پێی دێت، چەند لێی ورد دەبییەوە ئەوەندە زیاتر شێوەی سوڵتان دەدات. ئەو گوڵە هەرگیز لە ناو ماڵان ناڕوێ، نازانم کەس نەیهێناوەتە ناو ماڵان، کەس لێی نەکردۆتەوە، بەو دوو چاوە ڕەشە میل میلانەی تەماشات دەکات، ئێمە چاومان ئاوی لێدێت و فرمێسک بە رووومەتماندا دێتە خوارێ، ئەو گوڵە نە چاوی دەترووکێنێ و نە دەتوێتەوە هەر ئاوا قووڵ و سەنگین دەڕوانێ. لە گوڵە ئاوی دەچێت.

کاکۆ دەیەوێ بپرسێ، لەو ژنە حیکایەتخوانە دڵ گەرم و پڕ قسەیە بپرسێ، وێنەکە چی لێهات، بەڵام ترسی چاوەکانی و شێوەی گێڕانەوەکەی هەرگیز ڕێگایان بەو پرسیارە نەدا، تەنها ئەوەندە گوتی:

– ئەو کارێزی هەزار دەریایە، یان کارێزی پیر خدرە، لە ناو دێ دایە؟ لەو گوڵانەی لێناڕوێ؟

ژنە، کە دڵنیایە میوانە ناسک و غەریبەکەی روو لە چاک بوونەوەیە، دڵشادتر دەدوێت و دەڵێ:

– تا ئەو ڕۆژەی شالیاری پیر خدر هەموومانی بردە سەر گۆڕی سوڵتان، تا ئەو گڵە تازە نەببو میوانی، کەس بۆ ساتێک پشووی نەدابوو، بەچاو و بە دڵ و هەست بە دوای وێنەکەدا دەگەڕاین، بە نیگایەکی خێراو لەناکاو لە یەکترمان دەپرسی، ئەو گوڵە دڵ گەرمییەک بوو، ئەو گوڵە جوانترین میوانە بە کەسێک، بە گوندێک بەخشرابێ.

دەنگ و هەرایەک لە دەرێ پەیدابوو:

– ئەمڕۆ هەوا خۆشترە.

ئەوی دیکە دەیگوت:

– خۆزگە بەفرەکە هەر باریبایەو ئەو بایەی هەڵنەکردبا

دەنگێکی ژنانە دوور تر لەوان دەیگوت:

– سەعاتێکی دیکە نابا دنیا دەبێتە شەختە، خۆرئاوا دەبێت و بەراز خۆی لەبەر ئەو بایە راناگرێ.

دەرگاکە کرایەوەو ئەو پیاوەی کە حیکایەت و ژیانی کەوتبووە لای کاکۆ، ئەو پیاوەی ناوی راستەقینەی شەرەفی چاو بە خوێنە، یا شەرەف خوێنینە هاتە ژوورێ، کاکۆ وەک تەنها لەو چرکەیەدا دیبێتی، یان وەک کەسێکی ناسیاوی دیبێت و تازە ناسیبێتییەوە شڵەژاو تەماشای ڕوومەتی چەپی کرد و وەک فرمێسکە خوێنینەکە ئێستا تەقی بێت، وەک لەبەر چاوی ئەو تەقیبێت بەسەر ڕوومەتیدا بڵاوببۆوە، پەڵەیەکی بچووکیشی پەڕیبووە سەر پەڕەی لووتی، هێندە ئاڵ و روون، وەک ئەوەی دڵێکی تایبەتی هەبێ و بە تەنها خوێن بۆ و دڵۆپە رژاوە بنێرێ.

هەر لە دەرگاوە گوتی:

– ناز جەواهێرخان ئەو پیاوە گەنجە چۆنە؟ ئا، چاوی هەڵێناوە، کوڕە نەیکەیە راست و نەخۆش نەبیت.

ناز جەواهێرخان هەستاو باوەشێک رەنگ و بۆن و ورشەی لەگەڵ هەستان و لەو دیو دەرگا دیسانەوە بۆنی بەهەشت هات و ناز جەواهێرخان چۆ دەرێ و کاکۆ گوێی لێیە دەڵێ:

– سیحربانوو ئەمڕۆ ماندووبووی؟

دەنگێک دێت وەک لەرینەوەی تەلی کەمان، قسەیەک دەکات و کاکۆ تێی ناگات.

کاکۆ نایەوێ نان بخوات و نایەوێ گوێی لە دەنگ و گوڕە گوڕەی کۆڕی پیاوان بێت و دەیەوێ ناز جەواهێرخان بەو دەنگ و تۆن و سەلیقەیە حیکایەتی بۆ بگێڕێتەوە، ئەو کوا بەو حیکایەتانە نەبا ئەو هەموو ماوە لەگەڵ ئەو گوندە دەژیاو ئەوەندە پێدەگەیی، ئەوەندە بەرگەی نەخۆشی دەگرت. ئەو ئێستا ئەوەی بە تەواوی زانی کە خودی جەستەی ئەو

هیچ نییە جگە لە سندووقێک بۆ شاردنەوەی نهێنییەکان، مرۆڤبوونی ئەو فڕێدرابووە ناو قەدەرێکەوە کە هی خۆی نییە. بۆ ئەو ببێتە هەڵگری نهێنییەکانی جیمس پۆڵ براون.زیاد لە برادەرەکانی ئەوە دەبێتە تاکە هاوڕازی ئۆڕانۆس و باغەوانێک کە میراتگری هەموو حیکایەتەکانە دەبێتە هاودەم و هاونشینی و نووسراوی سەرگەڵاو پەیکەر و پەلەدار و بەردەکان دەخاتە ناخی ئەو. ئەویش دەبێتە جێگای کۆکردنەوەی ئەو هەموو دەربەدەر و کوژراوانە، ئەوانە هەر هەمووی لالەیەک و باڵندەی تۆس لەلایەک دەیتوانی لەگەڵی بێت و ئەوی دەکەوێتە سەر رۆحی بۆی سووک کات، ئەو ئێستا و ئێستاش نەیتوانی سێبەر و وجوودی کچی سەوز لە بیرکات، هەنگاوێک، بستێک، تاڵە موویەک لە تەنیشتییەوە وەستابوو، کچێک دوای سەد ساڵی تەواو دێت بۆ خوێندنەوەی نامەکەی ئۆڕانۆس، نامەیەک کە تەنها و تەنها دەبوو ئەو بیکاتەوە، دوای ئەو هەموو ساڵە کچێک بە هەموو زیندوویەتی و وجوودی خۆیەوە دێتە دیداری.

کاکۆ دەیویست بۆ ساتێک بۆ خۆی بژی و سەفەر کات و بارە قورسەکانی ژیان جێهێڵێ، باوکی، ئاڕتووش کوردەی دایکی و کاڕۆلین و هەموو یادەوەرییە قورسەکان جێهێڵێ. ئەو، ئەو کاکۆ ژەنیاری موراد بەگە لەوە کاڵفامتر بوو، لەوە ناحاڵیتر و ناتێگەیشتووتر بوو، گومان لە توانا و ئازایەتی خۆی بکات، ئەو رۆحی بیرەوەری و مردنەکانی لەگەڵ خۆی هێنابوو.

ئەو دەفتەرێکی چەرمی قاوەیی رەشی هێنابوو کە ژیان و مانەوەی تەواوی بە شەرییەتی بۆ سەدەیەکی تەواو هاڕی بوو، ئاسوودەی جیهانی لەت لەت کرد بوو. وەختێک خۆی لە هەموو ئەو دنیا تاڵ و وێرانکەرە دەدزییەوە، رووداوەکاتە، خاوەن ماڵەکەی، جیهانگیر و ناتوانێ پێی بڵێ شەرەفی خوێنین، چونکە ئەو لە ناو ئەو هەموو نهێنییەدا نازانێ دەبێ کام وشە بڵێ و کامیان نەڵێ، چۆن بپرسێ ئەشکەوتی هەزار دەریا دەکەوێتە کوێی گوندەکەوە؟ چۆن لێی بپرسێ ئەسپەکەی سوڵتان چۆن ئەوانی بردەوە سەر خوێنی سوڵتان؟ چۆنی دەربارەی گوڵە سوڵتانی پرسیار لێ کات؟ کاکۆ هەر چەند دەکات ناتوانێ سەیری وێنەکەی جیهانگیری گەورە بکاتەوە بە دیوارەکەوە،

ناز جەواهێرخان دێت، دانانیشێ و دەڕوات، سینییە نانەکە لە نزیک کاکۆیە و شەرەفی چاو بە خوێن دەچێتە نزیکی کاکۆ دادەنیشێ و دەست دەکەن بە نان خواردن.

ئەوان نان دەخۆن و دەفتەرێکی چەرم لە بنی جانتاکەیدا هەناسە دەدات و سندووقێکی بچووک کە دوا فیلمی جیمس پۆڵ براونی، تێدای لە ئەشکەوتی هەزار دەریاوە هێناویەتی لە شوێنێکی نادیار بانگی دەکات.

## ناز جەواهێرخان

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ، جەستەیەکە حیکایەت کوشتوویەتی، ئەو ویستی لە ئەفسانەی رۆژهەڵات دوور بێت و دوای کچێکی کۆری کەوێت و بۆ ئەبەد ئەو حیکایەتە بێ رحمە و تاسەر ئێسقان هەست و دڵکوژانە لە بیرخۆی باتەوە، ئەو کچە کۆرییە شیرین و وردەش گیرۆدەی پیاوێک بوو، کە هەر بە کڵاو و جلوبەرگی سەدساڵ لەوەو پێشەوە لە ماڵی کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ هاتەدەر، ئەو پیاوە ناوی هۆستاشی بوو، هۆستاشی پیر دوا ئومێد و جوانترین ئومێدی کاکۆ بوو، ئا ئەو پیاوە کە کەس نازانێ تەمەنی چەندە وەک پیاوە ئەفسانە و سەمەرەکانی رۆژهەڵات نییە کە ژیان و مردنی هەر حوزن و غەمگینییە.

هۆستاشی منداڵەکانی دارستانی لە دێو و دڕندەکان رزگار دەکرد و بۆ خۆی دەبردن، هەر کەسیش رای کردبا دەیکردە گەڵایەک، دەیکردە کڵاو بە رووپەک، یان دەیکردە هێلکەیەک و لە هێلانەیەکی دادەنا، کە هەرگیز تەیرەکانی بۆ ناگەڕێنەوە، بەڵام ئەو هێلکەیە ئومێدێکی هەر هەیە رۆژێک لە رۆژان باڵندەیەک بێت و لەسەری کڕ بکەوێت و

هەڵیهێنێ.

کاکۆ لە ناو ئەو ماڵە دوورە دەستە، کە سەرەتا رای وابوو، بۆ هەمیشە لە ماڵی خۆیان دوورکەوتۆتەوە، بۆ هەمیشە بابە لە ناخدا مردوو غەمبارەکەی نایەتەوە ڕێگای، ئێستا لە هەموو کاتێ پەشیمانترە. بۆچی ئاخر بۆچی لەو تەمەنە منداڵییەیدا بە قسەی هیۆژین گەڕایەوەو نەچووە ئەو سەری دارستانەکان. بۆچی نەچووە فیلەندا و لەوێ ئەوەندە گەڕابا تاکو هۆستاشی راستەقینە و پیری دەدۆزییەوە، لەوێ با بیکردبا بە هەنگێکی بچووکی سەوز و بۆ ئەبەد بە تەونی جاڵجاڵۆکەیەکەیەوە نوساندبا، بابیکردبا بەو کوللە زێڕینانەی کەس نازانێ زیندوون یان مردوو.

ئێستاش هۆستاشی دەویست، بەڵام کوا لەو دارستانە قوڵ و پڕ نهێنیانەوە هۆستاشی دێتە دەر و دەگاتە ئێرە، دەگاتە گوندێک ئەشکەوتی هەزار دەریای لێیە، ئەو لە بیاباندا مووەکانی لەشی کە لە هەمانکاتدا سەرچاوەی هێز و تواناشییەتی دەوەرێ و لە ناو دەریادا دڵی وشک دەبێتەوە کەبەوە نامرێ، بەڵام دەبێتە دڕندە.

ئەو تاکە کەسە هەرگیز دارستان جێ ناهێڵێ. ئەو دەتوانێ خۆی بگۆڕێت و ببێتە دارێک تەنها ناو قەدەکەی هێندە گەورە بێت نیوەی گیاندارانی دارستان خۆی تێدا بشارنەوە.

دەتوانێ ببێتە پڵنگێکی رەش تەنها چاوەکانی بریسکە بدەن.

کاکۆ لە ناخەوە دەڵێ:

– من هەرگیز وەک ئەو کچە کۆرییە نازدارە لەبەر دەستی هەڵنەدەهاتم و بۆ ئەبەد لەگەڵی دەژیام. ئاخ هۆستاشی ئێستا لەو ژوورە دوورە دەستە پەیدابایە و رزگاری کردبام. لەگەڵم هاتبا بۆ ناو ئەشکەوتی هەزار دەریاو تێکەڵ ئەو دانیشتووانە بریندار و هێمنەی بووبایە و نهێنی ئەوانشیی بۆ هێنابایەنەوە. کاکۆ دەیەوێ هەلێک بەدەست بهێنێ و لەگەڵ ناز جەواهێرخان سەرێک بە قسەی ئەو لەو کارێزی هەزار دەریایە یان کارێزی پیر خدرە بدات.

ناز جەواهێرخان لە خۆی دەپرسێ:

- من کوا بە نیازی گێڕانەوەی ئەو هەموو حیکایەتە بووم؟

سیحربانوو، بە خۆی و قژێکی درێژ و بۆنێکی بەهەشتی لە دایکی نزیک دەبێتەوەو دەڵێ:

- ئەوە چ بوو ئەو هەموو رازەت لەگەڵ ئەو میوانە، ئەو میوانە کە کەس نازانێ چ بایەک هێناویەتی، هەستت دەکرد ئەو گوێی لە دەنگتە؟ یان هەر بێهۆش بوو. نازانم لە چ تەمەنێکدا ئەو پیاوەم دیوە؟

ناز جەواهێرخان، دەستی سیحربانووی کچی دەگرێت و دەڵێ:

-ئەو پیاوەت دیوە؟ ئەو چاوی نەدەکردەوە، بەڵام کە تۆ دەهاتییە ژووری، دەیویست لێوی بکاتەوەو قسەیەک بکات تەنها بەوەدا دەمزانی هەناسە دەدات.

سیحربانوو وەک گوڵێکی سوڵتانی، قژە رەشە درێژەکەی وەک میلە رەشەکانی گوڵە سوڵتانییەکان دەجووڵاندەوە، ئەو ساڵێک لەگەڵ گوڵە سوڵتانییەکان لە دایک ببوو، ناز جەواهێرخان زۆر درەنگ زانیبووی منداڵی دەبێ، هەستی بە قورسی سک پڕی و دەردە سەری منداڵ بوون نەکردبوو، ئەو کچە بێدەنگ و چاو فراوانە بێ ئەوەی لە هیچ بپرسێ، دنیا لەبەر دەستی بوو.

ناز جەواهێرخان هەر دەڵێ:

- ئەو هەموو حیکایەتە چی بوو، بۆ و پیاوەم گێڕایەوە، بێ ئەوەی گوێم لە دەنگی بێت هەستم دەکرد دەپرسێ، بەڵام پێم نەگوت وێنەکە لە کوێ بوو، نا ئەویش ترساو نەیپرسی، دوای سوڵتان و دەرکەوتنی گوڵەکانی چاوەڕوانی وێنەکە چی لێهات؟ سیحر بانوو دەزانی دەیگوت دەکرێ گوڵە سوڵتانییەک لەگەلڕ خۆم بەرم.

سیحربانوو پرسی

-جا تۆ سەرسامی ئەوەی ئەو هەموو حیکایەتەت بۆ گێڕاوەتەوە کە زەحمەتە جارێکی دیکە ئەو کوڕە لە بنیان راست بێتەوە؟ یان سەرسامی ئەوەی کە پێت نەگوتووە لە دوای ئەو هەموو کارەساتە وێنەکە لە کوێ بوو. بۆ گوڵە سوڵتانییەکیشی پێ نادەی!.

ناز جەواهێرخان لەو پەڕی حوزنیدا دەڵێت:

– سیحربانوو من چیم بۆ گێڕاوەتەوە، کوا باسی چیم کردووە، ئێمە بە سیحرێک ڕزگارمان بوو، دێیەکەی ئێمە ئەسپێکی لێکوژراو سوڵتانێکی لێ شەهید بوو، بۆ جگە لە ئێمە کەس لەو هەموو گوند و خانەوادە و عەشیرەتانە ڕزگاری بوو؟ ئەوان وەک خۆیان ون بوون، نەهاتنەوە، نە وێنەیەک و نە ئەسپێک و نە گوڵە سوڵتانییەکیان لێ بەجێما، ئەو پیاوە غەریب و دەردەدارە ئەو هەموو حیکایەتانە ببیستێ، جارێکی دیکە نایەتەوە سەر پێ.

کاکۆ هەموو ئەو حیکایەتانەی دیبوو بێگومان بە چاوساغی وێنەکەی سەید حوسێنی جیهانگیر، نەک وێنەکەی، بەڵکو خودی سەید حوسێن، لە ئەشکەوتێکدا بە ناوی ئەشکەوتی هەزار دەریا، تا ئەوکاتە کاکۆ نەیتوانیبوو بیر لەو وێنانە بکاتەوە، بیر لە دنیای ناو ئەشکەوتی هەزار دەریا بکاتەوە. ئەو تەواو دانتی بیر دەکەوتەوە، فریشتەو سزادان و ڕۆحکێشانی بیر دەکەوتەوە. هەموو ئەو شار و زیندان و بە هەشتانەی بیر دەکەوتەوە کە باسی دنیایەکی دیکەیان دەکرد، دنیایەک، شارێک، وڵاتێک لە ئاسمان.

سیحربانوو دەیزانی دایکی چ حیکایەتبێژێکە! ئەو لەو ڕۆژەی بەبەر مەمکییەوە شیری خواردبوو شارەزای ئەو حیکایەتانە بوو، سیحربانوو بۆ وی سیحرێک بوو لە هەموو ساتێکدا دەکرا دیار نەمێنێ و تەنها قژە درێژەکەی لە شێوەی گوریسی تا زەوی درێژ بە دیواری ژووری زەخیرە و چێشت لێنانەکەیدا شۆڕبێتەوە. هەرگیز نەمتوانی ڕێگا بە خۆم بدەن سیحربانوو بگێڕمەوە، گێڕانەوەی سیحربانوو تەواو وەک جنینی هەور وایە.

لە کونێکەوە کە هەر هێندەی کونی دەرزی بەرگدرووەکان دەبوو دەمدی ناز جەواهێرخان شوێن بە خۆی ناگرێ و دەیەوێ بچێتەوە لای کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ و قسەی بۆ بکات، باسی گوڵە سوڵتانییەکان، گۆڕەکەی سوڵتان و کارێزی هەزار دەریاو وێنەکەی سەید حوسێنی جیهانگیر و خاڵەخوێنینەکەی شەرەفەدین.

ئەو دەیویست هەموو دنیا بگێڕێتەوە، تەنها ئەو جورئەتی دەکرد و حەزی دەکرد سیحربانوو بیگێڕێتەوە. سیحربانوو بۆ نازجەواهێرخان کتێبێک نەبوو هەموو شتێکی

تێدا نووسرابێ، نا نۆتەیەکی مۆسیقا نەبوو بیلێتەوە، سیحر بانوو بۆ ئەو دارێک بوو، لەوکاتەوەی چرۆی کردبوو لە ناو سکی و تولفێک بوو ژیانی ئەزبەر کردبوو، بەڵام نەدەکرا کچێک بۆ پیاوێکی غەریب بخوێنێتەوە.

جارێ هەروای دەزانی ئەو رۆژەیە سوڵتان جیهانگیر مرد، ئەو رۆژەیە ئەو لەسەر کارێزەکە کەوتبوو و خوێنی دەرژایە ناو ئاوەکەو دەیبرد، زۆر دووری دەبرد. جارێ هەروای دەزانی ئەو رۆژەیە ئەسپەکەی وێنەکەی لەسەر پشت بوو تێیدا کوژرا. زۆر بەتاسەوە بوو هەروای دەزانی ئەو رۆژانە وێنەکەی سەید حوسێن ون ببوو، ئەو رۆژانەی کەس هیچ کەس، تەنانەت منداڵ و کانیاوەکەش ناوی ئەویان نەدەگوت، دێ هەمووی دەگەڕاو کەس نەیدەگوت لەچی، گردو رەزی بەرماڵان و لادیوار نەما هەڵی نەدرن بە دوای ئەو وێنەداو کەس نەیدەگوت بۆچی دەگەڕێین، هەر بە چاو، هەر بەنیگاو تەماشاکردن بێگومان لە چاوی یەکتر نا، بەیەکتریان دەگوت و پرسیاریان دەکرد و وەڵامیشیان دەبیست.

ئەو رۆژانە، سێ رۆژی یەکەم یەک تاکە قسە لەو دێیە نەکراو ئەو دێیە ورتەی لە دەم نەهاتۆتە دەر، منداڵی شیرە خۆرە نەگریاوە، کەس عەشقێنی نەکردووەو پیاو و ژنیش تێکەڵی یەکتر نەبوون، ئەو سێ تاکە رۆژە بوو لەو گوندە بانگ نەدراو نوێژ نەکراو تاکە ئایەتێکی تێدا نەخوێندرا.

ناز جەواهێرخان بۆ و رۆژانە گەڕابووەوە بە تەواوی بۆ و رۆژەی کە لە حیکایەتەکەدا پێیگەیشتبوو. دوای سێ رۆژکە لە پڕدێ دەنگی تێکەوت، هاوار هاواری بێ ماناو بێ بیرکردنەوە، هەر کەسە هاواری دەکرد، منداڵ بە هاوارەوە دەگریا، کەس نەوی قسەی نەدەکرد، ترسابوون لەو بێدەنگییەدا بتەقن.

لەو هەمووو هاوار و گرمەو هەرایەدا کەس ناوی سەید حوسێنی نەهێناو کەس باسی وێنەکەی نەکرد، جارێکی دیکە ناز جەواهێرخان فورسەت دەهێنێ و دەچێتە ژوورێ و دەچێتە لای کاکۆ. کاکۆ هەر لە خەیاڵی ناز جەواهێرخان دایە، پاڵی بە پشتیکانەوە داوەتەوەو چاوی لە دەرگایە، ئەو پشتیانەی لەپەڕی ئەو باڵندانە دروست کراون رۆژێک

له ڕۆژان هەر تەواو وەک کاکۆ بە سەفەرێکی یەک ڕۆژە بە ناو هەورەکاندا هەروا لە ڕۆژێکی بەفراویدا هاتوونە ئەو گوندە.

ناز جەواهێرخان بە تەنها دێتە ژووری، ئیدی بای بەهەشت لەودیو دەرگا دەمێنێتەوە، لەودیو لە شوێنێکی دیکە، لە ژوورێکی دیکە، بای بەهەشت لەگەڵ سیحربانوو دەگەڕێ. سیحربانوو نایەتە ژوورێک پیاوێکی غەریب تێیدا بەئاگا بێت.

–ناز جەواهێرخان کە سوڵتانتان بە کوژراوی دیتەوە، کە دیتتان خوێنی بە جۆگەلەکەدا دەڕوا، کە ناشتتان و گوڵە سوڵتانی سەریان وەدەرنا ئیدی وازتان لە وێنەکە هێنا؟

خودای گێڕانەوەو حیکایەت گوتی:

– دەکرێ واز لە گوندە بێنین و بۆ ئەبەد منداڵ و مێردمان لە بیرکەین، دەشێ نەچینەوە سەر کێڵگەکان و لێگەڕێین بێستانەکانمان وشک بن، دەکرێ هەتا گوڵەگەنمەکانمان ئیدی لە ناوەندی گەورەبووندا بوەستن و لە بیریان چێتەوە کامڵبن، بەڵام خەڵکی ئەو گوندە، هەرگیز ئەو وێنەیەیان لە بیر ناچێتەوە، دوای چەند و چەند، چەند دوای قسەکانی پیر خدری شالیار، چەند دوای ئەو ڕۆژەی سوڵتانمان ناشت و چەند دوای ئەو ڕۆژەی خوێن خوێنی بەکەف و کوڵ تێکەڵ کاریز و کانییەکانمان بوو، بەیانییەک شەرەفی چاو بەخوێن لە خەو هەستا و گوتی:

– نازیلێ سوڵتان لە کوێی دەڕوانی؟ مەبەستم ئەو ڕۆژەیە کە پێکرابوو، سوڵتان دەمێک بوو خوێنی لەبەر دەڕۆیی، تەنها لەبەر ئەوە نەمرد بوو، ئێمە بگەینە سەری و پەیامێکمان بداتێ، ئەو توانیبووی مردنی خۆی بوەستێنێ و مۆڵەتی لێوەرگرێ.

ئەوە یەکەم جاربوو شەرەفی چاو بەخوێنی مێردم قسە بکات، یەکەم جار بوو دوای ون بوونی وێنەکەو کارەساتی سوڵتان ورتەی لە دەم بێتە دەرێ، بیرم لە قسەکانی دەکردەوە، گوتم:

– سوڵتان مردنی خۆی ڕاگرتبوو تا ئێمە دەگەین!

من لەو پەڕی سەرسامیدا ئەو قسەم کرد. ئەو گوتی:

–کوان؟ کوان پیر خدری شالیار؟ با هەموویان بێن، ئەو دەبوو دەمێکبا مردبا، ئەو

جۆگەلەیەکی پڕ خوێن کردبوو، ئەو بە دانیشتنەوە رەق رەق ببوو، ببووە شەختە، تەنها چاوەکانی دەجوولان، تەنها چاوەکانی قسەیان دەکرد، ئەو دەیڕوانییە ناو کاریزەکە، بۆ قوولایی تاریکییەکە دەبێ بگەڕێینەوە ئەوێ، وێنەکە لەوێدایە، ئێمە لە خۆڕا خۆمان لە ناو دێ ماندوو کردووە، ئێمە لە خۆڕا دوای شوێن پێی ئەسپەکە کەوتووین. ئەو پیاوە بە هەیبەت و خۆڕاگرە نەمردو چاوەڕێی ئێمەی کرد، فریشتەکان هاتبوون لە هەموو لایەکەوە وەستا بوون. ئەو تەسلیم نەدەبوو، ئەو نەدەمردو چاوەڕێی ئێمەی دەکرد تا پێمان بڵێت وێنەکە لە کوێیە.

ناز جەواهێرخان دەیگوت و غەرقی وشەکانی دەبوو، پیاوەکەی لەو دەم و ساتەدا دەیەوێ ناخی خۆی هەڵڕێژێ، شەرەف گەشگەش بۆوە، خوێنەکەی پەڕی بووە دەموچاوی لێی ببووە نەخش. دەیگوت:

– بابڕۆین، هەمووان تێگەیەنە.

بەو قسانەوە گەیشتبۆوە ناو دێ، هەمووان دەورەیان دابوو، هەمووان دوامان کەوتبوون، ئەو زوو زوو دەیگوت:

– پیر خدر تۆش بیرێکی لێ بکەوە، بیهێنە بەرچاوت، سوڵتان دەیڕوانییە نێو کاریزەکە، زۆر قوڵ دەیڕوانی، ئەو وێنەکەی برد بۆ ناو کاریزەکەو هاتبۆوە دەرێ، هەڵبەت، نازانم بە برینداری بردبووی یا لە هاتنە دەرەوەدا، نازانم پێش شاردنەوەی وێنەکە بریندار بووە، یان کاتێک ویستوویەتی لە کاریزی کە بێتە دەرو بە ئێمە بگاتەوە.

ناز جەواهێرخان خێرا خێرا قسەی دەکرد و رستەو وشەی سەیر و تێکەلاوی بەکاردەهێنا.

– من نەمدەزانی لە دوای برۆم یان پێشی کەوم، پیر خدری شالیار جەمەدانەکەی لە بن باڵی قایم کردبوو، پرچە درێژ و نەرم و سپییەکەی بەسەر شان و دەم و چاویدا هاتبووە خوار، ئەو شالیارە پیرە دەموچاوی ئەوەندە سوور و پەمەیی ببوو، وات دەزانی ئێستا نا تاوێکی دیکە ئەو سەرە پیرۆز و جوانەی بە ئێسک و پێست و چاوەوە بەسەر شانیدا وەک خوێن و ئاو دێتەخوار، پرچی باڵییەدا، دەیگوت:

– ڕاست دەکەی شەرەفەدین ڕاستدەکەی. من چاوەکانیم لەبەر چاوە ئەو قسەی دەکرد، دەدواو ئێمە لێی تێنەدەگەیشتین، ڕاست دەکەی شەرەفەدین ئەو بەئاشکرا دەیگوت و دەیویست هاوار کات.

هەموو خەڵکی دێ وایان دەزانی لە خەونێک بە ئاگا هاتوون، هەموو یەکدەنگ دەیانگوت:

– ئێمە چەند بێهۆش و نەزان بووین ئەو پیاوە، مۆڵەتی وەرگرتبوو، مۆڵەتی وەرگرتبوو نەمرێ و بۆ چەند ساتێک بژی، مەلائیکەت و ئیزرائیل هەر لەوێ لە ناو ئاو و پەنا دیواری کارێزەکە وەستابوون تا ئەو پەیامەکەمان بداتێ، ئەوان هەموو دەیانگوت:

– ئای لە بێ چارە و پڕخەتا خۆمان، سوڵتان مۆڵەت لە مردن وەردەگرێ ئێمە تێناگەین، وەک چاومان کوێر بێت و لە چاوی ئەو حاڵی نەبووین.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ دانیشتبوو، لە پەنا ناز جەواهێرخان دانیشتبوو، بەڵام لە ڕواڵەتیدا دیار بوو چەند بە پەلەیە، چەندی پەلەیە وەک ئەوەی لەگەڵ ئاپۆرەی خەڵکەکە بڕوات، وەک ئەوەی دوای شەرەفەدین کەوتبێ، دەیەوێ زوو بگاتە کارێزەکەو شوێنی وێنەکە بدۆزێتەوە.

ناز جەواهێرخان گوتی:

– کە گەیشتین، هەموو ڕوانیمانە شوێنی بەتاڵی سوڵتان، ئەو گوڵە سوڵتانیانەمان بۆ یەکەمجار لەوێ دی، گوڵی سپی، سپی، میلێکی ڕەشیان پێدا هاتبوو، ئێمە هەر هەموو ئەو دوومیلە ڕەشەمان بەچاوە ڕژاوەکانی سوڵتان چواند، ئاخر هەر هەوبوو، چاوەکانی سوڵتان بوو بەو گەڵا سپیانەدا ڕژابوون، تا ناو کارێزەکەش چووین، کەس نەیتوانیوە بگاتە بنی ئەو کارێزە، ئەو کارێزە وەستایەکی موسایی دروستی کردووە، چوار ساڵی تەواو کاری تێداکردبوو، وەستایەکە ناوی شێلە ئۆنان بوو، ئەو وەستایە کۆمەڵێک خەلفەو کرێکاری هەبوون، بەڵام ئەو بەردەستەی یارمەتی دەداو هەمیشە لەگەڵی بوو، کوڕێکی منداڵکار بوو کە تا ئەو کاتەش مابوو، کاتی ون بوونی وێنەکە.

ناوی یارۆی سەید عەزیز بوو، دواتر بە مەلا یارۆ وشکە ناسرا، مەلا یارۆ وشکە لە

هەموو کەس زیاتر شارەزای کارێزەکە بوو، شەرەفەدین لە ناو تاریکی کارێزەکە هاتە دەر و گوتی:

– کوا؟ مەلا یارۆ کوا؟

مەلا یارۆ ئەو ساڵانە کوێر ببوو، ئیدی نابیناو ناتوانا بوو، هێنایان مەلا یارۆیان هێنا تا نهێنی و شوێنە پەنهانەکانی کارێزەکەیان بۆ بگەڕێ، یارۆ پێش ئەوەی بچێتە ناو تاریکییەکە گوتی:

– با تەنها بڕۆم، چەند کەس بچینە ناو ئەم کارێزە تەنها یەکێکمان دەگەڕێتەوە، یەک کەس و بەس.

هەر هەموومان وەستاین، لەبەر دەم کارێزەکە وەستاین، وەک وێنەو پەیکەر و تەختە، بێ دەنگ و جووڵە. کەس بیری لە مانای راستەقینەی قسەکانی یارۆ وشکە نەکردەوە ئەو گوتبووی، (چەند کەس بچنە ناو کارێزەکە، واتا یەک کەس، دە کەس، سەد کەس بچنە ناو کارێزەکە تەنها یەک کەسمان دەگەڕێتەوە، ئەوانی دیکە بۆ هەمیشە لەوێ دەمێننەوە)

مەلا یارۆ وشکە داستانێک بوو بۆ خۆی ئەو زمانی موسایی وەک زمانی دایکی دەزانی، چیرۆکەکەی مەلا یارۆ وشکە، چیرۆکێک نییە لە ناو چیرۆکاندا بگێڕدرێتەوە، ئەو کاتەی وێنەکە دیار نەمابوو، ئەو دەمانەی سوڵتان کوژرابوو، مەلا یارۆ وشکە چاوەکانی لە دەست دابوو، بە تەمەنترین کەسێک بوو گوندەکەمان هەرگیز دیبێتی.

مەلا دڵی خۆی لەگەڵ وەستایەکەی و موساییەکان بۆ ئەبەد بۆ شوێنێکی دوور ناردبوو

شوێنێک تا ئەوکاتە دوورترین شوێنی دنیا بوو. ئەو شوێنە ئیسرائیل بوو، ئەو سەردەمانەی مەلا یارۆ گەنج بوو، هەمیشە لەسەر ئاوی ئەو کارێزە دادەنیشت و دەیگوت:

– رۆیشتن، هەموو شتێکیان لەگەڵ خۆیان برد، تەمەن و شارەزایی و قسەی خۆش و پێکەنین و گوڵە هەنارەکانیان لەگەڵ خۆیان برد.

ئێمە هەموو دەمانزانی گوڵە هەنارەکان مەبەستی لە چییە، بەڵام هەرگیز لە ڕوومان نەداو بێدەنگ گوێمان لێدەگرت، مەلا یارۆ وشکە چەند بەتەمەنتر دەبوو هێندە زیاتر بێدەنگ و گریانەکانیشی درێژتردەبوو. تا چاوەکانیشی لەسەر دانان.

ئەو دووبارە ڕووی لە هەموومان کردەوە گوتی:

– تەنها یەک کەس بەتەنێ دەتوانێ لەو کارێزە بێتەوە دەرێ.

ئەو چووە ژووری، بە دوو چاوی نابیناوە، ڕۆیشتە قووڵایی کارێزەکە، دەیڕوانییە چواردەوری وەک سەد چاوی هەبێ، پێش ئەوەی لە چاو ون بێت شەرەفەدین بە بازێک لە ئێمە خۆی جیا کردەوەو دوای کەوت، من ویستم لاقی بگرم و خۆم بۆ فڕێ دا، ژنەکان لە دواوە هەموو منیان گرت و ئەو ڕۆیشت. کەوتم و هیچم نەدیت، گوتم تازە شەرەفەدین نابینمەوە، چنگم لە قوڕو گڵی شوێن پێکانی شەرەفەدین ڕاکردبوو، دەمویست هاوارکەم، هاوارێکی بێ بن و قووڵ، ترسام کارێزەکە بڕووخێ، بێدەنگ قوڕ و گڵەکەم لە دەمم نزیک کردەوەو نازانم ویستم ماچی کەم، بیخۆم یان نەعلەتی لێ کەم، چاوم لێک ناو ئاگام لە هیچ نەما.

کاکۆ نەیدەزانی ئەو وێنەیەی لە کوێ دیتوە ژنێک چنگە قوڕێکی بەدەستەوەیەو بۆ زاری بردووەو لە هۆش خۆی چووە، ناز جەواهێرخان دەکرێ ئەو ژنە بێت، دەموچاوی ئەو ئافرەتە بۆ ئەوە دەبێت جوانترین ڕۆڵ لە گرنگترین فیلمی هۆلیود ببینێ. جا ئەوتا خۆ فیلمی گوندەکەی ئەوان لەوانەی هۆلیود پڕ کارەستتر و مەزنترن.

کاکۆ پەلەی بوو بزانێ چۆن لە ئەشکەوتەکە هاتنە دەرێ، ئەو وێنەیە بە ڕاست لە ئەشکەوتەکەدا بووە؟ کاکۆ دەیویست مەلا یارۆ وشکە ببینێ، ئەو مەلا نابینایەی بە دنیا شارەزایە، ئەو مەلایەی نهێنی ئەشکەوتی هەزار دەریا دەزانێ، ئەو دەیویست بزانێ ئەو مەلایە چۆن بیر لە دوورترین وڵاتی دنیا دەکاتەوە، هاوڕێکانی چۆن جێهێشتووە، تەنها جارێک وشەی گوڵ هەنار لە دەمی ئەوەوە ببیستێ ئیدی بەسە بۆ ئەو. هەروا لە پڕ گوتی:

– خاتوونی ئازیز، ناز جەواهێرخان ئەو کارێزە بۆ پێیان دەگوت هەزار دەریا؟ کەواتە

موسابییەک ئەو کارێزەی لێداوە.

ناز جەواهێرخان، هەستی کردبوو بای بەهەشت، واتە سیحربانوو لەودیو دەرگاکەوە چاوەڕێ دەکات، بەڵام نەیدەویست قسەکانی ببڕێ و ئەو کچەش تا بزانێ کاکۆ بە ئاگایە و دەنگی دێت نایەتە ژووریٚ، هەر لەسەر عادەتی خۆی دەڵێ:

– ئەو کارێزە زۆر کونە، هەزار دەریا بە تەمەنی ئێمە نییە، لەو دێیەش کۆنترە، ئەو پیاوە موساییە، شێلە ئۆنان کارێزەکەی لێداوەوە دیوار بەندەکانی دورست کردووە، ئەو پیاوە گوتییەتی:

– دەتوانی چەند رۆژ بە ناو ئەو کارێزەدا سەفەرکەی، شەو جێگای نووستنت دەبێت، ئەگەر هەر بڕۆی دەگەیە وڵاتێک لەو ژێر زەمینە، سەد هێندەی ئێرە فراوانە، من تەنها پێشەکەیم کردۆتەوە.

حیکایەتی ئەو پیاوە لەسەر مەخلووقەکانی ناو پیرە کارێزە، سەیرترین و پڕ نهێنیترین حیکایەتەکانی دنیان و نەبڕاوەشن. ناز جەواهێرخان دەڵێت:

– تا ئێستا ئەو پیاوە حیکایەتێکی نەگێڕاوەتەوە کۆتایی هاتبێ.

کاکۆ جگە لە وێنەکە دوو شتی لە دڵدا دەمێنێ، دەیەوێ دوای دوو شت کەوێ، یەکەمیان چوونە سەر کارێزی هەزار دەریا و دووەمیان دیتنی مەلا یارۆ وشکەیە، ئەو دەیزانی ئەو بۆ ئەوە خەلق بووە نهێنییەکان کەڵەکە کات. ناز جەواهێرخان دەڵێت:

– من لە هۆش خۆم چوو بووم، بەهەردوو دەستان قوڕ و گڵی بن پێی شەرەفەدینم هەڵگرتبوو، کەوتبووم و تۆ بڵێ مردبووم. لە کاتی مردنی من، لەو یەکەم رووح دەرچوونەم، دنیا وەک یەکەم رۆژی دروستبوونی لێهاتبۆوە، نەک یەکەم رۆژ دنیا وەک چرکەیەک پێش رۆنانی لێهاتبۆوە، دواتر شەرەفەدین گوتبووی:

– باش بوو مردبووی زۆر باش بوو لەو کاتەدا رۆحت دەرچوو بوو، تۆ تەنها بەبێ رۆح بەرگەی ئەو چرکەیەت دەگرت، کاکۆ خەریکە دەترسێ لەو هەموو حیکایەتانە دەترسێ لە دەمی ژنێکەوە کە جارێک مردووە، مردووە و رۆحی دەرچووە، ئەو حیکایەتانە هی کەنگێن، هی سەردەمی مردنەکەیەتی، هەموویان ئەو کاتانەیان دیوە کە

مردووە، باشە دیتنی مردوویەک چۆنە؟ ئەریٚ ئەوە تەنها لە عەقڵی زیندوویییەکدا مردوو بیٚ جووڵەو هەستە، نا، دەشیٚ حیکایەتی مردوویەک سەیر و سەمەرەتر بیٚت.

نازجەواهیٚرخان کە چاوەڕیٚ بوو بای بەهەشت بیٚتە ژوور، چاوەڕیٚ بوو سیحر بانوو چیدی نەتوانیٚ لەو دیو دەرگا بیٚت و بیٚتە ژووریٚ، لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

– دەبا بیٚت ئەو کوڕە بیٚگیان و ماندووە زیندوو بیٚتەوە.

– دەبا بیٚت و بزانیٚ لە ماڵی مندا بای بەهەشت هەیە.

– دەبا بزانیٚ من لەو ڕۆح دەرچوونەدا چیم لەگەڵ خۆم هیٚناوەتەوە.

– دەبا بزانیٚ لەو بیٚهۆشییەمدا گیانم چ سیحریٚکی لە خودا کردووە و چی لەو دنیا هیٚناوەتەوە.

– دەبا سەد هیٚندە شەرەفەدین حەیران و سەرسام بیٚت.

– با ئەویش دڵۆپە خویٚنیٚک بپەڕیٚتە سەر کوڵمی.

– دەبا بزانیٚ لەو دییە لاچەپەکەی ئیٚمە خودا لە شیٚوەی چیدا دەگەڕیٚ.

– با بزانیٚ کام مەلائیکەتە لەو بیٚ ڕۆحییەمدا هاتۆتە سکی منەوە.

– بابزانیٚ ئەو فریشتانەش بە من ڕازی دەبەن و لە ڕەحمی مندا خۆیان دەشارنەوە.

– ئاخر من بە چ بزانم ئەویش، ئەو کوڕە پەژموردە و میوانە، هەر لەویٚ نەهاتووە.

بەڵام بای بە هەشت نەهاتە ژووریٚ، لەو دیو دەرگا چاوەڕیٚ ما.

کاکۆ دەیزانی ژوورەکەیان پڕپڕە لە چاوەڕوانی، سیخناخە لە نهیٚنی، ئەو دەیزانی هەر ئەو نەگۆڕاوە، ئەو ژنە، ئەو ژنە بیٚ نیاز و سادە نییە کە نانی بۆ دیٚنان و لەودیو سەماوەرەوە نیگای دەکردن، ئەو ژنە یەک پارچە ڕەنگە و بۆن میٚخەک نییە، نا ئەو ژنە ئەو ڕووناکییەیە کە جاریٚ شیتەڵ نەبۆتەوە سەر ڕەنگەکانی خۆی، بۆ یەکەم جار وەک خوشک و خەمخۆریٚک دەستەکانی کاکۆی گرت و گوتی:

– ئاوا، من هەر ئاوا قوڕ و گڵی بن پیٚی شەرەفەدینم توند گرتبوو بەدەستەوە و بۆ دەمم دەبرد، بەڵام لەو دنیایەدا نەمابووم، نازانم لە کویٚ بووم و لە چ دنیایەک بووم، چەند تیٚپەڕی و چەند فڕیم و نووستم و مردم، نازانم. کە چاوم کردەوە هەر لەویٚ چنگە

خۆڵەکەم بەدەممەوە نابوو، پیر خدری شالیار سەرمی خستبوو سەر رانی خۆی، پرچە درێژ و سپی و بڵاوەکەی رژابووە سەر رووم، هەرکە چاوم هەڵئێنا دەیان چاوی هەڵۆ و باز و کەوی ژن و کچانی گوندەکەم تەماشایان دەکردم و دەمیان کردبۆوە، هەر لەو کاتەدا شەرەفەدین، شەرەفەدینی چاو بەخوێن لە کارێزی هەزار دەریا هاتە دەرێ و قژ و ریشی درێژ درێژ ببوو، وێنەکەی حەزرەتی سەید حوسێنی جیهانگیری بە هەردوو دەستی و لەسەر سینگی گرتبوو، توندی گرتبوو، هەموو بەرەو ئەو سووڕان و منیان لە بیرچۆوە، ویستم هەستم و ئەمبازی بم، من زانیم ئەو لە شوێنێک گەڕاوەتەوە جێگای خۆی بوو، جێگای حەقی وێنەکەو حیکایەتەکانی بوو.

پێش ئەوەی کاکۆ بپرسێ چۆن دەتزانی، تۆ لە مردنتدا چۆن ئەوەت بۆ دەرکەوت، پێش ئەوەی بپرسێ تۆ لەو رووح دەرچوونەتدا چیان پێگوتی ناز جەواهێرخان گوتی:

– لە روویدا، لە چاو و پێستی شەرەفەدیندا دیار بوو، هاواری دەکرد تەنها یەک تۆزی دیکە دوا کەوتبا هێزی گەڕانەوە و ژیانی بۆ و دنیایە نەدەبوو. دەبووە چڵە گیایەک لەوانەی پێیان دەڵێن ریشە پێغەمبەرە و تەواوی بن میچی ئەشکەوتەکەی داگرتووە، وێنەکە ئەوەندە نەبوو بۆ خۆی نەڕوا، وێنەکە هێزێکی هاتبۆوە بەر، من دیتم نازانم ئەوانی دیکە. چاوی دەگێڕاو نیگای دەکرد. شەرەفەدین هات، هات و دەستی بۆ لای من درێژ کرد، دەستە قوڕاوییەکانی گرتم و راستی کردمەوە، پێشتر زۆرم هەوڵدا هەستم، زۆرم هەوڵدا بجووڵێم و لێی بچمە پێش، وەک بە ئەرزەکەوە داکوترابم نەمتوانی، من نەمتوانی لاق و سینگی خۆم لە ئەرزەکە کەمەوە، شەرەفەدین دەستی گرتم و بڵندی کردم وەک کەسێک، وەک خودی خۆم لەسەر ئەژنۆ و کۆشی پیر خدر و زەوییەکە جێ هێڵم هەستام، چاوم هەستابوو دیتنم مابوو، پێیەکانم هەستابوون، رۆیشتنم مابوو، جەستەم هەستابوو گەرم و گۆڕیم مابوو، وەک ئەوەی کەسێک هەستێ کە من نیم، تەواو وەک ئەوەی کەسێک بمێنێتەوە کە من نیم، تۆ من مەبینە من لە نێوان هەردووکیاندا ون بووم. ئەوان هەر دوو کیان ژیان و من مردم.

کاکۆ بۆی دەرکەوت کە سوڵتانی جیهانگیر وێنەکەی لە شوێنێکی نهێنی کارێزی

هەزار دەریادا شاردۆتەوە، بۆی دەرکەوت هەوەڵ جار سوڵتان دەگەڕێتەوە سەر ئەو ئەسپە بریندارەی لە ناوەندی گوند کەوتووە و وێنەکەی لەسەر بارکراوە. ئەسپەکەی بۆ هەڵناستێتەوەو وێنەکەی سەید حوسێن لە بارەکە دەردێنێ و دەترسێ نەک ئەو چەکدارانەی دەوری گوندەکەیان گرتووە بیگرن و بیکوژن و وێنەکەش بەرن و لە دەستیان بچێ، پەنا بۆ کارێزی هەزار دەریا دەبات و لەوێ دەیشارێتەوە، لەو نێوانەدا بۆ خۆشی بریندار دەبێت و هەر لە لای کارێزەکە دەمێنێتەوە

دوای ئەوەی دەزانێ چەکدارەکان گوندەکەیان چۆلکردووە و ئەویش هەر وەک شەرەفەدین دەڵێ:

– مۆڵەت لە مردن وەردەگرێ تا کەسێکیان بێت و شوێنی وێنەکەیان پێبڵێ.

بەڵام مردن زەفەری پێ بردووە و گیانی کێشاوە، تەنها ئەو چاکەیەی لەگەڵ دەکات چاوەکانی ناسڕێتەوە و ڕێگا دەدات هێمایەکیان بۆ بکات و بە دوو چاوی زیندوو تێیان بگەیەنێ کە وێنەکە لە کارێزەکەدایە و ئەوەندەش بۆ سوڵتان بەسە تا پەیمانی خۆی بەرێتە سەرو ڕۆحی بە ئارامی تەسلیم کات.

ئەوەش حیکایەتی ئەو مردنانەیە، ئەوەش حیکایەتی مردنی ئەو کەسانەیە کە هەمیشە پێیەکیان لە ژیاندایەو پێیەکیان لە مردندا، پێیەکیان لە ئاگردایەو پێیەکیان لە ئاودا، دەستێکیان ڕۆژە و دەستێکیان شەو، چاوێکیان لێرەو یەکیان لەو دنیا. حیکایەتی مردنی ئەو کەسانە تەنها سەفەرێکە، سەفەرێک بنووسرێتەوە، باس بکرێ و بکرێتە گۆرانی بێ ئەوەی نهێنییەکەی کەشف بکرێ، یان تاکە ڕۆژێکی ئەو دنیایە خەسارکات، بێ ئەوەی کاکڵەکەی بشکێ و شەکرەکەی بتوێتەوە.

من ویستم لەو دیو کاکۆوە، لەو دیو ناز جەواهێرخان و پیر خدر و شەرەفەدینەوە هەموو نهێنییەکانی کەشف کەم، یان ئەوەی ناکرێ بگوترێ بیبیستم، لە قووڵایی ناخیان بەرد و مرواری و قوڕ و چڵپاو دەرهێنم و تۆزی ناخیشیان بخەمە سەر کاغەز و ناو گۆرانی، دەمگوت ئەوەتا کراونەوەو ئەو کەسە پڕ نهێنی و وشک و یەکڕەنگانەی جاران نەمان کە دیمن، ئێستا دەڵێن و دەڵێن، بەڵام نەمن و نە کاکۆ نەمانتوانی تۆزقاڵێک لەو

نهێنییە شارەزا بین. دێیەک راودەنرێت و ئەوانیش کۆچ دەکەن، ئەسپێک بەجێ دەمێنێ و بریندار دەبێت. وێنەیەک کە سامانی لە بەها نەهاتووی گوندەکەیە لەسەر پشتییەتی. هەموو ئامادەن بگەڕێنەوە سەری و ئەو وێنەیە بێنن، ژنێک کە دەکرێ ناوی کانی بیابان بێت نەک ناز جەواهێرخان، ژنێک کە دەکرێ ناوی ئاوی بە هەشت و رۆحی فریشتە و بۆنی سەر زەوی بێت ئامادەیە هەر بە راکردن بێت و وێنەکە لە ئەسپەکە بکاتەوەو ئەو گوللانەش نەبینێ تێیدەگرن و جەستەی دەبڕن. رێگای نادەن و سوڵتان جیهانگیر دێت و وێنەکە لە ناو دوژمن دەباتەوەو لە شوێنێک کە هەزار دەریایە دەیشارێتەوەو گیانی ئەو پیاوەش دەبێتە گوڵێکی سپی میل رەش. خوێن دەپەڕێتە سەر کوڵمی براکەی و ناوی دەبێتە شەرەفەدین چاو بەخوێن، هەر کەس بڕواتە ئەو دێیە ئێستا ئەوانە هەموو دەبێنێ و رێبوارێک نییە بچێتە ئەو دێیەو گوڵێکی سوڵتانی لە سینگی نەدەن. یان کەسەری ئەو گوڵەی بۆ ئەبەد بە خوێندا هەڵنەواسن، کەچی نابێ ئەو گوڵە یەک بست لەو دێیە دوورخاتەوە.

کاکۆش هەموو ئەوانەی زانیبوو، ئەوەشی زانیبوو هەر ئەو رۆژە گوڵێک لەو گوڵە سوڵتانیانە پەڕیبووە ناو وێنەکەو لەلای چەپی وێنەکە لە خواری خوارەوە گوڵێکی ئاوا، گەڵا سپی بە خەتی میل میلەوە کەوتبوو سەر، تەنها ئەوەندە نەبێ کە ئەو گوڵە تنۆکێکی سوور، لەو خوێنەی پەڕیوەتە سەری روومەتی شەرەفەدین کەوتۆتە سەر گەڵا سپییەکەی. تنۆکێک هەر هێندەی دەنگە نیسکێک.

کاکۆ وەک ئەوەی نەخۆش نەبووبێ، وەک ئەوەی بەشێک بێت لەو حیکایەتانەو بیەوێ هەروەک بەشی ئەو مردنانە، یا ئەو سەفەرانە ببینێ. هەڵدەستێ و خۆی پۆشتە دەکاتەوەو هەست دەکات بای بەهەشت، سیحربانوو لە دەرگایەکە دوور دەکەوێتەوە، داوا لە ناز جەواهێرخان دەکات کە تا ئەو کاتە شیلەی گێڕانەوەکانی بەسەر لێوەوە بوو. دەڵێ:

– لە شتێک گەیشتم، بۆ ئەوەی هەموو حیکایەتەکان وەک خۆی ببینم، رێگای کارێزی هەزار دەریام نیشان دەدەی؟

ناز جەواهێرخان وەک کەیبانووی ماڵ، وەک ژنێکی بێ دەسەلات و بێ ئەزموون و تاساو:

– کارێزی هەزار دەریا؟

کاکۆ زۆر بە سادەیی دەڵێت:

–بەڵێ هەزار دەریا، مەگەر ئاوی ئێرە لەوێوە نایەت؟

ناز جەواهێرخان پشتی لەو کرد و لە دەلاقە بچووکەکەوە بۆ دەرێی روانی و گوتی:

– ئەو هەزار دەریایە تەنها لە حیکایەتدا هەیە. بۆ دەبێ ئاوی ئەو هەموو ئینسانە زیندووانەی گوندەکەی ئێمە لە حیکایەتەوە بێت. تۆ دەبوو گوێ بگری، تا حیکایەتەکە تەواو دەکەم، ئەو کاتە ئەو پرسیارەت نەدەکرد. حیکایەت ژیان نییە لە کوێڕا پچڕا لەوێ دەست پێکەیەوە، حیکایەت ژیان نییە لە هەموو فەزایەکدا بژی، حیکایەت لەگەڵ یەکەم پچڕانیدا دەشکێ و لە شوێن خۆی یەک ناگرێتەوە.

کاکۆ لە قوولایی خۆیدا بەدەنگ دێت:

– من هیچ نیم جگە لە دوو گوێ، دوو گوێ و بەس. گوێ دەگرم دەچمە ناو شعوری تۆوە، گوێ دەگرم و دەچمە ناو کارێزەکەوە. گوێ دەگرم و لە ناو گوندەکەتاندا دەسووتێم، لەگەڵ ئەسپێکی بریندار بەجێ دەمێنم، گوێدەگرم و بە دووچاوی پڕ پرسیارەوە لەبەردەم ئەشکەوتەکە مۆڵەت لە مردن وەردەگرم و بە بایەکی بەهەشت هەر لە ناو حیکایەتەکانی تۆدا زیندوو دەبمەوە، زیندوویەک لە مردن تێر بووبێ.

ناز جەواهێرخان دێتەوە لای کاکۆ و دەڵێ:

–پەلە مەکە، حیکایەت لای گوێگر ناشکێ، حیکایەت تەنها لە دەستی ئەوانەدا دەشکێ دەچنە ناوی، ئەو کەسانەی بە درێژایی تەمەنی حیکایەتەکان لە ساڵ و مانگ و شوێنی جیاوازەوە دەیانەوێ بچنە ناو حیکایەتەکان، یان دەچنە ناوی و تێیدا دەژین و دەبنە هاونیشتیمانی ئەو حیکایەتانە. هاوسۆز و هاو ژیانیان زۆر کەمن، کەمن بە بەراورد و لەگەڵ گوێگرەکانی حیکایەت، حیکایەت چاوەڕێی گوێگرەکانی دەکات، بەلام ئەو کەسانە لە شوێن و دنیای جیاواز چاوەڕێی حیکایەت دەکەن، هەر ئەوانیش حیکایەت لە دەستیاندا دەشکێ.

## ژن

کاکۆ خۆی بە نامورادترین ئینسانی دنیا هاتە بەرچاو، لە زیندانەکانی حیکایەت و ئەفسانەکانی دایک و باوکی ڕادەکات و تووشی ئەفسوونی کارۆلین دەبێت، لەو ڕادەکات و دەگەڕێتەوە رۆژانی هێوژین و سیحرەکانی گیای هۆستاش، لەو دوور دەکەوێتەوەو ماڵەکەی ئۆرانۆس رایدەکێشێ، تووشی قەشە جۆلیۆس دەبێت و بە باڵی باڵندەی تۆسدا هەڵدەواسرێ، باڵندەیەک دەیخاتە جێگای خۆی لە حیکایەتێکدا و راوچییەک سەدان نەخشە دادەنێ بۆ کوشتنی، دەست لەوانە لە هەر هەمووان بەردەدات و لەو رۆژهەڵاتە کە تاقە کەسێکی روو بەروو لێناناسێ، ئەشکەوتی هەزار دەریا و، گوڵە سوڵتان و ناز جەواهێرخان و وێنەیەکی جێمس پۆڵ بڕاون دەیبەن و تا دوا پلەی مردن دەیبەن و بای بەهەشتیشی لێدەشارنەوە.

کاکۆ لە ناخی خۆیدا هێندەی هەزار دەریا دەگریاو خەریکە لەو دەریایانەدا هەناسەی لێ بەجێ بمێنێ، باشە ئەو دەست و پێ باریکانەی ئەو، ئەو هەناسە نیوە چڵانەی ئەو بۆ و هەموو ژیانە سەیر و سەمەرەیە دەبن، با ئەوانە هەموویان لەلایەک بن و ئەو سەفەرە تەنها سیحرانەی لەگەڵ سەید حوسێن جیهانگیر کردی سەر بەکام بەش و ئەفسانەی چ دینێک بوو. خودایە ئەو پیاوە بۆ کوێی بردبوو بۆ ئەشکەوتی هەزار دەریا، خۆزگە لای

ئاسینگەرەکە مابایەوە، خۆزگە سوڵتانی رەنگەکان ئەوی لە دەستی خۆیدا کوشیبا و بۆ هەرگیز نەهاتبایەوە ناو ئەو ژوورە،کە وەک هەموو ژوورەکانی دنیا تەمەن قڕکەرە.

کاکۆ ئەو کاتە وەک جادوویەک تەماشای ناز جەواهێرخانی دەکرد، لەوپەڕی پاڕانەوەدا دەڵێت:

– من دەمەوێ تەنها یەک دەریا ببینم، شوێنی سوڵتان، ئەو شوێنەی ئیزرایل و فریشتەکانی چاوەڕێیان دەکرد، تۆ بمبە، من بێدەنگ و هەست وەک پشیلەیەک لە دواتەوە دەڕۆم، تەنها گوێ دەگرم.

ناز جەواهێرخان دەبینێ چ کارەساتێکە، خۆ ئەوە میوانە شەرمن و بێدەنگ و غەریبەکەی دوێنێ نییە، ئەو کەسێکە قسە دەکات و داواکاری هەیە، کەسێکە دەپرسێ و لەگەڵ هەموو رۆحەکان تێکەڵە.

پێی دەڵێت:

– تۆ نهێنی خۆت ناڵێی و هەموو نهێنییەکانی ئێمەش دەبەی، بەوە رازی نابیت تەنها رەنگ و بۆن و ناوەکانی ماڵەکەم بەری و نهێنی پەڵە سوورەکانی کوڵمی مێردەکەم بزانی و ژیانی وێنەکانمان بهەژێنی و دەتەوێ بای بەهەشت ببینی، بچیتە ئەشکەوتی هەزار دەریا رۆحی نەتەوەیەک راچڵەکێنی. من وامدەزانی تۆ ناکامڵ و سادە و بێگەردی، دەبوو لە باوەشی دایکت و دوور نەکەوتبایەوە،......

ناز جەواهێرخان تۆزێک دەوەستێ و سەیری چاوی فراوان و پەژموردەو رەنگی پەڕیوو لێوی لەرزیوی کاکۆ دەکات و هێواشتر دەڵێ:

– لەگەڵ ئەوانەشدا من هەوڵ دەدەم نەگەڕێیەوە ناو حیکایەتەکان و هەر گوێگریان بیت.

کاکۆ دەیەوێ هەستێ و خەریکە بکەوێ، ناز جەواهێرخان بەخۆی و کۆڵێک لە بۆنی مێخەکەوە دەستی دەگرێت و دەستە ساردەکانی کاکۆ ناز جەواهێر رادەچڵەکێنن و چاوی مۆڵەق دەبێ، لە دڵی خۆیدا دەڵێت «ئێرە زەمهەریرە»

کاکۆ دەڵێ:

– من هیچ نهێنییەکم نییە، من ناوم کاکۆ ژەنیاری موراد بەگە، بابم کوردە خەڵکی ئەو وڵاتەی ئێوەیە، کڵاو و تەسبیح و سەبیلەیەکی باپیری هێناوە بۆ ئەوروپا و بە چەند موورووە شینکێکی دایکی دەژی. دایکی من ئافرەتێکی ئەرمەنییەو لەوەتەی هەیە وڵاتی خۆی نەدیوە کەچی ناوی گیاو پەلە بەرد و توولە ڕێگاکانی دەزانێ و ناوی گوند و گەڕەکی وڵاتە نەبووەکەی دەزانێ و ژیانی چەندان پشتی خۆی لەبەرەو باپیری و نەنکی و دایکی نەنکی و پوورەکانی و مامەکانی و کوڕ و کوڕەزایان دەناسێ و جگە لە چەند کەسێکی کەمیان کەسیانی نەدیوەو سندووقێکی تەختەی پزیشکی باپیر و هەندێ تورەکەو ملوانکەی دایکی و دەفتەرێکی ئینسان کوژ و کۆمەڵێک حیکایەتی پڕ دەردە سەری و هەندێ نوکتەی پڕ گریانی هەیە و هیچی دیکە.

من ویستم وەک ئادەمیزادێک بژیم و خەریکی هەناسەو گەورەبوونی خۆم بم و عەقڵێکی ئەوروپاییم هەبێ و هەموو دنیا بمرێ بڵێم کێشەی خۆتانە و دەست لە کێک خواردنی خۆم هەڵنەگرم.

بەڵام ئەو باب و داکە چارەڕەشەی من ژیانیان هەنجن هەنجن کردم و هیچیان وەک خۆی پێ نەناساندم و ڕستەیەکی ژیانی خۆیان پێ نەگوتم و تا ئەو ڕاستیانەم بۆ خۆم کەشفکرد و زانیمن هەپروون بە هەپروون بووم. من هیچی نهێنیم نییە، هەر هیچ، بەڵام دەوروبەرم پڕ پڕ لە لوغمی نهێنی و هەر لە ماڵی خۆمان و سەردەمی منداڵیم و تا ئەو پیاوەی وێنەکەی سەید حوسێنی جیهانگیری گرتووە وەک تەونی جاڵجاڵۆکە بۆ منی مێشی ناوەتەوە، واتە جیمس پۆڵ براون. تا دەگاتە ئەو ژوورە پڕ ڕەنگ و سیحرەی تۆ، تا دەگاتە ئەو سیحربانووەی بای بەهەشت لەگەڵ ئەو هەڵ دەکات و کەس نازانێ ئەوە چ بۆنێکە لە هەوای دەکات و لە و دیو دیوارەکەوە دەمبینێت و من ناکرێ بیبینم، تا دەگاتە ئەو کارێزەی پیشانمی نادەن.

دە ئێستا پێم بڵێ، یارۆی سەید عەزیز یان مەلا یارۆ وشکە توانای قسەکردنی ماوە؟

دەکرێ بیدوێنم ؟ یان شتێکی بەسەر هاتووە؟ یەک قسەی ئەوم بەسە.

نازجەواهێرخان دەڕوانێتە نێو چاوەکانی کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ و ترسێک لە چاویدا دەبینێ، بە پێچەوانەی چاوەڕوانی کاکۆوە، زۆر نەرم و هێمن دەڵێت:

– تەنها گوێ بۆ حیکایەتەکانی دنیا بگرەو تێپەڕە، من لەوە سادەترم ئامۆژگاریت بکەم. لە حیکایەتەکاندا مەژی، حیکایەتەکان بۆ ئەوە نین تیایاندا بژیت، ژمارەی ئەو کەسانەی لەو حیکایەتانەدا نیشتەجێن زیاد و کەم ناکات. هاوار بۆ ئەو کەسەی دەچێتە حیکایەتێکەوە تێیدا لە دایک نەبوو. ئیدی ناتوانی زنجیرە شاخێک بۆ شاخەکانی دنیا زیادکەی، ناتوانی بستێک زەوی دیکە بخەیتە سەر زەوی دنیا و پارچەیەکی دیکە بۆ ئاسمان قەرزکەی، ئەو حیکایەتانە بە ئەندازەو پێوانە دەژین و دەگێڕدرێنەوە. تۆش تەنها گوێیان بۆ بگرە، مەچۆ ناویانەوە، کەسێک ناتوانێ مەلا یارۆ وشکە لەو داستانە دەرکێشێ، ئەو لە هەڵنان و لێدانی ئەو کارێزە بەشدار بووە، هەر لەوێشدا بۆ ئەبەد دەژی، ئەو مەلا یارۆ وشکەیە، تەنها یەک تاقە قسەی بۆ ئێمە بەجێهێشت ئەویش لە دوا چرکەدا بوو کە گوتی،

«هەر چەند کەس بچنە ناو ئەو کارێزە تەنها یەکێکتان دێنەدەر»

ئەو مەبەستی دیار بوو، دەیویست شەرەفەدینی مێردم لەگەڵی نەچێت، ئەو شارەزاو کارامە بوو، دەیزانی ئەگەر سەد کەس بچێنە ناو ئەو کارێزە تەنها یەک کەسیان دێتە دەرێ، مەلا یارۆ کوێر بوو، بەڵام کارێزێکی ئاوای لە ناوبینایی خۆی هەڵکەند بوو، ئەو هەموو تاق و پلیکانە و کوێرە رێیەکانی ناو ئەو کارێزەی دەناسی، ئێمە تەنها لەوە نەگەیشتین، کە بۆچی شەرەفەدین کە تا ئەوپەڕی پەژموردە و غەمگین و بێدەسەڵات بوو ئەو رۆژە لە کارێزەکە هاتە دەر و مەلا یارۆ وشکە لەگەڵ ئەو هەموو تواناو شارەزاییەی نەهاتەوە دەرێ و بە قووڵایی کارێزەکەدا چوو.

مەلا یارۆ تەنها شوێنی وێنەکە بۆ شەرەفەدین دەدۆزێتەوەو دیار نامێنێ، نازانم شەرەفەدین کە وێنەکە دەدۆزێتەوە پەلە دەکات و بە پڕتاو بۆ دەرەوە غار دەدات، کاتێک هەمووومان هێمن بووینەوەو من چاوم هەڵێناو چنگە بەرد و قوڕەکەیان لە دەست دەرهێنام، دواتر زۆر دواتر شەرەفەدین لە وەختی گێڕانەوەی دیمەنەکانی ناو کارێزەکە

کاتێک گوتی:

«مەلا یارۆ لە پێشەوە بوو، مەلا یارۆ هێواش هەنگاوی دەناو پێی دەگوتم تاشوێن پێیەکت نەکەیەوە پێیەکەی دیکە بڵند مەکە، ئەو دەیگوت دوازدە هەنگاو بەلای چەپداو چوار هەنگاو راست برۆ پێنجەم هەنگاو بەلای راستدا برۆ، جارێک و راست سی و یەک هەنگاو بژمێرەو بوەستە، لە راستی خۆت تۆزێک نەوی بەو شوێن پێیەکانت خاوێن کەوەو هەشت پلیکانە برۆ سەرێ، یەکەم تاقی ئەو کارێزە لەوێیە، بەلای چەپدا دەست بەرە تاقێکی گەورەیەو ئەگەر لەوێ نەبوو پێم بڵێ ئەگەرنا چوار هەنگاو بگەڕێوە، بەڵام من لەوتاقەدا وێنەکەم دۆزییەوە هەر وەک چۆن مەلا یارۆ گوتبووی.

هەمووومان بۆ زالکی کارێزەکەمان روانی، بۆ ناو تاریکییەکە، بۆ ناو خەڵکەکە مەلا یارۆ نە دەنگی و نە رەنگی، تاماوەیەکی دووریش کەسوکارەکەی دەچوون و دەیانڕوانییە قووڵایی کارێزەکە و دەیانگوت:

– بریسکەی چاوی دیارە و بۆنی توتنەکەی دەناسینەوە با دەیهێنێ هەر دەگەڕێتەو.

هەر هەمووومان دواقسەی ئەومان لە بیر خۆمان بردبۆوە، مەلا یارۆ گوڵێکی لە دوا بەجێ نەماو وێنەی نەچووە سەر دیواری ماڵان و تەنها هەر کەس خەڵکی ئەو گوندە بێت و هەر کاتێک بە قووڵایی تاریکیدا بڕوانێ لە دوور زۆر لە دوور بریسکەی چاوی مەلا یارۆ دەبینیت و ئەگەر خۆی لێ رزگار نەکات و دوای کەوێت هەرگیز پێی ناگات و ناشتوانێ بگەڕێتەوە. هەموو بریسکەیەک لە تاریکیدا بریسکەی چاوی مەلا یارۆیە.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ دیسانەوە لە خۆی کەوتە گومان، دەبێ ئەو جەستەو بینینەی ئەو پێی دەژیت هەر خەیاڵ و تراویلکەیەک نەبێ! دەبێ ئەو بوونەوەرێکی راستەقینە بێت! دەبێ ئەو خەون بێت! یان دنیا، بۆچی هەموو شتەکانی دەوروبەری، هەموو ئەو ئینسان و وێنەو شوێنانەی ئەو دوایان دەکەوێ، ون دەبن و نابینرێنەوە. کوا ئۆرانۆس؟ کێ ئەو مۆسیقا ژەنە غەمبار و داهێنەر و بریندارەی دیوە؟ کوا قەشە جۆلیۆس؟ ئەو کچە دوای سەد و پێنج ساڵ خۆی پشانی ئەو دەدات، لە هەموو ئەفسانەی جێمس پۆڵ براون تەنها کامێراکەی و چەند وێنەیەکی دیوە، لەو باخە ئەزەلییەی عاشقانی ئۆرانۆس تەنها

و تەنها باغەوانێک پەیکەرو گەڵاو بەردی تاشراوی پیشان دەدات و تا قووڵترین شوێنی دنیا، دەیبا. بێ ئەوەی هەتا ئامێرە دەنگ سازەکەی ئۆرانۆسیش ببینێ.

لێرەش ژنێک هەموو شتەکانی بۆ دەگێڕێتەوە، ژنێک بە حیکمەتی باغەوانێکەوە هەموو شتەکانی بۆ دەگێڕێتەوە، بەبێ ئەوەی مەلا یارۆ وشکە یان کارێزی هەزار دەریای نیشان دا. لەگەڵ سەید حوسێنی جیهانگیر دەڕوات و ئاسنگەری پڕ حیکمەت و کارساز کەلەپچەکانی دەستی بەندەکان دەشکێنێ بێ ئەوەی بەندییەکان کەم کەن تەنها کۆی ئەو تەوق و کەلەپچانە زیاد دەکات کە دەیانخاتە سەر یەک و کەڵەکەدەبن، دەیان ریزی ئینسان و تاقی شاراوەو فوارەو بەردی سپی و سۆفی ریش درێژ دەبینێ بێ ئەوەی تاقە یەکێکیان لەگەڵی بێت و تاقە یەکێکیان ببینێتەوە.

کاکۆ لە خۆی ناگات ئەو بای بەهەشتە چییە چۆتە هەناوییەوە، بە کوێدا رێگای سەختی ژیان و رۆحی ئەوی دۆزییەوە، کوا ئەو ئێستا ئەوی دیوە، سیحربانوو لەودیو ژوورەکە هەمیشە لەگەڕدایە و ئەو وادەزانێ بەوپەڕی نەرمی و بە پێخواسی بەسەر رۆحی ئەو دادەگەڕێ، شوێنی پەنجە ورد و باریک و تۆزێک گۆشتنەکانی لەسەر لیتاوی رۆحی جێدەهێڵێ.

ئەو سیحربانووە بە نیازی چی ئەو گەشتە هێواش و بێئاگایانە بە رۆحی غەمگین و تەزیوی ئەودا دەکات، تەزیو لە جیاتی هەموو بەشەرییەت، کاکۆ دەزانێ ئەو لە جیاتی برین و رۆحکێشان، ناهومێدی هەموو دنیا گریاوە، باشە سیحربانوو بەو هەموو بۆن و بەهەشتییەوە لەو رۆحە لیتاوییەدا چی دەکات، دەبێ بزانێ؟ دەبێ بزانێ رێگای کەوتۆتە شوێنێک، هەموو جووڵە و رۆیشتنێکی لەوێ رەسم دەبێت و جێدەمێنێ. دواکەسیان ئەو سیحربانووەیە ئەوەتا، ئەو هەموو داخانەی ناوەتەوەو نایبینمەوە. خەیاڵی چۆ سەر ئەوەی جارێکی دیکە لەو فیلمە بگەڕێ کە جێمس پۆڵ براون جێهێشتبوو. ئەو فیلمەی سەید حوسێنی جیهانگیر پاراستبووی و لەو گەشتە پڕ مەترسییەدا دۆزیبوویەوە و دابوویە کاکۆ لە ئەلبوومێکدا جێگای بۆ بگرێ.

کاکۆ جوان تەماشای ئەو فیلمەی کرد و ئەو سندووقە تەختە نەخشێنراوەشی کردەوە

که تێیدابوو، لەگەڵ خۆی هێنای و لەلای دەفتەرە بەرگ چەرمەکەی دایکی داینا، بەڵام کوا بێ ئەوەی سەری بسوڕێنێ، یان بێ ئەوەی بهێڵێ ناز جەواهێرخان ئاگای لێبێ دەستی لە ناو جەنتاکەی دەگێڕاو ئەو سندووقە تەختەی بەردەست نەدەکەوت. لە پڕ و لە ناکاو دەستی لەهەموو کارێک هەڵگرت و دەستەو دامێنی ناز جەواهێرخان بوو، بە پاڕانەوەوە گوتی:

– دڵ گەورەترین ژن، تۆ زۆرت فێرکردم، زۆرت دامێ، تەنها پێمبڵێ من دەتوانم کارێزی هەزار دەریا بگەڕێم، دەتوانم بچمە ناوی؟ رێگام دەدەن؟ داوا لە شەرەفەدین بکەم، مەلا یارۆ وشکە کوڕێکی نییە لەگەڵم بێت؟ با ئەو بێتەوەو من ون بم، با ئەو بگەڕێتەوەو من بێ سەرو شوێن بم، من شارەزام و دەزانم چۆن لەو کارێزەدا خۆم دەربازکەم، من هەموو تاق و پلیکانەو شوێنە نهێنییەکانی شارەزام من مەلا یارۆ وشکەم دیوە، ئا مەلا یارۆم بەو چاوانە دیوە، ئەو تەنها لە تاریکیدا بریسکە لە چاوەکانی نایە، ئەو سەدایەکە، سەدایەک لە هەر هەزار دەریادا دەنگ دەداتەوە، ئەو لە رووناکیدا دەژی و ئەو ژیانێکە بۆ هەمیشە.

ناز جەواهێرخان روانییە هەموو فەرش و چراو خەنجەرە هەڵواسراوەکەی شەرەفەدین و ژوورەکە، روانییە ئەو لاوە دەست و پێ سپی و هیچ نەزان و سەراسیمایە، وایزانی خەونە؟ ئەو هەموو دیتن و شارەزاییەی لە کوێ بووە، مەلا یارۆ وشکەی لە کوێ دیوە؟ بۆ ئەوەی هێمنی کاتەوەو راستییەکانی پێ بڵێ گوتی:

– تۆ مەلات لە کوێ دیوە؟ کارێزی هەزار دەریا شارەزای؟ چ ئاسنگەرێکە تۆ باسی دەکەی؟ کاکۆ بە سروشتی هێمنی خۆی گوتی:

– دیومە، چوومە ناو ئەو ئەشکەوتە، تۆ تەنها بمبە بۆ لای کارێزی هەزار دەریا.

ناز جەواهێرخان گوتی:

– تۆ پێویستە پشوو بدەی، پێویستە بنوی، چونکە کارێزی هەزار دەریا، تەنها ناوەکەی ماوە، تەنها ئێمە باسی دەکەین و لە حیکایەتی گوندەکەماندا بۆ نیشانەی ئەو هەزاران ئینسانەی بێ سەر و شوێن بوون ماوە، دەنا ئەو کارێزە لەو رۆژەوەی

مەلا یارۆ وشکەی تێدا ون بووە لەسەر ئەو زەوی و ئاسمانە سۆراغێکی نییە، هەربۆیە بەیانییەکەی ئەو کارێزە گەورەو فراوانە تەخت ببوو، وەک هەرگیز دلۆپە ئاوێکی لێ نەهاتبێتە دەر، شوێنەکەشی هەموو ساڵێ دەکرێتە گەنم، بەڵام راستی کارێزەکە هەرگیز هیچی لەسەر شین نابێت.

دواتر زۆر بە سووربوونەوە گوتی:

– تۆ وابزانە ئەو کارێزە هەرگیز نەبووە.

## مووس

نیوەشەو کاکۆ بە ئاگاهات، دیار بوو هەر لە ئێوارێوە دوای ئەو ماندووبوونە قورسە و سەفەرە بنبەستەکانی ناز جەواهێرخان خەوی لێکەوتووە، لە پەنجەرەکەوە روانییە دەرەوە، بەفر هەر دەباری، وەک هەزاران چۆلەکەی سپی کەوتبنە ناو هەواو لە ئاستێک وەستابن، حەزی دەکرد بە خەیاڵێکی منداڵانە بە ناو ئەو هەموو چۆلەکە سرک و سپی و نەرمانەدا بفڕێ و سڵاویان لێ بکات و بە روویەکی بێگەردەوە بۆیان پێبکەنێ، بە پارێز دەرگای کردەوەو چووە دەرێ، بەفر وەک خێوی زل زل لەو دەشتە راکشابوو، خانووەکانی گوندەکەو دار و درەخت و دەشتەکەی لەگەڵ ئاسمان پێکەوە بەستبۆوە، هەستی کرد ئەو بەفرە پەیامێک دێنێت، بێگومان لەسەرەوە پەیامێک دێنێت، حەزی کرد میزێکی دوور و درێژ بەسەر بەفرەکەدا هەڵدا، دەستی کرد بە میزکردن، لەوەنەدەچوو میزەکەی تەواو بێت، هێڵی نارێک و باریک و ناشیرینی لەسەر بەفرەکە دروست دەکرد، هەڵمی لێهەستاو ئەو هەستی بە زیندووەتی خۆی کرد، هەستی کرد سەرما وەک سوپایەک لە مێرووولە، بەڵام خێراو وێرانکەر لە پەنجەکانی پێیەوە سەردەکەوێ و خەریکە سمتە رەقەکەی و

پشتی ببەستێ. گەڕایەوە ژووریێ، دوو دڵ و حەیران لەبەر دەرگاکە وەستا، ماڵ کپ و کپتر، دەبێ سیحربانوو لە چ سووچێکی ئەو ماڵە رابکشێ، دەبێ بای بەهەشت بەسەر چ هەناسەیەکەوە گیرسابێتەوە، چووە ژوورەکەی خۆی، سیحربانوو لە ناو تاریکییەکەدا کاکۆی دەدیت، سڵ و هەنگاوی شێواوی دەخوێندەوە، دوودڵی و حەیرانییەکەی دەدیت، ئەوی لەودیوی تاریکییەوە دەدیت، ئەو بای بەهەشتە تا ئێستا لەگەڵ قژە درێژ و رەش و قورسەکەی خۆیدا نوستووە، لە پەنا خۆی بە بەرزی بالآی درێژی دەکرد و دەنووست. کاکۆ هەستی کرد لە پشت ئەوەوە، هەر لە دوای خۆی کەسێک، هەناسەیەک بایەک بە دوای داهات و هاتە ژوورەکە، بە ژوورەکەدا گەڕاو چاوی بەکەس نەکەوت، هەناسەیەکی قووڵ و دووری دا، سینگی هێندەی نیوەی دنیا هەوا دەگرێ.

بەبزەیەکەوە دەڵێت:

-خۆتم پیشان دە، بابتبینم، من، رووحی من بەرگەی برینێکی دیکە ناگرێ.

ژوورەکە کپ، دەنگی ئەو کپتر.

– ئاوازێک، مۆسیقایەک لە دڵمدا، راست لە ناوەندی دڵمدا دەزرینگێتەوە، ئاوازێک لە بەهەشتەوە هاتووە، مۆسیقایەک ئۆڕانۆس بە دەستی خۆی لەوێ رواندوویەتی.

ژوورەکە کپتر،

– من بۆنت دەکەم و بۆنکردن لە باغەوانەکانی کۆشکەکەی ئۆڕانۆسەوە فێربووم، ئەوان بە بۆن تەنها بە بۆن تەمەنی دارەکان و پەیکەرە تەختەکان و نووسینی سەرگەلآ مۆزەکان دەزانن. بابتبینم و لە تەمەنمدا تاکە شتێک هەبێ، تاکە ئەفسوون و حیکمەتێک هەبێ لە نهێنیدا نەمێنێتەوە و خۆتم نیشاندا، بەرگەی یەک تاکە نهێنی دیکە ناگرم.

هەوا لە کپیدا هەرگیز درزنابات و بەسەریەکدا دەتەپێ.

دەرگای ژوورەکە کرایەوەو ناز جەواهێرخان بە قژێکی شێواو و چاوی خەوبارەوە، گوتی:

– با ئاگاهاتی، برسیت نییە؟

بەدەم ئەو قسانەوە چراکەی داگیرساند. دواتر پرسی، بە هەمان چاوی خەوبارییەوە

پرسی:

– لەگەڵ کێ دەدوای؟

– بای بەهەشت.

– واچاکە ژەمەکانت باش بخۆی، بۆ ئەوەی بێیەوە سەر خۆت و سەفەرەکەت دەست پێکەیەوە.

ناز جەواهێرخان چووە دەرێ و ئەو نان و گوێز و هەنگوینی خوارد، شیرینی و لەزەتێک هاتە نێو لەشییەوە، بەفر لەو پەڕی بێدەنگیدا دەباری، دەباری و وەک راز و نهێنی ئینسانەکان دەکەوتە سەر یەک و کەڵەکەدەبوو، ئەو کپییەی بەفرە تاکە شتێکە کە مۆسیقا هیچی پێنابەخشێ و هیچیشی لێ حاڵی نابێ.

چاوی بێدەنگ و هێمن و بە قووڵدا چووی لادێیەکان بێدەنگتر لە بەفر شتێکیان دەگوت، بەڵام ئەو شتە شایانی بیستن نەبوو، ئەو هەستی بە تەنهاییەکی قووڵ کرد ویستی ئیدی لەو تەنهاییەدا نەیەتەدەرێ و بۆ ئەبەد لە بیر بکرێ و بگاتە یەقین. لەو ساتەدا بۆ ئەو تەنها مردن نهێنی تێدا نەمابوو و راستەقینە و ئاشکراو روون بوو، هەر ئەویش تاکە حەقیقەتی دنیایە. چووە ناو نوێنەکان و تووکی نەرمی بەتانییەکە ختووکەی داو، خەریک بوو تەنهایيە ئەبەدییەکەی بشکێنێ، حەزی کرد بشکێت و ورد بێت، بەڵام ئەو زووتر زانیبووی تەنها ئینسان نە بەیادەوەری و نە بەخۆشی و غەمگینی، نە بەنووستن و شیعر نووسین ناشکێت و تاکە مەخلووقە تەنها ئینسانێکی دیکە دەتوانێ لەناوی بەرێ و ورد و پردی کا و بیهاڕێ. ئەوەشی زانیبوو کە تەنها قووڵایی مرۆ، لەو ژاوە ژاوەی لە قەڵەباڵغی دنیادایە ئەستوور تر دەبێت و تەنها دەنگێک دەتوانێ، تەنها بایەک دەتوانێ لەو تەنهاییە دابیڕێت و رزگاری کات.

ئەو دەنگ و بایەش دەبێ لە بەهەشتەوە هاتبێ.

بۆ ئەوەی رزگاری بێت بیری لەوهەنگانە کردەوە بەوپەڕی سەرگەرمی و لەو پەڕی هێمنیدا کاردەکەن و هەنگوینێک بۆ ژیانی خۆیان دروست دەکەن، بەڵام نەیتوانی خۆی لەوە رزگار بکات کە ئەوان هەنگوێن بۆ خواردنی خۆیان و دروستکردنی ماڵ و

شانەکانیان بەرهەم دێنن، ئینسان لێیان داگیر دەکات و هەوڵی ئەوان بۆ خۆی دەبات. لە ناو ژاوە ژاوەی هەنگەکان تەنهاییەکەی کەمێک کاڵ بۆوە و دەستی بۆ جانتاکەی برد و دیسانەوە هەموو کەلێنەکانی گەڕاو سندووقە تەختە چوکەڵەکەی فیلمەکەی جیمس پۆڵ براون ئەسەری نەبوو. دەفتەرە بەرگ چەرمەکەی دایکی سەرنجی ڕاکێشاو کردییەوەو دووبارە بە وردی سەیر بەرگەکەی کردەوە لە دیوی ئەودیوی بەرگەکەی نووسراوێکی ئینگلیزی چاوەکانی بۆلای خۆی برد، نووسرابوو:

«لەودیو فرمێسکەوە بەرد، تکایە گیای رۆحەکان مەشێلە»

چەندان جار ئەو دێڕەی خوێندەوە، بۆنی مەرەکەبەکەی کرد، لە نووسینی نێو لاپەڕەکان جیاوازە، کەسێکی دیکە ئەوەی نووسیوە، زۆر بە وردی بە هەمان مەرەکەب لە ژێر ئەو دێڕە نووسرابوو مۆرفیا.

کاکۆ چەند جارێک ئەو ناوەی دووبارەکردەوە، دەبێ ئەو ناوەی نەبیستبێ، یان نازناو نەبێ، دایکی چەند ناوی لا هێناوە، پوورە هاریازی باسی چ خزم و کەسێکی لاکردووە، ئەو رۆژەی کە تۆزێک زووتر لە رۆژان گەڕایەوە ماڵ، یەکەمساڵی زانکۆی بوو، خووی بە سیفات و ناو و جۆری گیاوە گرتبوو، دەیویست چەند دەبێتە زەویناس ئەوەندەش لە گیاناسی شارەزا بێ. لەو ڕێگایەشەوە پەیوەندی نێوان جۆری زەوی و ئەو گیایانەی لەسەری دەڕوێن بدۆزێتەوە، ئەو رۆژە گوێی لێبوو، گوێی لە دەنگی پووری بوو، کە وەڵامی دایکی دایەوە، دەیگوت:

– جگە لەو چەند لاپەڕەیە چیمان هەیە، ئیدی شار و گوندێک نەماوە بۆ ئێمە، خەڵک سەردانی وڵات و شاری خۆی دەکات و خزم و کەسە دوور و نزیکەکانی، دۆستە کۆنەکانی بنەماڵەکەیان و خەڵکی گەڕەکەکەیان و شەقام و ماڵ و حەمامی کۆنی شارەکەیان بەسەر دەکاتەوەو لەگەڵ هەر کامیان یادگارییەک و خۆشییەک دەگێڕێتەوە، هاوڕێیەکی مامۆستام گەڕابۆوە گوندەکەی خۆیان لە خوارووی ئەفریقیاوە شاخی کەڵە کێوییەکی لەگەڵ خۆی هێنابۆوە گوایە وەختی خۆی باپیرەی ماڵی کردووەو دواتر کە دەمرێ شاخەکانی هەڵدەگرێ و ناوی بنەماڵەکەیان و یەکەم رۆژی دۆستایەتیان لەگەڵ

ئەو کەڵەکێوییە لەسەری دەنووسنەوەو ئەوەی سەیر بوو شاخەکە ڕەنگی سوورێکی تۆخ بوو بە ڕەش لەسەری نووسرا بوو.

دایکی بێ ئەوەی قسەیەک بکات هەناسەی قوڵ هەڵدەکێشێ کاکۆش بێ جووڵە و هەناسە لەوێ دادەنیشێ و پوورە هاریازی دووبارە دەڵێ:

– ئیدی هەموو خزم و کەسی مە لە ناو ئەو لاپەڕانەدایە، هەموو شار و گوندەکانمان لەوێدان، ماڵە کۆن و کەنیسەکانمان تەنها لەوێدا زیندوون، ئێمە ناتوانین بۆ هیچ شوێنێک سەفەر بکەین، ناتوانین گەشتێک بکەین تەنها بۆمان هەیە ئەوەندەی دەتوانین لەو لاپەڕانەدا بگەڕێین. خوشکی شیرینم، سەفەر بەو لاپەڕانەشدا کەم نییە.

گوێی لێبوو دایکی زۆر بە هێمنی دەڵێ:

– ئێمە هێمنیان لێدەشێوێنین.

پوورە هاریازی وەک ژنێکی پڕ حیکمەت دەڵێ:

– تەنها تۆ هێمن بە، تەنها تۆ مەگرییەو شیوەن مەکە، ئەوان بەسەر لێدانی ئێمە کەیف سازدەبن، ئەوان حەز دەکەن بچینە لایان، چیان هەیە بۆمان دەگێڕنەوەو دەردەدڵی خۆیان دەکەن.

دایکی بەدەنگێک لە ڕۆحی کۆست کەوتوویەوە، دەڵێ:

– چ دەردەدڵێکە!!!

یەکە یەکە ناوی دێنان، ناوی شار و ئەسپ و منداڵەکانیانی دێنا، دڵنیا نەبوو، ناوی مۆرفیای بەدەمدا هاتووە یان نا.

ئەو شارە تەماویانەی ئەودیو قسەکانی پوورە هەریازی، ئەو خانووە پڕ ژیان و خۆشەویستانەی نێودەنگ و سەدای، ڕێحانە و گولڕ و دار و درەختی ناو دەنگ و هەناسەی، ئەوانە، هەرگیز لە یادەوەری کاکۆدا نەسڕانەوە، نەخشەی ئەو ماڵانە، نەخشە هەرە زێرینەکانی ناخی کاکۆ بوون، جارێکی دیکە ڕستە ئینگلیزییەکەی ئەودیوی بەرگەکەی خوێندەوە؛

«لەودیو فرمێسکەوە بەرد»

ئەستەمە تێگەیشتنی، ئەستەمە نووسینی.

جارێکی دیکە روانییە هەڵکەنراوەکەی لاپەڕەی یەکەم، گالیسکەیەک، دەسماڵێک، یان لچکێک لە کراسی ژنان کە دەشێ حەریر بێت، با لە پێشەوەی گالیسەکەکەوە دەیفڕێنێ بەرەو دوا، بێگومان هەموو ئەو وێنەیە تەنها هێڵێکی خێراو بازنەییە، بە چەند هێڵێکی پانتر دیارە تایەکە قوڕ و لیتە فڕێ دەداتە ئەولاو ئەولای، خۆ ناکرێ ئەو ژنە گەنجەی ئەو دەفتەرە چەرمەی لە باپیرە قەشەکەی وەرگرتووە ئەو وێنەیەی کردبێ، جا بۆنا، ئەو سەردەمە ئەرمەنییەکان لە ناو کەنیسەکانیان وانەی نیگار کێشی و مۆسیقاو هونەریان خوێندووە، بێگومان لەگەڵ رێورەسمی دینەکەیان، کاکۆ زانی ئەو ژنەی دەفتەرەکەی لە قەشەکە وەرگرتووە، دایکی یەعقوب بووە، لە کۆتایی لاپەڕەی دووەمدا نووسراوە،

«لە سیماو دەموچاوی ئەو ژنە کوردەی عومرێک بوو جیرانمان بوو، کە ناوی ئەڤینتوو بوو زانیم ئەو کارەساتەی روویداوە چەند جەرگ برە، زانیم دەبێ ببمە بەرد و بەرد و بەرد. سەری خۆم بەدار و بەرد دا دەکێشا، منداڵەکەم لە دەستم پەڕی و هۆشم لێی نەما، لەناکاو ئەڤینتوو وەک خەون گوێم لێبوو ئەڤینتوو وتی «بێدەنگ بە، بەدبەخت واهاتن» گوێم لێبوو هەڕەشەیان لە ئەڤینتوو دەکرد پێیان دەگوت:

– کوردی حەیوان بزانین درۆ دەکەی سەرت دەتاشین.

دەنگی ژنەم نەبیست تەنها چەند هەنسکێکی کپ، دیار بوو لە قووڵایی خۆیدا دەگریا.

کاکۆ هەستی دەکرد ئەو ژنەی، دایکی یەعقوبە، نەنکی بێت، باشە ئەنجامی بەچی گەیشتووە، دەیگوت بۆچی پێویستە یەک سەدەی تەواو دایکم ئەو مردنە لەگەڵ خۆی هەڵگرێ؟ بۆچی دەبێ بیخوێنمەوە؟ منێک کە لە حیکایەت هەڵاتووم ئەو هەموو بەزمە چییە پێشم دەگرێ، خوزگە زووتر زۆر زووتر ئەو دەفتەرەم دزیباو ئەو هەموو کارەساتانەم لە ناخی خۆمدا ناشتبا.

لە سەرەتای لاپەڕەی سێیەمدا نووسرابوو؛

«لە ماڵی شێخێکی گەورەم، ماڵەکەیان بەسەر شەقامێکی پان و بەریندا دەڕوانێ، من

لە ژوورێکم لە نهۆمی سێیەم لە سەرەوە، ئەڤینتوو سێ جار دەستی شێخ ژنی ماچ کردو ئەویش سەری منی ماچ کرد و گوتی:

–کچم مەترسە. ئەو بە کوردی قسەی دەکرد. بۆنی گیای کۆن و خەنەی لێدەهات. دوو رۆژ دواتر یەعقوبیان بۆ هێنام، ملوانکەیەکیان لە مل کردبوو، ددانێکی رێوی درێژی سپی پێوە بوو، لەسەر ددانەکە بە رەنگی سوور چەند هێڵ و خەتێکی نیشانەی چاوەزاریان بە بچووکی کێشابوو، بۆ بێکەسی یەعقوب ئاگرم گرت، زانیم جگە لە مێردەکەم، چوار مامی یەعقوب و دوو پوورە بچووکەکەی و باپیر و نەنکی، لەگەڵ ئەو پیاوە پیرە بەدین و هەژارە یۆنانییەی خزمەتی دەکردن سووتاون»

کاکۆ خێرا لاپەڕەکەی هەڵدایەوە، بێگومان لە ترسی ئەو هەموو کوشتنە، بەڵام بەنیازی خۆی بۆ ئەوەی لاپەڕە چوارەم بخوێنێتەوە.

«ئەمرۆ بەیانی لەزیرەو هەرایەک بەئاگا هاتین، چریکەیەک وەک مووس هەناومانی بڕی، تاقە کچی رەبەنی رزگاربووی کەنیسەی سان...، بەو بەیانییە خۆی سووتاندبوو، ئەو کچە چل و حەوت ساڵە خۆی بەخودا بەخشیبوو، تورکە تووڕەکان هێرشیان کرد بۆ سەر کەنیسەکەو وێرانیان کردبوو، منداڵە هەتیوو بێکەسەکان و قوتابییەکان و مامۆستاکانیان هەر لەوێ لەبەر دەم حەوزە فراوانەکەی حەوشەکەیدا سەر بڕیبوو قەسابێک گوتبووی ملی منداڵەکانیان بۆ بڕین زۆر خۆشە، بەڵام ملی پیرە سەیە ئەرمەنییەکان زۆر چیڕە و خوێنیشیان بۆنی ژەهری لێدێت ، ئەو کچە رەبەنە لە خەڵووزدانی کەنیسەکەدا خۆی دەشارێتەوە، شەو هەندێ کەس بۆ دزینی پاشماوەی کەنیسەکە دێن و دەیبینن، بە کۆمەڵ لەگەڵ ئەو نەزەرکردەی خودا جووت دەبن، پێکەوەو بەتەنیا. ئەو کچە رەبەنە بێزی لە جەستەی خۆی دەکرد و هەمیشە خۆی دەشاردەوە، شێخ ژن دڵی دابۆوە و پیرۆزی کردبوو، دووکەڵ لە ژوورەکە هەڵدەستا، کە دەرگاکەیان شکاند وەک باوەشێک ئاگر، با هەڵی گرتبێ بە فڕین دەفڕێ، قاڕون بەگ دەفتەرداری شێخ پاڵێکی پێوەنا بۆ ناو حەوزەکەی ناوەندی حەوشە، ئاگرەکە کوژایەوە، بەڵام ئەو کچە رەبەنە هەژارە ئەوەندەی کێشی نەمابوو نقوم بێت، دووکەڵێکی خەست و خنکێنەر و رۆحکوژی لەسەر بڵند بوو،

دەریان هێنایەوەو لە جاجمێکیانەوە پێچا، نەمتوانی بچمە خوارێ، ئەو ئەرمەنیانەی وەک من شێخ شاردبوونییەوە، لە دەوری دانیشتبوون، حەسوودیان بەوە دەبرد کە ئیدی ئازار ناکێشێ»

کاکۆ وەک لەبەرامبەر مەیتی سووتاوی کچە دیندار و لە خوا شەرم کردووەکە دانیشتبێ، بۆنێکی توند و خەست دەهاتە بەر لووتی، وەک ئەو بۆنی دووکەڵ و سووتانی گۆشت و ئێسقانەی لە جەنازەیەکی سووتاو بەرز دەبێتەوە.

لە ژێرەوە بە قەڵەمێکی دیکەو دەستخەتێکی دیکە نووسرابوو،

«لاپەڕەی سۆفیا»

هەر لە ژێر ناوەکە بەخەتێکی تازە بابەت و مەرەکەبێکی نوێ نووسرابوو:

«تۆ لەگەڵماندای»

کاکۆ هەستی کرد ئەوە دەستخەتی دایکی بێت کە بە گریانەوە نووسیبێتی. کاکۆ وێنەیەکی جیمس پۆڵ براونی هاتەوە بەرچاو، لە وێنەکە لاشەی کچێک، کە باش دیار نەبوو مردووە یان زیندووە، بەڵام چاوەکانی نیوە کراوە بوون، ئەو کچە لە پەنا گۆلاوێک کەوتبوو پێڵاوێکی لە لیتاوەکەدا بەجێمابوو، سێ سەگ دەستیان بە خواردنی کردبوو، چەند سەگێکی دیکە لە دوورەوە تارماییان دیار بوو، کاتی خۆی تورکێکی نیشتیمانپەروەر و لە خواترس ویستبووی جیمس پۆڵ براون بکوژێ، لە تۆڵەی ئەو سووکایەتییەی بە وڵاتەکەی کردووە، چەند چەقۆیەکی لێدابوو، بەڵام جیمس پۆڵ براون لەو پیاوە نیشتیمانپەروەرە خۆش ببوو هەر لەبەر خاتری دینداریيەکەی، هەر کە گەڕابۆوە بۆ ماڵەکەی خۆی ئەو وێنەیەی بۆ کابرای چەقۆکێش پۆست کردبوو، کابرا کە بە قسەی ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە نازناوێکی وەک سوڵتان سادق ئۆغلۆی هەبوو، وتارێکی دوورو درێژی بۆ یەکێ لە ڕۆژنامەکان ئامادە دەکات، بەڵام پێش ئەوەی وتارەکە بنێرێ، دەیدڕێنێ و خۆشی بە پەتێک هەڵدەواسێ.

جیمس پۆڵ براون لە ژێر وێنەکەدا تەنها نووسیبووی سۆفیا، دواتر پۆلیسە شارەزاکان وتارە دڕاوەکەیان لێک دابۆوە، وشەیەکی وەکو «دریم، خەون. کەوتبوو تەنیشت ناوی

سۆفیاوە ئیدی کەس نەیزانی چۆن ناوی ئەو وێنەیە بوو سۆفیا لە خەوی بڕاوندا. لە ماوەی هەفتەیەکدا هەموو ئەمریکا و ئەوروپا ئەو وێنەیەیان بەخەونەکەی بڕاون وەسف کرد، دوای چەند ساڵێک دەبوو ئەرمەنییە بەستەزمانەکان هەوڵێکی زۆر بدەن بۆ ئەوەی بۆ تەماشاکەرەکانی ئەو وێنەیەی بسەلمێنن کە ئەوە وێنەی کچێکی ئەرمەنییەو لە کاتی پاکتاوی رەگەزیدا تووشی ئەو موسیبەتە بووە و پەیوەندی بە خەوەوە نییە.

بە پێچەوانەی مەبەستی وێنەکەوە، زۆر دواتر بەشی زۆری ئەو کچانەی ناویان سۆفیا بوو خوویاندایە کڕینی سەگی زمان پان و لە رێگای وانەو تەمرینی زۆر تایبەتەوە فێریاندەکردن چۆن لە کاتێکدا بە رووتی دەنوون ئەو سەگە زمان درێژ و سوور و پان و فێرکراوانە هەموو جەستەیان بە زمان و لیکێکی تایبەت کە تام و بۆنی ئەو کرێمانەی لە خۆیان هەڵدەسوو دەیانخزاندە زمانی ئەو سەگانەوە بیانلێسنەوە.

ئیدی بارەکان و شوێنە تایبەتەکان پڕبوون لەو وێنانەی کچانی ناو سۆفیا بە رووتی راکشاون و سەگێک لەوانەی کە بە سەگە زمان گەورەکانی دنیا ناسرابوون دەیانلێستەوە. کچەکە هەر ناوێکی هەبا لەبن زمانی سەگە و لە چاوی تەماشاکەرانەوە دەبووە سۆفیا. ئەرمەنییەکان تاکە ئینسانە غەمگینەکانی ئەو وڵاتانە بوون کە هەرگیز لەزەتیان لە جەستەی پڕ و تەڕو ئاونگداری ئەو کچانە نەکرد کە لەبن زمانی سەگەکان دەلەرینەوە، بەڵکو دڵیان پڕ پڕ دەبوو دەگریان یان دەڕشانەوە.

لاپەڕە پێنج دێڕەکانی سەرەوەی رەش ببوونەوە، هەندێکیان تێکەڵ ببوون، لە نێوەی دێڕی چوارەم ئەوەندە دەخوێندرایەوە؛

«وردە تۆزێکی رەش لە شوێنی مەیتەکە جێمابوو»

دواتر لە دێڕی حەوتەمەوە، نووسرابوو؛

«کۆترەکانیش لەوێ نەدەنیشتنەوە، هەرچەندە جێگاکە سەرە ڕێ بوو، بەڵام خزمەتکارو دروێش خۆیان لە پێ لێنانی ئەو شوێنە دەپاراست. شێخ ژن هەموو ماڵەکەی گوڵاو پژێن کرد، ئاوی حەوزەکەیان گۆڕی، بەڵام بۆنی سووتانی ئێسقان چووبووە کونە دیوارەکانەوە، یەعقوب بە هەموو دەنگی دەگریا، هەموویان وەک شێت لە من دەڕوانن.

منیش ئەوەم قبووڵە، چونکە بە راستی دەزانم. دەروێشێک کە روویەکی نوورانی هەبوو، ریشی زەرد و دەموچاوی باریک بوو، چاوەکانی مات بوون، سێ شەو هاتە ژوورەکەم و بە دەنگێکی نزم و غەمگین، وێرد و ئایەتی بەسەردا دەخوێندم، یەعقوب بێدەنگ دەبوو، منیش خەوم لێدەکەوت، شەوی سێیەم لە خەوێکی قووڵدابووم هەستم کرد سوارم دەبێت، لەشم ئەوەندە گران بوو قسەم نەکرد، شەوی چوارەم و پێنجەم...ئەی خودایە من چیم...»

لێرەوە نەدەکرا هیچی تێبگەی، بەڵام کاکۆ زۆر حەزی دەکرد ئەو چەند دێڕەی پێشووتریش نەخوێندرابانەوە، هەستی بە قورسی لەشی دایکی یەعقوب کرد، چ دنیایەکی سەخت لە پەنا هەر ئەرمەنییەک دەژی، دێرەکانی ئەو لاپەڕەیە ئاوا کۆتایی هاتبوو:

«دەروێشی مات بە رۆژ بەلامدا تێدەپەڕی، بێدەنگ و نوورانی، بەئاستەم سەیرێکی دەکردم و شەرمن و غەمبار»

سەرەتای لاپەڕە شەش، لە لێواری سەرەوە، چەند رستەیەک نووسرابوو، بە زمانێک کاکۆ هیچی لێحاڵی نەبوو، دواتر ئەوەی خوێندەوە:

« مانۆس ئەو پیاوەی پەنای بۆ ماڵی شێخ هێنابوو، کەوتبووە دەست جاندرمەیەک، ئەو بۆ سۆراغێک بە شەو زۆر بە پارێز چووبووە دەر، لە گەڕانەوەدا لەبەر دەرگا گرتبوویان. دەوری تەکییە گیرابوو، مانۆس پیاوێکی سی ساڵان و باڵا بەرز و باریک بوو، بێ ئەوەی بەرگری بکات لەبەر دەستیان وەستابوو، هەردوو پێیان بەست و پەتەکەیان خستە کلکی وڵاخێکەوە، جەندرمەکان باخەڵ و جلەکانی دەگەڕان، پێڵاوی لە پێ نەمابوون، پێیەکانی لە کاغەز سپیتر بوون، ئاگریان لەسەر زگی کردەوەو ئەسپەکەیان دەنگدا، ئەسپەکە بەسەر بەفرەکەدا لە مەیدانەکە بە خێرایی دەسووڕایەوە، ئەو پیاوە دەنگی لێوە نەهات، من ویستم خۆم بکوژم، لە هۆش خۆم چووبووم، ئێوارە درەنگ بەئاگا هاتم، تەنها ئەو هێڵە سوورە بازنەییانە دیاربوون، کە مەیدانەکەیان رەنگ کردبوو، تا زیاتر تاریک دەبوو ئەو خوێنە بازنەییانە مۆر تر دەبوون، دواتر ئەڤینتوو کە ئەویش چاوی لە کارەساتەکە ببوو، خاچێکی مسینی چووکەڵەی بۆ هێنام، لە دیوێکی نووسرابوو مانۆس، لە دیوەکەی

تر نووسرابوو (ش) دایکی ئازیزم. ئەڤینتوو سەرنجی دابۆ دەستی نووقاوی مانۆس، دواتر کە بەشمشێر دەیبڕن، هەر بۆ پێکەنین و خۆشی، دەستی دەکەوێتە پەنایەک و ئەو خاچەی لێدەردەپەڕێ و ژاندرمەیەک بە پێڵەقە لە بەفرەکەدا ونی دەکات، من خەریکە دەمرم ، ئەو درویشە غەمگینە چی لە من کردووە، هەموو لەشم خوێنە»

## زەرنیخ

کاکۆ، کە نەیدەتوانی یەک هەنگاویش لە بیرکردنەوەکانی بچێتە پێش، هەوڵی زۆریدا لە هەموو ئەو وێنانەی جیمس پۆڵ براون و وێنەی هۆلوکۆستی ئەرمەنییەکان، قسەو گێڕانەوە پڕ ئەفسانەو دڵبڕەکانی پوورە هاریازی وێنەی دایکی یەعقوب بدۆزێتەوە، یان یەکێکیان بەو بچوێنێ، یەکێک لە وێنەکانی جیمس پۆلڕ براون کە بەناوی «دەلاقەی سەما» ناسرابوو، عەرەبانەیەکی مۆدیلی ئەستەنبووڵی لە مەیدانێک دەسووتا، دیار بوو تازە گڕیان تێبەردابوو، یەکێک لە ئەسپەکانی کەوتووە و ئەوی دیکەیان بەدەست چەند کەسێکەوەیە، لەلاوە چەند پیاوێک کەشێوەو سیمایان دیار نییە وەک مردوو بەسەر یەکدا کەوتوون، کەسێکی فێس لەسەریش کە سمێڵێکی شایانەی هێشتوتەوە. کچێکی لەکەمەرەوە لە دواوە گرتووە، بەڵام کچەکە بۆپێشەوە هەوڵی خۆ رزگارکردن دەدات ئەوەندە داهاتۆتەوە قژە رەشەکەی گەیشتۆتە سەر زەوییەک. هەموو باکگڕاوندی ئەو وێنەیە دیوارێکی بەرزی لە خشتی سوور دروستکراوە، تاکە پەنجەرەیەکی بچووک دیارە، لە پەنجەرەکەوە ئافرەتێکی گەنج دیارە تەماشای عەرەبانە سووتاوەکە و کچەکە

دەکات، ئەو ئافرەتە زۆر دوور دیارە کوڵمەکانی لەوەدەچێ لە کاتی گریاندا بێت و لێوەکانیشی لە شێوەی پێکەنیندا کراوەتەوە. وێنەگرەکە لە کاتی وێنەگرتنەکەدا هەرگیز ئەو ژنەی ئەو دیو پەنجەرەکەی مەبەست نەبووە و بینەرەکانیشی وا ئاراستەکردووە کە تەنها سەیری رووداوە رۆحپرووکێنەکە بکەن، سەردەمێک کاکۆ ئەو ژنەی بە دایکی چواندبوو ئەویش تەنها شێوەی کوڵمەکانی لە کاتی گریاندا، لەگەڵ قژە تەنک و رەشە خاوەکەی، بەڵام ئێستا زۆر بەدڵنیاییەوە دەڵێت:

– نا ئەوە دایکی یەعقوبە، لێوەکانیشی هەر دەگریەن.

دواتر ئەو وێنەیە لە چەند گۆڤارێکی خانووسازیدا بەکارهات وەک نموونەیەک بۆ دیواری رۆژهەڵات. ئەندازیارەکان زۆر لە شێوە و رەنگ و پێکهاتەی کەرپووچەکانی دوان، بەڵام هەموویان بە رستەیەکی هاوشێوە کۆتاییان بە بابەتەکە دەهێنا «دیوارێک بۆ پێکەنین و گریان» لە ژێر ئەو لاپەڕەیە بە خەتێکی جیاواز و تاڕادەیەک تازە نووسرابوو:

«ئێوارەیەکی قوستەنتنییە»

چەند خاڵێکی وردی هەناری کەتبوونە سەر وشەی قوستەنتنییە کە بۆنی خوێنیان دەدا.

لە لاپەڕە حەوتدا نووسرابوو:

«چەند رۆژێکە دەروێشە موو زەردە باریکەکە تەنها لە دوورەوە سەرنجم دەدات، بەلامدا دێت و سەردادەخات و خەریکە لام بوەستێ، ئەمڕۆ لە کاتژمێر دەی بەیانیدا ئەو کاتەی ماڵی شێخ خەریکە پشوویەکی کورت دەدات و خامۆشە، دەرگای ژوورەکەمی بە هێواشی کردەوەو لە پڕ زۆر لە پڕ هات و بێشەرمانە و توند توند لە باوەشی کردم و گوتی:

– تۆ خودامی. من تاسام و کەوتم، رووومەتی سارد و لێوی سارد و سینگی رەق و سارد. یەعقوب زریکاندی و ئەو چووە دەرێ. بنیامینی مێردم لە پڕ دەرکەوت، ئەو تۆزێک قەڵەو ولە دەروێش کورتتر بوو. بەڵام کەلامی پڕ رەونەق و بۆ خۆشی پێغەمبەرێک بوو.

بۆ یەکەم جار دوای سووتانی لە خانووەکەی خۆمان و دابڕانی یەکجاریمان زۆر بە غەمباری هات بۆلام، هەستم کرد لە جێگایەکی هەڵەم و دڵم ئیدی بەرگەناگرێ و دەبێ هەر ئێستا بمرم، بەدەنگی بڵند گوتم:

- دەرویش یەک تۆز زەرنیخم بۆ بێنە من هی تۆم.

بنیامین بۆ نیشانەی بێدەنگی پەنجەی دەخاتە سەر لێوی و دەڵێت:

- من چاوەڕێتم.

من ئەو رۆژەم ناوناوە رۆژی ژوان. یەعقوب ژێر بۆتەوەو دەستم بۆ رادەدێرێ، دەستە بچووکەکانی ماچدەکەم زۆر لە دەستی ئەو کوڕە دەچن چەند رۆژ لەوەبەر بڕیانەوەو خاچێکی تێدابوو و بۆ منیان هێنا. چاوم تاریک بووەو خەریکە بڕشێمەوە، پێڵووەکانم خەریکە دادەخرێن، لە ناخەوە ئیرەیی بەو کچە راهیبە دەبەم، ئیدی ناتوانم بنووسم..من مردووم...

# خاچ

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ لەگەڵ وشەی مردووم، دەفتەرەکە دەخاتە سەرچاوەکانی و بێ ئیرادەی خۆی ماچی دەکات، بۆنی شارێکی وێرانی بەسەر دادێت، شارێکی پڕ هەڵپە و هەڕەشە و کوشتن، شارێک بە کۆڵانەکانیدا ژنان فڕکەیان دێت، با کراسە پانو پۆڕەکانیان دەفڕێنێ و دواتر وەک هەوری ڕەش ئاسمانی شارەکە دادەپۆشن. ئەو دەفتەرە بۆ دڵڕەشی دونیا بەسە. ئیدی کەس بۆی نییە لە خۆشبەختی بدوێ، هەموو هەوڵە بەرچاو و ریاکارانەکانی ئینسان بۆ خۆشنوودی درۆن درۆ. کاکۆ دەنووسێ:

«دایکی لە گوڵ ناسکترم، لەگەڵ چ دەفتەرێکدا ژیاوی؟ تاکە دێڕێکی بەسە بۆ ئەوەی بتبا بتبا ئەوەندە دوور هەرگیز بیر لەگەڕانەوە نەکەیتەوە، دایە دڵشکاوەکەم توخوا دایکی یەعقوب کێیە؟ تۆ هەرگیز و لە هیچ تەمەنێکدا یەعقوبت دیوە؟ ئەو دەفتەر کێ داویە بە تۆ؟ چۆن گەیشتۆتە لات؟ بابم ئەو کارەساتانەی خوێندۆتەوە؟ ببوورە دایکی ئازیزم منی گێل و نەزان ئەو هەموو کارەساتەم لە رووتدا نەدەدی، تۆ دایکی من نیت تەنها تۆ بەڕاستی دایکی یەعقوبیشی. ئاخر لەو هەموو کێشانەدا تاوانی من چییە؟»

هەستی کرد نامەیەکی بێ کەڵک و برینداركەرە، دواتر لە سەر کاغەزێکی تازە نووسی؛

«دایە گیان من سەلامەتم، ئێستا لە دێیەکم، بوومە میوانی ماڵێک، زۆر باشن، زۆر حەزم دەکرد و لەبەر خاتری باوکیشم لە گوندێکی کوردان بژیم، دوێ شەو پیاوێک هاتەلام، ئەو پیاوە من نەمدیبوو وێنەکەی نەبێت کە بە کامێرای جیمس پۆڵ براون گیراوە، ئەو هاتەلام و بردمی بۆ گەشتێک، گەشتێک وەک ئەو حیکایەتانەی بابم بۆی دەکردم، بەڵام ئەو بەڕاستی بردمی بۆ شارێک لە ژێر زەوی لە ئاسمان نازانم لە کوێ، پڕ لە و پیاو و ژن و منداڵانەیە بابم دەیگوت دیارنەماون، لەو وڵاتی ژێر زەمینە فیلمێکیان دامێ، فیلمێک لە سندووقێکی تەختەی بچووکدا بوو، خستمە ناو جانتاکەم لە تەنیشت ئەو دەفتەرەم دانا کە لە تۆم دزیبوو هەرچەند دەکەم بۆم نادۆزرێتەوە، بێ ئومێدنیم دەبێ هەر بیدۆزمەوە، هی جیمس پۆڵ براونەو دەست من کەوتووە.»

کاکۆ دووبارە دەفتەرە چەرمە قاوەییەکەی کردەوە، لە دڵەوە دەیویست چیدی نەیخوێنێتەوە، زوو زوو بە خۆی دەگوت:

– بابەس بێت، بابەس بێت.

دایکی وەک وێنەیەکی سەر ئاو، لەو دیو لاپەڕەکەوە دەڵێت:

– نەمگوت!

کاکۆ دەیەوێ گوێ بۆ و قسە رانەگرێ و وێنەکەش نەبینێ، بەڵام وێنەکە دیسانەوە دەڵێ:

– من دەمزانی مردن، خودی رووحدان لەو دەفتەرەدایە، مردن کۆتایی تەمەنێکی دیاریکراو نییە، نا مردن هەرگیز ئەو گیانەوەرە ماڵی و بەستەزمانە نییە پێ بەپێ لەگەڵمان گەورە بێت، قورسایی مردن لای دایکی یەعقوبە، لای ئەو کچە پاکیزەیەیە خۆی سووتاند. تۆ ئەی کوڕی شیرینم نەدەبوو ئەو دەفتەرە ببینی، نەدەبوو سەفەرکەی، ئەو وڵاتەی بۆی چووی پڕ پڕە لەو دەفتەرانە، بابت لەبەریان هەڵاتووە و تۆش بەرەو پیریان چووی.

کاکۆ زۆر نائومێدانە دەڵێت:

– تەنها تۆ ئەو دەفتەرەت لاکردمە مەتەڵ و نهێنی، دەبوو فەوتاندبات و فرێتدابا، تۆ خۆت ببوویتە ئەو دەفتەرە. ببوورە فریشتەی کوژراوم ببوورە ژیان لەگەڵ ئەو دەفتەرە ئاسانترە وەک لەگەڵ تۆو پوورە هاریازی، ئەو دەمەی دەچوونە ژوورە پڕ نهێنییەکەتان، من هەمو و فەزا خنکێنەرەکانی ئەو دەفتەرەم ئەزبەر بوو، نۆتەو مۆسیقایم دەزانی تەنها لەسەر وشەکان پەکم کەوتبوو. سیمفۆنیایی قووڵ و تیژ و پڕ گەردەلوولی ئەو دەفتەرە بە گۆشتمدا چۆتەخوار، هەموو خانەکانی لەشمی کردۆتەوەو گەرای تێدا داناوە و تێیدا ژیاوە. دایکی ئازیزم ناکرێ نەتزانیبێ لە قەڵایی دڵمدا تاکە مۆسیقا و سیمفۆنیای زاڵ دەنگی ئەو دەفتەرە بووە.

دایکی هەروا وەک وێنەیەکی سەرئاو بێت و شەپۆلی نەرم و بێدەنگ بیشلەقێنێ دەڵێت:

– من ویستم لە جیاتی هەمووتان بگریم وئازار بچێژم، لە جیاتی هەمووتان لەگەڵیان بژیم. من ویستم لە باتی تۆو بابت و خاڵەکانت و هەر هەمووتان لە ناو تەرمەکان بگەڕێم و بیاندوێنم و بەشی هەر هەمووتان بڕزێم. ئیدی من لەبەر ئێوە نەبا هەرگیز بەمدەتوانی دوو دنیام هەبێ، دنیایەکی پڕ راستی و حەقیقەت، دنیایەکی رەسەن و بۆماوەو بڕیاردراو، دنیایەکی تاقانەو ئەبەدی، لەگەڵ دنیایەکی پڕ درۆ و فێڵباز و ریاکار، دنیایەکی گاڵتەو پڕ تورەهات و پۆخڵەوات. من لەبەر تۆ نەبا هەرگیز دەستم لەو دنیایە هەڵنەدەگرت و بۆ ئەبەد لە تەنیشت دایکی یەعقوب دەمامەوە، لەگەڵ راهیبەی فریشتە خۆم فڕێدەدایە حەوزەکەوە و بەئاگرەوە دەفڕیم. من ویستم لەجیاتی تۆ لەوێ بم و خاچ لە کۆڵ کەم و بۆتۆش بگەڕێمەوە.

– بۆچی ئەو دەفتەرە خاچە؟

کاکۆ بەرانبەر دڵی دایکی کە لەسەر لەپی هەردوو دەستی هەڵیگرتبوو شەرمی کرد، شەرمی کرد و هەستی بەڕیسوایی کرد. ئەو دڵەی هێواش و پڕ خوێن لێی دەدا، ئیدی چی بڵێ بەرانبەر ئەو دڵەی بۆ ئەو زەرد و بێ هێز بووە، بۆ ئەو گەچڵاو و ناموراد و

شکاوە.

زۆر هێمنتر گوتی:

– ئیدی ناهێڵم کەس خاچی من لە کۆڵ کات، ئیدی ئەو دەفتەرە ناهێنمەوە و نابێ لەجیاتی هەمووان بەبیابانەکانی مردندا سەفەرکەی.

دڵەکەی سەر بەرەدەستی، وێنە شکاوەکەی سەرئاو، ناشاد و نائومێد دەیگوت:

– نا، فەرزەندی من نا، ئەو دەفتەرە دەفتەری ژیانی منە لە دەستی نەدەی.

## نوور عومەر

لە لاپەڕە هەشتی دەفتەرەکە نووسرابوو:

«ئەڤینتوو بەپەلە و شێواو هاتە ژوورەکەی تێیدابووم، چاوەکانی سوورسووربوون، خێراو بەپەلە دەدوا، گوتی:

– ئێستا دێن، لێت دەپرسن، بڵێ من موسڵمانم، بڵێ پێغەمبەری من موحەمەدە، ئەو نێردراوی خودایە، بڵێ خودا دنیای لەبەر خاتری خۆشەویستی ئەو دروست کردووە، بڵێ ژنەکانی، یاوەرەکانی، خزم و کەسیم خوشدەوێت، بڵێ باوەڕم بەزیندووبوونەوە هەیە، بڵێ کتێبی من قورئانە، بڵێ باوەڕم بەچارەنووس هەیە.

ئەو دەگریاو یەعقوبی لە باوەشی خۆی توند دەکرد، دەیگوت خێرا ئەو خاچەی لە ملی کەوە بۆ تا ئێستا لێمان نەکردۆتەوە، خێراو بەپەلە دەدوا. سەرم لێ شێوا، پیاوێکی ریشدار و شاقەل درێژ هاتە ژووری، چەند یاساوڵێک لەبەر دەرگا، ئەو پیاوە لێوەکانی دەلەرزی، هەرچی گوتی گوتم ئا، گوتی شەهادەبێنە، دەمم تێکەڵهات، بنیامین لە سەر دیوارەکە روون و لێو بەخەندە دەرکەوت، دەیگوت ئازابە، نەترسی، هەڵە نەکەی، چیان

ویست بیکە، تەواو بوو، مەلایەکە پێکەنی و گوتی ئەلحەمدوللا، پیاوێکی کامڵی کەتەی بانگ کرد و گوتی: نوور عومەر ئەو ژنە موسڵمانە هی تۆیە.

نوور عومەر وشک و زبر گوتی:

– ئەمردەکەی. چەند قسەیەکیان کردو وێردیان خوێند و دووجار ئەڤینتوو لەجیاتی من گوتی بەڵێ. فوویان لە هەواکرد. ناوی یەعقوبیان کردە عەبدولحەمید. دیسان مەلایەکە گوتی:

– سەرت داپۆشە، عەورەتت بەدەرمەخە، ناموسی مێردەکەت بپارێزە، ئەو پیاوە مێردتە لە قسەی دەرنەچی.

ئەڤینتوو شانی مەلاکەی ماچ کرد.

لە لاپەڕە نۆدا لە درێژەی ئەو رووداوەدا نووسرابوو؛

«ئێوارەی هەمان رۆژ ئەو پیاوەی کە ناوی نوور عومەر بوو هاتەوە، عەبایەکی رەشی دامێ، سارد سارد زۆر سارد گوتی:

– بابڕۆین.

من ئەو کاتە هەر وەک هاوەڵەکانم مەڕ بووم مەڕ، دوای کەوتم، لە دەرگای دواوەی تەکییەکە بردمییە دەرێ، ئەو پیاوە روخساری وەک مردن مات و دوو چاوی پڕ فێڵی هەبوو، بە چەند کۆلانێکی باریک و کۆن کۆندا تێپەڕین، لە چەند پەنجەرەیەکەوە رووناکی چراکانم دەدیت، بردمییە ناو خانوویەکی تاریک و بێدەنگ، لە و تاریکییە خۆڵەمێشییە تەنهاتر من بووم.

وەک لەگەڵ منی نەبێت، وەک لەگەڵ کەسی نەبێت، ساردتر لە جاری پێشوو گوتی:

– دەبێ لەو منداڵە رزگارمان بێت.

هەر وەک من چۆن لە بیرم چووبۆوە قسە بکەم، هەر ئاوا دڵیشم لە بیری چۆوە لێدات، یەعقوبم توند لەباوەشکرد.

ئەو بە زمانێک ساردتر لە مردن گوتی:

– پەلەمان نییە.

هەستی کەسێکم کرد لە دوامانەوە هاتە ژووریّ، نوور عومەر وەستا، ئاوڕی دایەوە، کەس دیار نەبوو، چووینە ژوورێکی نەوی، چرایەکی خەمبارتر لە ئێوارە خۆڵەمێشەکەی هەڵکرد، داوای کرد دانیشین.

من گریام گریام گریام ئەو نوێژی کرد، من هەر دەگریام ئەو دوعا و ئایەتی دەخوێند. دەستی بەڕیشیدا هێناو هەستا پێ، مرەبای هەنجیر و نانی هێنا، نەمتوانی سەیری نانخواردنەکەی بکەم. چەند جار روانییە پەنجەرەکە، یەکێک لە حەوشە کۆخی. دڵم وەک لامپاکەی سەر تاقەکە کەوتەوە ترپە ترپ و گوێم لە دەنگی سۆفییە ریش تەنک و سوورکارەکە بوو، بە زەحمەت قسەی دەکرد، نوور عومەر بە گوڕە گوڕ دەیگوت:

– دەروێش زێنەدین تۆ پیاوێکی بەشەرم و خوداناسی ئەو ژنە تازە بە شەرع بۆتە ژنی من و لە من مارەکراوە ئیدی لە تۆ حەرامە.

ئەو بە دەنگێکی شکاو و نوساو مکوڕ و شێلگیرانە گوتی:

– تۆ هەر لەو شارە سێ ژنی دیکەت هەیە، هەر رۆژەش لە شوێنێکی، ئەو ئافرەتە با لەوە سەرگەردانتر نەبێت.

نوور عومەر گوتی:

– چەند ژنم هەیە کاری تۆ نییە، خودا رێگای داوم، تۆش لە خوا گەورەترنی، من دەزانم چۆن لەگەڵ ژنی خۆم بجووڵێمەوە.

دەروێش زێنەدین بەپاڕانەوە گوتی:

– من لەوەتەی هەم بیرم لە هیچ مێینەیەک نەکردۆتەوە، لە رووحدا خۆم خەساندووە، بەڵام ئەو ژنە زیندووی کردمەوە، ئەی پیاوی خودا رێگام لێ مەگرە.

نوور عومەر توورە و توند دەیگوت:

– مانای چی زیندووی کردمەوە تۆبەکار؟ تەنها ئەو، تەنها خودا رووح دەبەخشێ و دەیستێنێ نەک روو رەشێکی غەیرەدین؟ تۆ باوەڕت بەوە نییە، پێمبڵێ؟.

دەروێش زێنەدین توندتر لەوەی چاوەڕێ دەکرا گوتی:

– تۆ لە باوەڕی من گەڕێ، تۆ لەوە گەڕێ من چکارەم. ئەگەر پێویست بێت ئەو ژنە لەگەڵ کەسێک بێت ئەو کەسە منم. دەبێ لای من بێت، تۆ نابێ ئەو شەو لێرەبی. یان دەبێ ژنەکە بدەیە دەست من.

## فلامینکۆ

کاکۆ نەیدەزانی چۆن خێرا ئەو لاپەڕانەی هەڵداونەوە، لاپەڕە دوازدەی دەفتەرەکە دەسکاری کرابوو، دیاربوو مەرەکەبەکەی تێکەڵاوبووە، کەسێک دەسکاری کردبوو دەشێ بەو نیازەی ساغی کاتەوە. کاکۆ زۆری هەوڵ لەگەڵدا، دایەبەر رووناکی و نزیک و دووری پێکرد، بۆی نەچۆوە سەریەک، لە ناوەندی لاپەڕەکە نووسرابوو:

«من هێجگار دەترسام، بەچارۆگەیەک یەعقوبم لە سینگی خۆم بەستبوو، نەمدەتوانی بۆ چرکەیەکیش لەبەر چاوم ون بێت، دێمکە ئاوێکم لە کەلەکەی بوو، زێنەدین دابوومیەی، دەمزانی تینوویەتی بۆیە دەگریا، نەمدەویست وازوو ئاوەکە سەرفکەم، ئەو لە پێشمەوە دەرۆیشت، نەمدەزانی دێوانەی چییە، بە هەموو کۆڵانەکانیدا دەڕوانی، چاودێری هەموو شتێکی دەکرد، تاقەقسەیەکی لەگەڵ من نەکردبوو، متمانەم پێکردبوو، متمانەیەک وەک دڵنیایی. رەنگێکی ژەنگن، ژەنگنێکی سوور هەوای داپۆشیبوو، رەنگی دیوارەکان و رەنگی دار و بەرد و هەموو دنیای گۆڕیبوو سەر خۆی، بەپەلە گوتی:

– دەبێ خێراتر برۆی خێراتر..بەجێدەمێنی.

هێڵەکانی دواتری ئەو لاپەڕەیە وەک سووتابن ڕەش ببوون یان ڕوابوون.

کاکۆی ژەنیاری مراد بەگ چاوەکانی خۆی دەدیت کەوتوونە سەر دەفتەرەکە، کەوتوونەتە ناو هێڵ و وشەکان. دەفتەرەکەی لە خۆی نزیک کردەوە بۆنی غوبار و غەریبی و یەعقوبی لێدەهات، بۆنی سووتان و دەروێش زێنەدین و ماڵێکی چۆڵ و کۆنی لێدەهات.

کاکۆ بەبارگرانی بۆنی چەرمی دەفتەرەکە خەوتبۆوە کە ئیدی ئەو چەرمە بەرگێک نەبوو، تا ئێستا ئەو چەرمە دەروازەی شارێک، مەملەکەتێک بوو جەنگی تێدا ڕاگەیەنرابوو، جەنگێک تەواوی هەناسە و بوونیانی گرتۆتەوە. کاکۆ لە ژێر قورسایی دەفتەرەکەنا، قورسایی شەڕێک کەس نەیدەزانی لەکوێی مێژووە و دێت کەوتبوو سەرچاوەکانی. لەو یارییە بێ بەهرەو سەر شێتانەی ئینسانەکان سەرسام و شەرمەزاربوو.

ئەو شەوە زۆر بیری لەوانەکانی سروشتناسی زانکۆکەی کردەوە، بیری لە مامۆستا دیورانت کردەوە و ئەو مامۆستا سروشتناسە دەیویست پەیوەندی نێوان زانستی زەویناسی و ئینساناسی ئاشکرا بکات، پێکهاتەی چینەکانیان، لێکچوونیان بدۆزێتەوە. ئەو لەو باوەڕەدابوو کە مرۆڤ بابەتێکی سروشتییە وەک درەخت و باڵندە لاق سوور و مێرووله زەرد و فلامینکۆی بن باڵ سوور. سیفاتەکانی ئەوان چۆن ئاشکراو دیارن هی مرۆڤیش بە هەمان شێوە، بەڵام هەوڵی شاردنەوەیان دەدات و ئەوان نا. هەموویان دەم و دەندوکێکیان هەیە بۆ خوێندن و خواردن و گۆرانی گوتن، چاو بۆ بینین و دەست و باڵ بۆ فڕین و لووت بۆ بۆنکردن و جەستەیەک بۆ سەما، شتێک بۆ خۆشنوودی و شتێک بۆ زاوزێ. بەڵام کاکۆ یەک تاکە تێبینی هەبوو ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئەو لێکدانەوانە مرۆڤ دەیانکات و جگە لە مرۆڤ زیندەوەرێکی دیکە نییە لەسەر مرۆڤ قسە بکات، بۆیە نهێنی مرۆڤ هەرگیز ئاشکرانابێت.

## خائین

لاپەڕە سێزدەی دەفتەرەکە لاپەڕەیەکی پڕ و تاڕادەیەک بەترس بوو، لەسەری سەرەوە چەند پیتێکی لاتینی بە قەڵەمێکی چەور نووسرابوو، کە هەندێ تۆز و چڵکیشیان گرتبوو. هەر لەژێرییەوە بە خەتێکی جیاواز و تازەتر نووسرابوو «ترس» دیار بوو ئەو وشەیە زۆر دواتر نووسراوە. یەکەم دێڕ بە وشەی یەعقوب دەستی پێدەکرد، کە تاڕادەیەک خوار و ناڕێک بوو، دواتر دووبارە بە هەمان ریتمی لاپەڕەکانی دیکە نووسرابوو:

«یەعقوب دەبێ لەکوێ بشارمەوە، داوا لە خودا دەکەم سینگم بکاتە بەرد و هیچ زەبرێک نەگاتە یەعقوب، دەروێش زێنەدینی ریش سوور دەڵێ:

– دەبێ بگەینە ئەوان، رێگایان داوە کاروانێک لە شار بچێتەدەر.

لە خۆم دەپرسم بۆ کوێ؟ کام کاروان؟ کێ رێگای ئەو کاروانەی داوە؟

چەند کەسێک رێگامان پێدەگرن، سەگێکی سپی گەورە وەک تیر بەرەو من دێت، خودایە ئەوە سەگەکەی خۆمانە، ئەو سەیرم دەکات، چاوەکانی چەند پڕ پرسیارو خۆشەویستین. زەبرێکی پێدەکەوێ و دەکەوێ. دەستێک لە دار و تەختەباسکی من دەگرێت وەک گرمەو هاڕە دەڵێت:

– ئەو کچە بۆ کۆێ دەبەیت دەروێشی خائین؟

دەروێش دەڵێت:

- لێمان دووركەونەوە، ئەو ژنە بەرەڵاكەن رێگای دراوە بڕوات.

نوور عومەر رووی لەسەردەستەكەیان كرد گوتی:

- رەحمەتوڵا ئۆغڵو تەنها من دەتوانم رێگای ئەو ژنەبدەم، چونكە ئەوە ژنی منە.

كابرای كە دەستی منی گرتبوو، رەحمەتوڵا ئۆغڵو، بەهەیكەل و سینگ پان و دڕندە، پاڵێكی توندی بەدەروێشەوە نا، بە دیوارەكەی دادا، دەروێش تەنها گوتی:

- خوا نەناسینە!

خەنجەری لە پشتێنی پیاوێك كە لە تەنیشتییەوە بوو دەركێشاو خستییە سەر ملی و هاواریكرد:

- بەریدەن، ئەو ژنە بەردەن دەنا قوڕقوڕاگەی هەڵدەبڕم.

منیان بەردا، گوتی:

- تادەتوانی راكە، لەوسەری شار دەگەیە كاروانی ئەرمەنییەكان، غاردە لەگەڵ ئەوان بڕۆ، ئاوڕنەدەیەوە.

من ترسام و لەرزیم، یەعقوبم توند بەخۆمەوە كوشی، نازانم ئەو دەروێشە چۆن هێندە بە حەسرەت و هێمن و شەرمن تەماشای دەكردم، ویستم بمێنمەوە، ئەو هاواری كرد:

- خێرا لەو شارە مەمێنە.

دەترسام من راكەم و ئەو بكوژن، منیش بەو جەستە بێ هێزەمەوە بگرنەوە، بەڵام هەر غارم دا، تاتوانیم غارم دا، گوێم لە هاوار و سەداو لێدان بوو لە دوامەوە. كۆڵانەكە باریك و تا ئاسمان دیوار بەرز، من پێخواس بووم، لە پڕ كەوتم و یەعقوبم لە دەست پەڕی، گریام گریام لەو چاوترووكانە هێندەی ساڵێك گریام، یەعقوبم هەڵگرتەوە، ئاوڕم دایەوە، لە دوور منارەكانی كەنیسەی ئایە سۆفیام لێ دیار بوو، نزام كرد و گوتم،

- یەعقوب هی خۆتە.

## پایتەخت

رۆژی دواتر کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ لەگەڵ ورشەی ئاوازێکی باریک و ناسک بەئاگاهات، ناز جەواهێرخان لە ژوورەکە دەهات و دەچوو، هەستی بە جووڵەی کاکۆ کرد و لەبەر خۆیەوە بە هێواشی گوتی:

– تا کەنگێ دەنووی؟ ئەو بەفرەی لەگەڵ خۆت هێناوە ئەوە خەریکە خۆش دەکاتەوە؟

کاکۆ سەری بەرزکردەوە و زەردەیەکی هاتێ و هەستی کرد دەموچاوی گەشبۆتەوە و هەر وەک سروشت ئیدی شەختە و بەستەڵەکەکەی دوێنێ لە رووی دا نەماوە. لە پەنجەرەکەوە روانییە دەرێ، هەتاو، هەتاوی هەموو دنیا رژابووە سەر بەفرەکە، لە دڵی خۆیدا و بەنووزەوە گوتی:

– رۆژهەڵات، ئێرە پایتەختی خۆرە.

وای هاتەبەرچاو هەزاران کچ و کوڕی تازە پێگەیشتوو، بە جلی پڕ رەنگەوە تا سەر چیاکە، بەڕیز و بەئەنداز وەستاون و لە دەفرێکی بێ وێنەو و نەبینراودا تیشکی خۆر لەسەر لووتکەی شاخەکەوە هەڵدەهێنجن و دەیدەنە دەستی یەکتر. هەروا بێدەنگ بە

خۆی گوت:

– ئەوە چ نمایشێکە!!

تەنها تاقە کچێکیان بەخۆی و کراسێکی درێژەوە کە تەواوی دەشتەکەی داپۆشیوە، دەست بۆ بن دار و هێلانەکان دەبات و باڵندەی بچووک و جیاجیاو رەنگاورەنگ دەردەهێنێ کە سەرما کەسیرەی کردوون وخوێنی وەستاندوون، تەنها فوویەکیان لێدەکات و باڵندەی خۆشبەخت جیکەیەک دەکات و پەڕەکانی دەتەکێنێ و دەداتە شەقەی باڵ.

دیسانەوە کاکۆ لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

– باڵندەی تۆس.

وەختێک تەماشادەکات باڵندەکان لە بەفرەکە دادێن، دیسانەوە دەڵێت:

– باڵندەی تۆس تەنها و تەنها بە ئاوی رووح دەژی.

دیسانەوە گوتی:

– باڵندەی تۆس لەگەڵ خۆتم بەرە.

بێ ئەوەی بزانێ لەگەڵ چ باڵندە یەکیەتی.

کچەی کراسەکەی بە هەموو دەشتەکەدا بڵاوبۆوە و یەکە یەکە باڵندە و تەیرەکانی دەدۆزییەوە و دەیخستنە سەر بەرە دەستی، بە هەناسەیەک لە بخوورەکانی بەهەشتەوەی هێنابێ فوویەکی لێدەکردن و ئەوان ئەو تەیرە بچووک و بێهێز و خاکەڕایانە وەک لە نووزە خەوێکدابن، جیکەیەک دەکەن، باڵەکانیان لێک دەدەن و دەفڕن، بە ناو هەوا یەکدا دەفڕن سیخناخە لە تیشک.

کاکۆ هەر لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

– کوا، کوا پیری ئیمانداری پەرستگاکەی سان جۆلیۆس ئەندریاس، بە چ رەنگ و ئیمان و خەیاڵێک شێوەی، شێوەیەکی کاڵ و دووری باڵندەی تۆس دەکێشێ.

هەر لەو لەحزەیەدا کاکۆ دەڕوانێ، ئەوە کچەی کراس درێژ تەنها لێوەکانی دیارن، بەلێوە پەمەییەکانی فوویەکی درێژ و ناسک لە درەختەکان دەکات و سەدان باڵندە

ویکڕا لە ناو لق و پۆپی دارەکانەوە دەدەنە شەقەی باڵ و تیشکێکی ئاڵتوونی دەڕژێتە سەرپشتیان.

ناز جەواهێرخان لە پشتییەوە دەڕوانێتە دیمەنەکە و ئەو هەموو باڵندەی بە هەوا وەربوون، دەڕوانێتە لێوی کچەکە ئەو دەمەی لە راستی دارەکان فوویەکی ناسک و پڕ بخوور دەکات. کاکۆ نایەوێ ئاوڕداتەوەو بشڵەژێ، دەشیەوێ لە شوێنی خۆیەوە بپرسێ داخۆ بای بەهەشت یان سیحربانوو لەگەڵ هەموو میوانەکان هێندە دوورە پەرێزە؟ بە پێچەوانەی بیرکردنەوەکانی ئاوڕدەداتەوە وەک ئاشنایەکی لە مێژینە دەڕوانێتە ناز جواهێرخان و دەڵێت:

– بەفرەکە بچێتەوە ئەو دەشتە هەمووی دەبێتە گوڵە سوڵتانی؟

ناز جەواهێرخان دەڵێت:

– ئەو ساڵ گوڵێک، یەک تاقە گوڵە سوڵتانی هەموو دەشتەکە دادەپۆشێ.

تا ئەو کاتە ئاسمان پڕ پڕ ببوو لە باڵندەی تۆس، ئاساوارێک لە کچەی کراس درێژ نەماوە. کێ بەکاکۆی گوتبوو ئەوانە باڵندەی تۆسن، باڵندەی تۆس لەسەر دەمێکدا سەریان لە کەنیسەی سان ئەندریاس داوە، تاکە نیشانەو ئاساواری ئەو باڵندانە تەنها وێنەکەی ئەو پیری موغانەیە کە ماوەتەوە، ئاە ئێرە و کەنیسەی سان ئەندریاس چەند لێک دوورن، قەشە جۆلیۆس دەبا هاتبا ئێرە، لێرە لەو دەشتە ئەو هەموو باڵندەی دیبا هەرگیز نەدەگەڕایەوە.

هەر لە خۆیەوە هەستی بەدڵشکانێکی قووڵ کرد، دڵشکانێک هەرگیز چاک نەبێتەوە، یان کەسێک دەربەست نەبێت ئەو شوێنە شکاوە ببینێت تەنانەت بۆ خۆشی نەیدەویست ئەو برینە قووڵە بەسەرکاتەوە. برینێک کە بۆشاییەکی سارد و سڕ و نادیاری لە ژیانیدا دروست کردووە.

تا ئەو کاتە نازجەواهێرخان بێدەنگ وەستا بوو، کاکۆ ئاوڕێکی دایەوەو گوتی:

– دەچم دەپرسم سەرچاوەی ئاوی ئەو دێیە لە کوێیە، ئیدی ناچارت ناکەم شوێنی کارێزی هەزار دەریام پێ بڵێی.

ناز جەواهێرخان زۆر بەگاڵتە و گوتی:

– لەو پیاوە بپرسە لە سەید حوسێنی جیهانگیر لە هەموو کەس شارەزاترە، ئەدی ئەو نەیبردبووی بۆ ئەوێ؟

کاکۆ لەو کاتەوەی سەید حوسێن بۆ گەشتە پڕ نهێنییەکەی بردبوو، نەیوێرابوو سەیری وێنەکەی بکاتەوە، ئێستا وێنەکە بزەیەکی زۆر نهێنی و دۆستانەی پێوە دیار بوو، نهێنی گەشتەکەو ئەو هەموو خەڵک و دیمەنانەی دیبوویان. هەتا گوێی لە دەنگی تەسبیحە کارەباییەکەی دەستی بوو. دەیویست سۆراغی سندووقە بچووکەکەی فیلمەکەی لێبکات. لە ناکاو گوتی:

– لەو ناپرسم، لەو نزیکتر لە من ئێستا تۆی، تۆ پێمبڵێ.

ناز جەواهیرخان زۆر دۆستانە گوتی:

– باوەڕ بەمن ناکەی، بڕۆ هەموو گوند بگەڕێ، کەس ئەو ناوەی هەر نەبیستووە، مەگەر لە حیکایەتی ئەو ژنە سیحربازانەدا بێت بە خەرەکێکی شکاوەوە شارەکانی ژێر زەوی و ناو هەورەکان دەگەڕێن.

کاکۆ پێکەنی و هەموو ئەو حیکایەتە سەیرانەی بیرکەوتەوە باوکی بۆی گێڕابۆوە، وادەهاتە بەرچاوی کە هەموو دەمێ پیرێژنێک بەخەرەکێکەوە بەسەر ئاسمانی ئەم وڵاتەدا دەگەڕێ و تەون بۆ جادوو دەڕێسێ. جاگوتی:

– باشتر من ژنێکی سیحربازم دەوێت لەگەڵ خۆی سواری خەرەکێکم کات لەو خەرەکانەی هەرگیز نانیشنەوە، لەوە خۆشتر هەیە، بە خەرەکێک هەموو شارەکان و ناو هەوریش بگەڕێی؟

نازجەواهێرخان قسەکانی پێخۆش بوو دەمەدەمێکە دەشێ کەس تێیدا مەبەست نەبێت و ئاراستەکەی هەر کاتێ بتەوێ بیگۆڕی، بۆیە گوتی:

– ئەو پیرێژنە سیحربازانە هەمیشە ترسناکن، گەشتەکەیان، شوێنەکانی بۆی دەچن، بەتایبەتی بۆو کەسانەی لەگەڵیانن.

کاکۆ بەپەلەو راستەوخۆ گوتی:

– من ئەو ترسناکییەم دەوێت، کەسێک شوێنی ئەسپی بارانم پێ بڵێ، پێم بڵێ کچی شای پەریان لەکوێ بەندە، بای بەهەشت لە چ کوولەکەیەکدا بەندکراوە با ئەو کوولەکەیە بە شاخی دێوی رەشەوە بێ. با ژنێک لەو سیحربازانە پێمبڵێ شمشاڵی چلئاواز لە کوێیە با وەک ملوانکە بە گەردنی ئەژدیهای حەوت سەرەوە بێت.

ناز جەواهێرخان کە لە نهێنی حیکایەتەکان و مەبەستی کاکۆش حاڵی بوو، گوتی:

– ئەو پیرێژنانە تەنها ئەفسانەن، تەنها بەقسە نهێنییەکەت پێدەڵێن، ئەویش بەفێڵ و سیحرو جادوو، دەتبەنە ناو دۆزەخ و وادەزانی بای بەهەشت هەڵیگرتووی، دەتخەنە باوەشی ئەژدیهاوە و وادەزانی لەسەر قژی بای بەهەشت راکشاوی. دەترسم پاڵەوانەکەی ئێمەش لەوێ بگیرێ و بکرێتە تەیرێکی بچووک یان هەر لەوێ بکرێتە بەردێک یان کۆلکە دارێک.

کاکۆ تەواو وەک پاڵەوانێکی راستەقینە کە دوای زەمەنێکی درێژی بەندایەتی تازە لە حیکایەتێکی باوکیدا هاتبێتەدەر، دەڵێ:

– هەموو پاڵەوانەکان دەست و پێ سپی بوون، ئەوە تەنها پیرێژن و سیحربازەکان بوون کەڵکەڵەی نەمری و رزگارکردنی کچی شای پەریانی دەخستە مێشکی پاڵەوانەکانەوە.

هەر ئەوان و پیرێژنە سیحربازەکان دەیانزانی ئەسپی باران هەیە و دێوی رەش کچی شای پەریانی بەندکردووە، ئەژدیهای حەوت سەر بەری ئاوی شاری گرتووە، هەر ئەوان دەیانزانی ئەو ئەژدیهایە بەشمشێری ئەڵماس نەبێ ناکوژرێ. هەر ئەوان بوون ئیلهامیان بۆ دەهات و زانیاریان دەدایە هەمووان لە کۆتاییشدا کێ زیاتر گوێی لێگرتبان ئەو دەیبردەوە.

ئێستا با یەکێک لەو ژنە سیحرباز و پڕ زانستانە پێم بڵێ ئەشکەوتی هەزار دەریا لە کوێیە؟ باپێمبڵێ بای بەهەشت لە کوێ خۆی شاردۆتەوە؟ جا با من هەر لێرە لەبەردەم ئەو پەنجەرەیە ببمە بەرد، با ببمە تەیرێکی بچووک، باببمە کانییەک میوانەکانتان لاقیانم تێدا بشۆن و دەستنوێژم لەسەر هەڵگرن.

## دەرمان

ناز جەواهێرخان نەیدەزانی بۆچی هێندە قووڵ و ئاشکراو بێپەروا چۆتە ناو دنیای میوانێکی چەند رۆژەوە، نەیدەزانی ئەو میوانە بێ ئەزموون و ناکامڵە چۆن هێندە خێرا چۆتە ناو ژیانییەوە، بەڵام دیسانەوە دەویست دۆستانەو خۆشەویستانە لەگەڵی بدوێ، زۆر ئاشنایانە گوتی:

– لە گوندی ئێمەدا پێویستت بە پیرێژنی سیحرباز و خەرەک و ئاین و ئۆینەکانی نابێ، پەرییەکانی گوندەکەی ئێمە فڕێنراون بۆ ژێر زەوی، بەڵام ژێر زەوی ئەوان نەشارە و نە دوکان و بازاڕی لێیەو نەهیچ ئەوان بەڕیز و بەجلی خۆیانەوە لە ژێرخاک نراون، خەرەکی هیچ پیرێژنێک ئەوانی پێنایەتەوە و دەرمانی ژیان و نەمریش ئەوان زیندوو ناکاتەوە.

هیچ سیحربازێک کارێزی هەزار دەریای پێ نابینرێتەوە، ئاوی ئەو گوندەش لە بیرێکی ئەو دیو ئەو رێگایەوە دێت کە تۆ پێی داهاتی.

کاکۆ وەک فریادرەسێکی بیرکەوتبێتەوە گوتی:

– ئەدی منداڵەکانی مەلا یارۆ وشکە، منداڵەکانی مەلا یارۆ وشکە ناتوانن یارمەتیم

بدەن؟

– ئەو پیرە پیاوە نابینایە لە تاریکیدا دەژی، ئەویش تەنها بریسکەی چاوەکانی، ئەو بێگۆڕ و بێ شوێنەوارە، دەشێ تۆ مەبەستت کوڕەکە بێت.

کاکۆ هەستی نەدەکرد مەلا یارۆ وشکە مردبێ، یان لە قوولایی ئەشکەوتەکە بەجێمابێ، ئەگەر واشبێت دەبێ کوڕەکانی ئەو شوێنە پێ بزانن.

– وابزانە مەلا یارۆ وشکە لەو دیو ئەو وێنەوەیە، مەلا یارۆ لە ناو سێبەری تۆخ و دوور و درێژی شەرەفەدینەوەیە. ئەو پیاوە بێگۆڕ و بێشوێنەوارە. منداڵەکانی مریەم، هاجەر، نادر بەگ و پوورە خورجین لەو ساڵانەدا بە هۆی خزمەکانی شێلە ئۆنانەوە رۆیشتن و سۆراغیان نەماوە.

## ئەنفال

دەنگی شەرەفەدینی چاو بەخوێن و کەسێکی دیکە هاتە ژوور، کاکۆ خەریکی خۆ پۆشتەکردنەوە بوو، شەرەفەدین بەکابرای دەگوت:

– ماڵی خۆیەتی تازە نسیبی هاتۆتە ئێرە.

شوفێری باڵابەرز و چاوشین و بەتەمەن، هاتبوو ژووری و دەیگوت:

– پیاوی باش من بۆ چەند دەقیقەیەک لەسەر ئەو رێگایە جێم هێشتی ئەوە چەند رۆژە لێرە پاڵت داوەتەوە.

کاکۆ ئاشنا و شەرمنانە گوتی:

– دەبوو تۆ جێم هێڵی و من بێمە ئێرە (بەپێکەنینەوە) دیارە سەفەرەکەم هەر بۆ ئێرە بووە و بۆ خۆم نەمزانیوە.

دانیشتن، کاکۆ جانتاکەی پێچایەوە، بێ ئەوەی سەرنجی کەس راکێشێ جارێکی دیکە ورد بە سەری پەنجەکانی لە ناویدا گەڕا، ئیدی دەفتەرە بەرگ چەرمەکەی نەدەشاردەوە، بەڵام لە تەنیشتەوە لە گیرفانێکی تایبەتی دانابوو، ئەلبوومێکی بچووکی دەرهێناو بۆ ناز

جەواهێرخانی راگرت و گوتی:

– ئەوەش خانەوادەکەی من، بیانبینە.

ئەو بە وردی دەیڕوانییە وێنەکان، شەرەفەدین بە کاکۆی گوت:

– بە دڵی من دەکەی ئەم رۆژ مەڕۆ، نەهاتوویەوە سەر خۆت، برایمە سوور هەر هاتووە چاوی پێت بکەوێ.

کاکۆ بە فورسەتی زانی و گوتی:

– ئەگەر بەڵێن بدەی لە گوندا بمگێڕی و هەموو شوێنێکم پێ بناسێنی دەمێنمەوە.

ناز جەواهێرخان دەیڕوانییە وێنەکان، کاکۆ دەیگوت:

– ئەو پیاوە پاڵتۆ درێژە بابمە، ئەو ژنەش داکمە. ئەو رۆژە بوو بۆ یەکەم جار چوومە زانکۆ ئەو کوڕە ناشیرنەش منم.

ناز جەواهێرخان هەر لەبەر خۆیەوە گوتی:

– ئێرە کوێیە؟ بۆ وا خۆشە؟ تەماشە، ئەوەش دایکتە، ئەی خودایە چەند جوانە! لە تۆ گەنجترە.

کاکۆ گوتی:

– من بۆ پیری چوومەوە سەر بابم، هەر بەپیری لە دایک بووم.

هەمووان پێکەنین، دواتر پێکەوە چوونە دەرێ، ناز جەواهێرخان ئەلبوومەکەی لەسەر لێواری پەنجەرەکە دانا. بەدێدا گەڕان، کاکۆ و شەرەفەدین، بەفر هەموو کێوەکانی داپۆشیبوو، رۆژێکی خۆش بوو، هەتاو لە هەموو شوێنێک دەرژا، خەڵکیان زۆر دی و زۆریان قسە بۆ کرد، کاکۆ بە دوای یەک باسدا دەگەڕا بۆیە بێ پێشەکی گوتی:

– گۆڕستانی دێ لە کوێیە؟

ئەو گوتی:

– قەبرستان! بەسەر ئەو گردەوەیە، ئەو دار قەزوانە دەبینی، باپیرم سەید حوسێنی جیهانگیر لەبن ئەو دارەیە.

ئەو راچڵەکی!

– کێ؟ سەید حوسێن. ئەوەی وێنەکەی بە دیوارەیە؟

ئەو هیچی نەگوت، هەر هیچ، تەنها خاڵە سوورەکەی خوار چاوی سوورتر بوو وەک ئەوەی خوێنی تازەی تێزابێ.

چوونە ناو گورستانەکە، بەفری سەر سینگی گۆڕەکان زیاتر توابۆوە بە هۆی گەرمی سینگیانەوە.

لە پشت سەری گۆڕەکەی سەید حوسێن کێلێکی بڵند و پان هەبوو، لە بەردێکی شینباوی لووس، نەخش و نیگارێک لەسەری هەڵکەندرابوو، بەڵام تەنها وشەی جیهانگیر دەخوێندرایەوە، کاکۆ تەنها دەیەویست لەو واسواسییەی دڵی داگیرکردووە خۆی بدزێتەوە بۆیە گوتی:

– ژیان تەنها لە گۆڕستاندا ئارامە.

زانی نەدەبوو بڵێ ژیان، بۆیە گوتی:

– ئێرە ئارامە.

شەرەفەدین گوتی:

– بۆ سەید حوسێن نا، باوەڕناکەم بۆ شەوێک لەو ماڵە ئارامەی خۆیدا بێت، ئەو هەر لە سەفەر دایە.

کاکۆ ئەو رستەیەی بەلاوە سەیر نەبوو، ئا سەید حوسێن هەر لە سەفەر دایە، لە هەموو خەڵکی ئەو گوندە زیاتر هاتۆتە لای کاکۆ، بەڵام سەردانی مردوو چ جۆرە سەردانێکە! لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بە رواڵەت گوتی:

– سەفەری مردووەکان! زیاتر بۆ کوێیە؟

شەرەفەدین بێباکانە گوتی:

– ئەو وەک مردوویەک سەفەرناکات. بچێتە لای هەر کەس لەسەر باڵی خۆی دەیبات.

بۆ شوێنێک دەیبات کە خۆی دەیەوێ، بێگومان کەمن ئەوانەی ئەو دەچێتە لایان.

پێش ئەوەی کاکۆ پرسیارێکی کە بکات، ئەو دەستی بۆلایەکی دیکە درێژ کرد و گوتی:

– ئەوەش گۆڕی سوڵتان جیهانگیری برامە.

ئەو گۆڕەکەی نەدیت، دیتی پیاوێک لە زالکی کارێزێک لەسەر بەردێکی گەورە دانیشتووە و لاقی بۆ نێو ئاوەکە شۆڕبۆتەوە و لە شوێنێکی نادیاری جەستەیەوە خوێن دەڕژێتە ناو ئاوەکە وەک ڕەگە دەمارێک دەچێتە جەستەی خەڵک و خاکەکەوە. هەروا پرسی:

– دەمێکە لێرەیە؟ ئەو دەمێکە مردووە؟

ئەو گوتی:

– نەمردووە.

ویستی بڵێ کوژراوە، بەڵام نەیگوت.

هەر بۆ ئەوەی قسەی پێ بکات:

– دیارە چووە بۆ شەڕ.

ئەو گوتی:

– شەڕ کە نا.

دیسانەوە بێدەنگ بۆوە.

ئەو پیاوە کەمتر لە کێڵە بەردەکانی جیهانگیر قسەی دەکرد. دواتر بەرەو گۆڕەکەی سوڵتان جیهانگیری برای ڕۆیشت و تەماشایەکی گۆڕەکەی کرد و گوتی:

– ئەگەر سەبرکەی لە دوای چوونەوەی ئەو بەفرە جیهانگیر دێتەوە.

ئێستا کاکۆ ئاشکراو روون دەیبینی ئەو مرۆڤانە ئاسایی نین، تەنها ئەوە جەستەیانە تەسلیمی ژیانی رۆژانە و سروشتی بووە دەنا بۆ خۆیان خەریکی جۆرە ژیانێکی دیکەن، ئەوەش بیردۆزەکەی مامۆستا دیۆرانتی دەخستە ژێر گومانەوە کە ئینسانەکانی وەک بەشێک لە پێکهاتە سروشتییەکان سەیر دەکرد، لە پێکهاتەی بەرد و مرۆڤ وەک یەک دەدوا. بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

– سوڵتان بەگ دێتەوە؟

ئەو بێ ئەوەی سەرنجی کاکۆ و پرسیارەکانی بدات گوتی:

– سوڵتانی برام هەموو ساڵێک دەگەڕێتەوە.

کاکۆ روانییە دووکەڵکێشی سەربانیماڵەکان، زانی هەناسەی خەڵکی ئەو دێیە بچووک و سەرسنوورە وەک دووکەڵی سۆباکانیان بە دنیادا بڵاودەبێتەوە، ئەوەشی زانی کە خەڵکی ئەو گوندە تەنها لەو ماڵە بچووکانەدا ناژین.

لە لایەکی دیکەوە کۆمەڵە گۆڕێکی کۆن و جیاواز و تاڕادەیەک تەخت بوو، کە بە ئاستەم شوێنیان لەسەر زەوییەکە دیار بوو سەرنجی کاکۆیان راکێشا. شەرەفەدین گوتی:

– ئەوەش گۆڕستانی جوولەکەکان. دەمێکە کەسی لێ نەنێژراوە، بەڵام ئێمە بەهاران سەردانیان دەکەین، ئیدی ئەو رۆحە کەساسانە زۆر تەنهان.

گۆڕێکی بەتاڵ و سەردانەپۆشراوکە تاڕادەیەک پڕیش ببۆوە لە نێوان گۆڕستانی جوولەکەکان و موسڵمانەکان دیار بوو، شەرەفەدین کە زانی کاکۆ تەماشای دەکات، گوتی:

– ئەوە گۆڕی بەتاڵی مەلا یارۆ وشکەیە.

کاکۆ پرسی:

– مەلا یارۆ وشکە؟

شەرەفەدین غەمگینانە گوتی:

– ئەو پیاوە بۆ تاکە رۆژێک نەهاتە ناو گۆڕەکەی.

کاکۆ چاوی لە گۆڕەکە بڕیبوو، پرسی:

– ئەدی لە کوێیە؟

شەرەفەدین یەک هەنگاو لە خۆی جیابۆوە، پەژموردە و دڵشکاو لەولای خۆیەوە وەستابوو، گوتی:

– کەس نازانێ.

نەیدەویست وابڵێ، حەزی دەکرد بڵێ:

– من دەزانم. خەڵکی هەموو دەزانن، دەیبینین، هەمووماں لە قووڵایی تاریکیدا، لە

تەنگەنەفەسی و نەهامەتیدا، لەو پەڕی، لەوپەڕی خۆشنوودیدا دەیبینین

بەڵام ئەوانەی هیچ نەگوت. کاکۆ لەوە ئازایانەترکە لە خۆی چاوەڕێ دەکرد، دیسانەوە پرسی:

– لە کوێ مرد؟

شەرەفەدین بە هەمان سیما و دەنگی شکاوییەوە ویستی بڵێ:

– لە ناو ئەشکەوتەکە نەهاتەوەدەر، ئەو بەدوامەوە، نا..تاوێنەکەمان دۆزییەوە من بەدوایەوە بووم، چۆن گەیشتبومە پێش ئەو.. چۆن ئەوم لا ون بوو، چۆن نەهاتەوە.. نازانم...

بەڵام هیچی نەگوت هەر هیچ، تەنها ئەوەندە:

– لە کوێ مرد؟

ئەو پرسیارەی لە قووڵایی خۆیدا دووبارەکردەوە.

کاکۆ هەستی کردبوو شەرەفەدین، ئەو شەرەفەدینەی کە راستییە هەنگاوێک دوور لەو شەرەفەدینەوە وەستاوە کە قسەی بۆ دەکات، وردتر لێی روانی و پرسییەوە:

– کەسی لەگەڵ نەبوو؟ مەلا یارۆ وشکە کەسی لەگەڵ نەبوو؟

شەرەفەدین کە توانی بووی خۆی کۆکاتەوە، گوتی:

– ئەو پیاوە ئەو دێیەی کڕییەوە، ئەو دێیە لەسەر تەمەنی ئەو بنیادنراوەتەوە. ئەو جارێک بووە خەلفەی وەستا شێلەئۆنان، کە ئێستا گۆڕی داک و بابی لەو گۆڕستانەدان و گوێشیان لە قسەکانمان گرتووە، ئاویان بۆ و گوندە پەیداکردووە و خەڵکیان ژیاندۆتەوە، جارێکی دیکە خۆی فیداکرد. خەڵک دووجار قەرزداری ئەو پیاوەن من سەد جار.

کاکۆ چیدی نەیتوانی ئارام بگرێ و گوتی:

– قەدەر منی هێناوەتە ماڵەکەی تۆ، پێمبڵێ چۆن ئاوی بۆ گوندەکەی تۆ هێنا، پێمبڵێ ئەشکەوتی هەزار دەریا لە کوێیە؟

شەرەفەدین بە توندییەک کە دەمێک بوو شاردبوویەوە، گوتی:

– کێ؟ ناز جەواهێرخان هەموو ئەو شتانەی پێ گوتووی؟ بۆ لە من دەپرسی، تۆ

هەموو شتێ دەزانی. ئەو ژنە لە سندووقی شووشە بەندی کەی قسەی خۆی دەکات. ئەو پێی گوتی مەلا یارۆ وشکە لەکوێ ون بووە؟ ئەو گوتی سوڵتان چی بەسەرهات و ئەسپی سوور چۆن کوژرا؟ خۆ نەیگوت تائێستا گوێی لە دەنگی حیلەی ئەو ئەسپەیە؟ خۆ نەیگوت لە هەموو تەنگانەیەکدا سوڵتان بە سواری ئەسپەکەیەوە بە دەوری دێدا دەسووڕێتەوە؟ خۆ نەیگوت بۆ ئێمە ئاوی ئەو گوندە پڕ خوێنە.

ئەوجار وەک ئەوەی بۆ خۆی قسە بکات:

– ئەو ژنە لەگەڵ حیکایەتەکانی لە بنی دەریا و لە سندووقی شووشەدا بەندی کەم و دێوی رەش بکەمە پاسەوانی هەرگیز واز لەو حیکایەت گێڕانەوەی ناهێنێ. نا واز ناهێنێ هەر بە سیحر و جادوو دێوی رەش خەولێ دەخات و بەباڵی ماسییەکدا دەگەڕێتەوە ماڵێ و هەرکەس لەوێ بێت و هەرکەس ببینێ حیکایەتی نەبڕاوەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە.

کاکۆ هیچی نەگوت، ئەو منداڵێکی ئەوروپایی هیچ نەزان، چاوی زەق ببۆوە و پێستی سپی ببوو.

شەرەفەدین هاتەوە سەرخۆی و لە مەترسی تەندروستی ئەو کوڕیژگە غەریبە گەیشت، هەوڵی دا لەو هەموو پەلە پەلەو هەڵەشەییە رزگاری بێت، بە جۆرێک لە موحیبەت رووی تێکرد:

– میوانی ئازیز دڵگران مەبە، هەموو ئەو قسانەی بۆیان کردووی حیکایەتن، گوێیان مەدەیە، منیش لە سەر خۆم نەبووم، ناز جەواهێرخان قسە خۆشترین ژنی دنیایە، با بۆ خۆی هەر حیکایەت بگێڕێتەوەو تۆش هەر گوێ بگرە، بەڵام بزانە ئەوانە هەر هەموویان تەنها قسەن.

کاکۆ سارد لە بەفرەکە ساردتر، گوتی:

– من بۆ خۆم چووم، چووم و هەموو پێچوپەنای ئەشکەوتەکەم دیت. باران بەسەرماندا باری و تەنگەنەفەس بووین، ریزی دوور و درێژی ژن و پیاوە دەست و پێ کۆتکراوەکانم دیت، ئاسنگەر و کۆتشکێن و پیری فریادڕەسم دیت. ئەو فریادرەسە دەستی بۆ درێژکردم و قسەی بۆ کردم من نەمناسی، لێی ترسام و دەستم لە دەستی

نەدا. لە پیاوە بەندەکان و ئاسینگەرەکە و بارانەکەش دەترسام. ناوێرم هیچ بڵێم، ناوێرم بڵێم من فڕیم، من باڵم نییە و نازانم بڵێم لەسەر باڵی کێ فڕیم، بەڵام بە راستی فڕیم نەک لە خەوندا، فڕیم بۆ ئەوەی بە دەروازەیەکدا تێپەڕم شانی چەپیان داغ کردم.

ئەوجار وەک کارێکتەری حیکایەتێک بێت، حیکایەتێک هەر بە راستی رووی دابێت، گوتی:

– من سواری ئەسپی سووربووم، بەسەر دەریاکاندا بازمدا، من هیچم نەدەزانی، ئەو بردمی، تۆ دەبێ کارەکەم بۆ تەواوکەی، ئەرکم لەسەر شانە و دەبێ بچم بۆ قووڵایی ئەشکەوتی هەزار دەریا، هەموو ئەو کەسانەی ون بوون، ئەوانەی بردیان و ئیدی هەرگیز نەگەڕانەوە، هەر هەموویان لەوێن، وەک باڵندەی تەڕ و تلیساو لەبن میچی ئەو ئەشکەوتەدا هەڵواسراون، تۆ دەبێ پێم بڵێی ئەو ئەشکەوتە لە کوێیە من دەبێ بۆی بچم، ئێوە هەمووتان دەزانن.

شەرەفەدین دەیدی ئەو کوڕە تا قسە دەکات سپیتر دەبێت لەگەڵ هەر سپی بوونێکیشی شتێک لە جەستەی دەتوێتەوە، چاوەکانی چەند قووڵ دەبن زیاتر دەدرەوشێنەوە، توند لە باوەشی کرد و گوتی:

– ئاسوودەبە هەموو شتێک بە دڵی تۆ دەبێ، تۆ نابێ جارێکی کە ئەو قسانە دووبارە کەیەوە، هەر ئەوەندەیە لەگەڵ کێ چووی؟ هەر ئەو ناز جەواهێرخان؟ سیحربانوو؟ کێ..؟

کاکۆ بەدەنگێکی پڕ، بەڵام پچڕ پچڕ گوتی:

– سەید حوسێنی جیهانگیر بردمی، ئەو بۆ خوی لە خەوی هەستاندم، بردمی، ئەو رێنمایی کردم، ئەو لە پێشمەوە بوو، من شوێن پێیەکانی ئەوم هەڵدەگرت، جگە لەو، جگە لەو هێزو سیحر و تۆفانە کەس ناتوانێ لە ئەشکەوتی هەزار دەریا رێکات و شوێن پێ جێهێڵێ.

شەرەفەدینی چاو بەخوێن نەیدەزانی ئەو کوڕە نیوە کورد و نیوە ئەرمەنییە، نیوە ئەنفال و نیوە قەتڵوعامە، نیوە رۆژهەڵات و نیوە ئەوروپاییە دۆستە یان دوژمن. ئارامییە

یان ئاژاوه. خۆشبەختییە یان نەهامەتی. دەستی لە دەستەکانی دەداو شانەکانی دەگرت و هەستی بە دەموچاوی دەکرد و چاوەڕێ بوو وەک تەیرێکی سووک و پەڕدار بداتە شەقەی باڵ، بداتە شەقەی باڵ و دوای خەیاڵ و هەورەکانی کەوێت. هەستی دەکرد هاکا لەگەڵ کڵۆ بەفرێک توایەوە و بە درزێکدا چووە ناو گۆڕەکەی سەید حوسێنی جیهانگیر. هاکا خۆی هەڵدایە ناو گۆڕە بەتاڵ و غەمگینەکەی مەلا یارۆ وشکە.

دەست و پێستی دەموچاوی کاکۆ ژەنیاری موراد بەگ لەو کێو و ناو بەفرە، لەو گوندە دوور و سەرگەردانەدا وەک ئاردت پێداکردبێ، یان خوێنی لەشی سپی هەڵگەڕابێ سپی سپی ببوو، شەرەفەدین دەترسا بکەوێت و لەگەڵ بەفرەکە لێی تێکەڵ بێت.

کاکۆش بێ ئەوەی ئاگای لە وەس وەسەی شەرەفەدین بێت، گەرم وگوڕ دەیگوت:

– من سەفەرم کرد سەیرترین و خۆشترین و پڕ ئەزموونترین سەفەری تەمەنمکرد. پێشتر هەموو ئەوروپا گەڕابووم، شارە هێمن و سارد و سندووقەکانیان، ماڵە بەئەنداز و سانتیمەترەکانیان. چووبووم بۆ ئەمریکا بەسەر دەریادا فڕیبووم، لەگەڵ هیۆژین چووبووم بۆ فیلندە و چووبوومە ناو ناخی بەستەڵەک. بە ناو هەورەکاندا ڕۆچوو بووم هەستم بەگەرمیان و ترسناکی بروسکەکەیان کردبوو. بەڵام هیچ کام لە سەفەرەکانم ئەوەندەی ئەو سەفەرەم پڕ نهێنی و پڕ ژیان و دەوڵەمەند نەبوو.

شەرەفەدین سەرسام و حەیران گوتی:

– کوڕم وەرەوە سەرخۆت، کام نهێنی و کام دەوڵەمەندی؟

کاکۆ بەردەوام بوو:

– سەید حوسێنی جیهانگیر بردمی، ویستم پێڵاوێک لە هەور بکڕم، گوتی تەمەنت بەشی چاوەڕوانی ئەو پێڵاوە ناکات، گوتی بەشی ئەو پێڵاوەناکات. جیهانگیر دەستی بەو پێیانەدا دێنان کە لە چاوەڕوانیدا بوون، ئەو پێیانە تەنها لە نوور بوون. ئەو گوتی ئەوە پێیەکانی ئەنفالن. ئەوە پێی ئەو کەسانەن جارێکی دیکە نەچوونەوە ناو خێزان و تازە بووکەکەیان لە باوەش نەکردەوە، پێی ئەو کەسانەن منداڵە نۆبەرەکەی خۆیان نەدیوە. هەرگیز نوقڵێک یان مەساسەیەکیان بۆ کچەکەیان نەهێناوەتەوە. جیهانگیر لەگەڵیان دەدوا

و من تەنها وەک وێنەیەک لەوێ بووم، دەبوو دوور بووەستم، دوور بوەستم و دەستم بە هیچ نەکەوێ، ئەوان ریشیان سوور سوور بوو، سەید حوسێنیش لەوێ ریشی سوور بوو. قژە سەریان سوور سوور بوو، سوورێکی گەش و ئاوی و پاک، من بەو رەنگە دیتمن، ئەوان لەریز دا وەستابوون، وەستابوون پێڵاوێک لە هەور بکڕن، تەواو لە هەور، سەید حوسێن نەیهێشت من بوەستم و گوتی:

– تەمەنی تۆ بەشی چاوەڕوانی ناکات. شەرەفەدین خانەخوێی ئازیزم، ئەو منی بردبوو. سەید حوسێنی جیهانگیر بۆ مردن منی بردبوو، بۆ ئەوەی بێمەوەو لەبەر دەم تۆدا بمرم و تۆش فڕێمدەیتە ناو ئەو گۆڕەی مەلا یارۆ وشکە، ئەو کەس نایناسێ، وەک باڵندەیەکی تۆزێک لە پەپوولەیەکی بەهاران گەورەتر، بەڵام تەنکتر هەر لەوێ لەو ئەشکەوتەدا دێت و دەچێ، بەو بچووکییەی خۆیەوە ئایەت دەخوێنێ، هەموو ئەو ئایەتانەی لە باوکییەوە فێریان بووە، لەو ئەرمەنیانە فێریان بووە جیمس پۆڵ براون وێنەی گرتوون.

کاکۆ بەو ڕووە سپی و تەنک و بێ گیانەیەوە، خێرا دەدوا و قسەی دەکرد، شەرەفەدین دەیزانی ئەوەی بەو رۆحە باسی ئەنفال دەکات، وردە وردە بچووک دەبێتەوە بە ئەندازەی پەڕەیەکی مێش، بە ئەندازەی پەڕەی باڵندەیەکی یەک رۆژە، ئەو کەسە نامرێت و هەوا لەگەڵ خۆی دەبات.

شەرەفەدین دەڵێ:

– کاکۆ تۆ سەیری ئەو هەموو رەنگانەکە، بڕوانە کۆڵکەزێڕینە چۆن لەسەر بەفرەکەوە هەستاوەتە پێ.

کاکۆ وەختێک کەس نەیدەزانی سەیری کوێ دەکات گوتی:

– ئا..ئەویشم دیت، چووین..چووینە لای سوڵتانی رەنگەکان. ئا ئاو ڕەنگەکانی هەموو دنیا دابەش دەکات، مرواریەکی پێیە هەموو رەنگی دنیا لە مرواریەوە دێنەدەر، هەرکەس ئەو مرواییە زیندانی کات، لە دەستیدا بیگرێت و بیشارێتەوە ئیدی هەموو رەنگەکانی دنیا دەکوژێنەوەو ون دەبن. مرواریەکی هێندەی هێلکە بارۆکەیەک. تۆ دەبێ هەموو

ئەوانە بزانی بڵندی نوورم دیت، لە ژوور سەرمان دەفڕی و تیشکی دەهاویشت، تیشکی فوو لە ئاگرکردن، شەرەفەدینی چاو بەخوێن تۆ ئەو باڵندەت نەدیوە، کەسێکی نادیار، هێزێکی نەدیو فوو لە باڵەکانی دەکات و پەڕەکانی لێک بڵاودەبن وەک ئاگریان گرتبێ دەسووتێن.

کاکۆ لە ناخی خۆیدا هەوڵی دابوو باسی باڵندەی تۆس نەکات و کردبووی، شەرەفەدین چەندی بیستبوو، ئەو قەبرستانە چ ڕۆژێکی لە پێش بوو، شەرەفەدین حەزی دەکرد ئەو کوڕە غەریبە خەیاڵ بێت، لە دەستیدا بڕەوێتەوە، خەون بێت و کۆتایی بێت.

کاکۆ، وەک مێشکی بدرەوشێتەوە و دەنگێکی ئیلاهی لە ناویدا بدوێت گوتی:

– پیاوێکی باڵابەرزی سیسم دیت، بە چاوێکی قووڵی نابینایانەوە، بەڵام مەند، بە جیهانگیری گەورەی دەگوت:

– شەرەفەدینم ناردەوە باچەندی حەز لێیە بژیت.

سەید حوسێن بەکەلام و لێوێکی پڕ ستایش وەڵامی دایەوە:

– هەردووکتان ئازیزن، منیش لای تۆم هەڵبژاردووە.

ئەو گوتی:

– دەبوو ئەو بڕواتەوە.

سەید حوسێن دیسانەوە بە نەرمی گوتی:

– بەخزمانت شادبوویەوە؟

یارۆ پرسی:

– شادبووەمەوە؟

سەید گوتی:

– بەخزمانت؟

ماوەیەک بێدەنگ مایەوە جا گوتی:

– ئیدی تاریکی و ڕووناکی جیاوازییەکیان نەماوە بۆ چاوساغەکان.

خێراو بەپەلە ڕۆیشت و گوتی:

– دەڕۆم با دەریاکان ڕێگا ون نەکەن.

سەید حوسێن دەستی درێژکرد وەک بۆ سڵاو لە نیشتیمان یان تێپەڕینی تەرمی وڵات دەست ڕاگرێ دەستی بەرزکردەوە، لە سەر قۆڵ و پەنجەکانی، لەسەر شان و ئەنیشکی دەنیشتن، ئەو باڵندانە دەنیشتن پڕ پڕ پڕن لە ڕووناکی، لەو تەیرانەی هەمیشە بایەکی نەناسراو و نەدیتراو لە پەڕەکانیان دەدات و جگە لە ڕووناکی هیچ شتێک لەگەڵ خۆی نابات. سەید حوسێن وەک بە ناو دارستاندا هاوارکات بە دەنگێکی گڕی تەمەنەوە گوتی:

– تۆ دەبێ بگەڕێیتەوە، شەرەفەدین ترساوە و خوێن زاوەتە چاوی، دەبێ ئەو فرمێسکە خوێنینانەی بۆ بسڕی، وەرە ئەو منداڵە لەگەڵ خۆت بە رەوەو بڕۆوە، وەرە و ئەو تولفە بەرەوە ناو جێگاکەی خۆی لە ماڵی شەرەفەدین بەرەوە، بۆ فیلمەکەی برادەرە وێنە گرەکەمان هاتووە، من دەڕۆم بۆ سەر پشتی دەریاکان.

دەنگێک وەک لە نێوان هەزاران کەسەوە بێت گوتی:

– فیلمەکەی جیمس پۆڵ براون، ئەو پیاوە شێتە، هەر لە پشت سەری خۆتانەوەیە.

دوای تاوێک مەلا یارۆ وشکە بە هەمان دەنگی خۆیەوە، دەنگێک وەک هاوار لەو سەری دنیاوە دەهات:

– خواجا سەیدی هاوڕێم تۆ ئەوێت هەڵبژارد، تۆ سینگی دیوارەکان و بەرۆکی خەڵکت هەڵبژارد، تۆ شەڕی دەستەویەخەو ناو جامخانەت هەڵبژارد. تۆ خۆت ویستت ئەنفالەکان لەناو حیکایەتە پڕ مردنەکان و خوێن و خوڕیاندا ببینی، تۆ بۆ خۆت نەکەسێکی دیکە ویستت لە شوێن گوللەی سینگی لاوەکان هەڵقوڵێی، تۆ بۆ خۆت چوویتە گیانی ئەسپێکەوە و لە چاوی ئەوەوە ڕوانیتە سووتانی ماڵەکان و وێرانکردنی هێلانەی پۆڕەکانی دەوری دێ، تۆ بۆ خۆت لە شوێنی ئەو منداڵە ئەرمەنییەی نەتدەناسی نەبوویە هاوار و چریکە؟ تازە تۆ بگەڕێوە، ئیدی هەر تۆ دەتوانی سەیری چاوەکانی شەرەفەدین کەی لە کاتێکدا خوێنی تۆی پەڕیوەتە سەر ڕوومەت.

ئەوکاتەی مەلا هاواری دەکرد سەید حوسێن رووی نەدەبینرا، هەموو لەشی ببووە

هەزاران باڵندەی رووناکی، وەک هەموو لەشی بەپەڕ داپۆشرابێ و بایەکی نەبینراو هەڵیانداتەوە، هاواریکرد و گوتی:

– بۆ خاتری ئەو گۆڕەی باوکی شێلە ئۆنان بگەڕێوە، بۆ خاتری گۆڕە بەتاڵەکەی خۆت. بامن نەچمەوە، بامن نەگەڕێمەوە ئەو دۆزەخە، سینگی من بە بزمارێک، بە مێخێک لەوانەی عیسایان پێ لە خاچدا بە دیوارێکەوە داکوتراوە، ئەوە من نیم سەیری خوێن و خوڕی دنیا دەکەم، ئەوە دنیایە گاڵتە بەخوێن و خوڕی من دەکات، لەوێ نەسواری پشتی دەریا دەبم و نەشەپۆل هەڵم دەگرێ. لەوێ کەلایەکی مس دەچێتە قووڵایی دڵم کە نیوەی دنیا قورسە. باچیدی نەگەڕێمەوە دۆزەخ هاوڕێی دڵ رەقم.

ئیدی سەید وەک بفڕێت باڵەکانی لێک داو لەگەل وشەی دڵڕەق هەزاران باڵندە لەوانەی رووناکی لە سەر پشتیان و بن پەڕەکانیان بەرزدەبێتەوە دایانە شەقەی باڵ و خۆرێک بە ئەندازەی ئەو خۆرەی ئاسمان لەسەر جەستەی بەرزبۆوە، وشەی رق وەک ژەهر ئەو باڵندانەی تاراند. من، منی بێدەسەلات و مردەڵە چاوم نووقاند و کەوتم، هەر ئەوەندەم زانی سەید بە دەستێک لە تاریکی پێی چەپی گرتم و تا توانی هەڵیدامە سەر بەردێک، پێی گوتم:

– گورگی ئەوروپا چاومەنووقێنە دەنا بۆ ئەبەد ون دەبیت.

## منداڵ

شەرەفەدین وەک سێوێک خەریک بوو بۆگەنی دەکرد، سێوێک گازێکی لێگیرابێت، یان بۆگەنی خۆی دەگەیشتە بن لووتی، چ هەستێکی سەیر و بێ مانابوو، کوڕێکی کاڵ لە کاغەز تەنکتر، لەو بەفرە سووک و بێ بەرگتر. خەریکە هەموو نهێنییەکان، نهێنی ئەشکەوتی هەزار دەریاوە، نهێنی فڕینی باڵندە رووناکەکانی سەر جەستەی نەتەوەکەی، نهێنی گوڵەسوڵتانی و ئەسپی خوێن، نهێنی سیحربانوو، بە نهێنی عەشقەکەیەوە دوور دوور دەبات و دەیداتە دەست با.

سەید حوسێن ئەو پیاوە بەویقاڕ و سەنگینە، ئەو پیاوەی دیوارەکانی ماڵ و سینگ دڵیانی داگیرکردووە و هەرگیز بە نیگاو لوغز نەبێ وشەیەکی نەدرکاندووە، ئەو پیاوە بۆتە هاوڕێگاو و هاودەمی ئەو منداڵە ترسنۆک و لەرزۆکە.

جارێک ویستی هەڵیگرێت و وەک مەلۆتکەیەک بیخاتە ناوگۆڕە بەتاڵ و تەنها و پڕ غەریبییەکەی مەلا یارۆ وشکە، با ئەو بنوێ، ئەو چەند ساڵەی دنیا لە وجوودا ماوە بێ خەیاڵ و ئارام لەوێ بەسەر بەرێ و گۆڕەکەش چیدی چاوەڕێ نەبێ، شەرەفەدین

ئەوانەی لەو بەچاو گوتن و کاکۆ بەهێزێک کە لەوپەڕی بێ هێزیدا کۆی کردبۆوە، گوتی:

– تۆ دەتوانی من بگەیەنییە کۆتایی ئەو لوغزە، ئیدی من لە ئەستۆی تۆم.

شەرەفەدین لەوپەڕی هێمنیدا گوتی:

– ئەو گوندە هیچ لوغزێکی نییە، چیرۆکی ئەو گوندە تەنها چیرۆکی دروستکردنی ئەو چوار دیوارەیە، ئیدی تۆ خەونت دیوە، خەون. پیرێژنێک لەو گوندە هەبووە بێگومان زووتر زۆر زووتر هەموو ئەو چیرۆکانە ئەو دروستی کردوون، ئەو ناوی کارێزی هەزار دەریایی داهێناوە، ئەو زیاتریشی دەگوت، دەیگوت؛ هەزار دەریا، هەر دەریایەو رەنگێ. تۆ کوڕێکی شارستانی باوەڕ بەو قسانە مەکە، کێ باوەڕ دەکات دەریا بە ناو ماڵەکانی ژێر زەویدا بگەڕێ، گایەکیان بۆ فریدات و کچێکیان بەرێ، ورچێکیان بۆ فڕێبدات و پیاوێکیان بەرێ. تۆ لە ئەوروپاوە هاتووی کوا باوەڕ بەو قسە سەیرانە دەکەی، کێ باوەڕ بەوە دەکات ئەو ژنە هەموو مرواری رەنگەکانی قووتدابێ، هەرچی سەرچاوەی رەنگ هەبێ خواردبێتی، تەنها تاکە مروارییەک نەبێ کە منداڵێک، ئەویش تەنها بەخولقێکی منداڵانە لێی شاردبێتەوە، ئەو مروارییەش تەنها حەوت رەنگی تێدابووبێت، ئەو حەوت رەنگەی ئێستا دنیای رەنگ کردووە. کاکۆ وەک سەرکەوتنی بە دەستهێنابێ خێرا دەپرسێ:

– ئەو منداڵە کێیە؟ هەمووومان قەرزداری ئەوین. من هەر زوو دەمزانی جیهان بە عەقڵێکی منداڵانە رەنگکراوە. کەواتە لەو گوندەی ئێوەوە رەنگ دابەشکراوە، بابم ئەوە نازانێ، منداڵی ئازیز هەزار شوکر تۆ نەبای گوڵە باخ ئەو سوورییەی لە کوێ دەهێنا، تۆ نەبای یەک رەنگ جیهانی کۆتایی پێدێنا، بینینی بۆ هەتاهەتایەی دەکوشت. تۆ دەبێ شێوەی ئەو منداڵەم بۆ بگێڕییەوە با ناوی بگەیەنمە ئەوروپا با ئەو گەمژانە بزانن وەختێک لەو هەموو رەنگانەدا دەگەنە خلود قەرزداری کێن. با پەیکەر تاشەکانیان تاهەزار ساڵی دیکە تەنها پەیکەری ئەو بکێشن. شەرەفەدینی زانا چیرۆکی ئەو ژنە سیحربازە، ئەو منداڵە بلیمەتە بگاتە هۆلیود شەڕی لە سەردەکەن، تۆ پێم بڵێ کام داهێنەرە، کام بە دەسەڵات و قارەمانە توانیویەتی یەک تاکە رەنگ بۆ رەنگەکانی ئەو منداڵە زیادکات.

شەرەفەدین بەگاڵتەیەکی جەرگبڕەوە دەڵێ:

– تۆش لە منداڵەو لە خەڵکی گوندەکەی من نەفامتری، هەتا چەند ساڵ لەوەوپێششیش خەڵکی ئەو گوندە سەرشێت و بێ دەماغەی مە بە دوای تەرمی ئەو ژنە سیحربازەدا دەگەڕان، هەموو گرد و دۆڵ و قەبرستانەکانیان شەق و پەقکرد...

کاکۆ نەیهێشت قسەکەی تەواوکات و گوتی:

– منداڵەکە، ئەو منداڵە زۆر گرینگە.

شەرەفەدین بە پێکەنینێکی بێزارەوە گوتی:

– خەڵکی گوندەکەی من ئەگەر تەسلیمی ئەفسانەش بن بەو بێ عەقڵییەی تۆ بیرناکەنەوە، ئەوان پێیان وابوو رەنگەکانی منداڵەکیان دەستکەوتووە، ئەوان بە دوای تەرمی پیرێژنەکەدا دەگەڕان بەو نیازەی لە شوێنێک کە تەرمەکەش رزی بێت مرواری و رەنگەکانی لێ بستێننەوە. کێ باوەڕ بەو هەموو خەون و فێڵ و دەهۆیە دەکات. تۆ خەریکی گەشتوگوزاری خۆت بە، سواری ئەسپ بەو شارە دوورەکان ببنە، بچۆوە ماڵە کۆنەکەی باپیرت، سەر لەو خزمانەت بدە کە ماون، ناویان لە دەفتەرەکەتدا بنووسە و وێنەیان لێ بگرە.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ خێرا قسەکەی پێبڕی و گوتی:

– ئا، من، لەو گەشتەدا سندووقێکی تەختەی بچووکیان دامێ، دوا فیلم، دوا وێنەو دوا گێڕانەوەکانی ئەو پیاوە چاوشینەی تێدابوو، جێمس پۆڵ براون زۆر کەم وێنەکانی بڵاوکراونەوە، ئەو فیلمە رۆحی کارەکانییەتی و دەست کەس نەکەوتووە، دایانە من. نازانم چی لێهات، لەگەڵ خۆم هێنام و تابەیانیش هەر لە دەستم دابوو. دیارە نەماوە بەڕاستی ئەو فیلمە لە خۆم گرینگترە.

شەرەفەدین ئیدی سەبری نەما دەستی گرت و خێرا لە گردەکە هێنایە خوارێ و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

– تۆ دەبێ پشوو بدەی، پشوویەکی درێژ.

## بەفر

کاکۆی ژەنیاری موراد لە پشوودابوو، پشووی ئەو کیسەڵە سەوزانەی وەرزێکی تەواو دەخەون، پشووی ئەو ورچانەی بەفر لە نیشتیمانی خۆیدا تا تاقی ئاسمان گەمارۆی داون. ئەو گەمارۆ درابوو، گەمارۆیەک وەرزێکی دیار نەبوو بیشکێنێ، وەرزێک بەڵێنی هاتنی نەدابوو.

شەرەفەدینی چاوبەخوێن وەک پیاوێکی بەدبەخت تەنها لە نێوان ژنەکەیی و دنیادا دابەش نەببوو، ئەو تەنها نەببووە دوو لەت، ئەو لەت لەت ببوو، توێ توێ لەسەر یەک دانرابوو، بەدبەختی ئەو پیاوە لەوەدا بوو نەیدەتوانی واز لە هیچ توێیەکی یان پارچەیەکی خۆی بێنێ و هیچیشیان بەیەکەوە نەدەنووسان. زۆر دوای ئەوەی لەگەڵ کاکۆ سەردانی گۆڕستانی کردبوو، دوای ئەوەی بە ناو دێدا گەڕابوون، شەرەفەدین ویستبووی شتێک لەو ماتییەی خۆی بڕێژێ ئەویش لە قسەیەکدا، رووی دەکردە ناز جەواهێرخان، دەیگوت، نا هیچی نەدەگوت، دەمی دەکردەوە و هاوار دەکات، هیچی نەدەدەرکاند. کوا وشە و زمان و ناڵە و گرمەگرم ناخی ئەویان دەگواستەوە.

ناز جەواهێرخان دەیزانی ئەو پیاوە چۆن ئاخنراوە! هەڵنەڕژێ و بەتاڵ نەبێ بەرگەناگرێ و شەق دەبێ، هەڵڕژێ کێ بەئافاتەکەی دەخنکێ؟ لە پڕ دەهاتەوەو سەری بەژووری کاکۆدا دەکرد، دەچووە لای جەواهێرخان و سەیری سیحربانووی دەکرد، دەچووە دەرێ لە کوێ و لە کوێ دەگەڕا؟ سەردەکەوتە سەر بەرزترین درەخت و سەیری دوورترین شوێنی دەکرد.

دواتر خۆی نەگرت و وەک هەمیشە گوتی:

– نازخاتوون ئیدی نهێنییەک لەو گوندەی ئێمەدا نەماوە، میوانێک دێتەئێرە، میوانێک سەرما فڕێی دەداتە ئەو گوندە، میوانێک دێت لەبەر بەفر خۆی لەو ماڵە پەنادەدات، بۆ هەموو حیکایەتەکانی دەدەیتێ؟ لە خوێنی ئەو دێیەدا نهێنییەک هەیە بشکێ ئیدی ئەو دێیە مانایەکی نامێنێ. ئەو کوڕە بڕوات وێنەکەی سەید حوسێن دەبێتە گاڵتەی ئەم و ئەو، گوڵەسوڵتانییەکان جاریکی دیکە هەڵنادەنەوە، بۆ ئەو غەریب و نەمەییوەت هەڵبژارد هەموو حیکایەتەکانی بدەیتێ؟ سندووقی نهێنییەکانت بۆ لە دەستدا؟ خۆشنودییەکانی ئێمە لێرەوە کۆتایی دیت.

نازجەواهیرخان بە تەماشاکردنی دوو پاساری کە تازە فڕیبوونە سەر بەفرەکە دەیویست قورسایی هەڕەشەکانی مێردەکەی لەسەری کەمکاتەوە. گوتی:

– من هەڵمنەبژاردووە، سەید حوسێن بۆ خوی ئەوی هەڵبژاردووە، ئەو ناوی ئەشکەوتی هەزار دەریای پێگوتووە، ئەو باڵندەی رووناکی پیشان داوە، ئەو بردوویەتییە لای سوڵتانی رەنگەکان.

– ئەوە تەنها خەوبووە، خەوێک لەو پەڕی نەخۆشیدا، ئەو ئێستا وەک تۆ تەواو وەک تۆ بۆتە حیکایەتخوێن، من ناهێڵم لەو دێیە بچێتەدەر.

ناز جەزاهێرخان وەک سێوێک بێت و با هەڵیوەراندبێتە ناو جۆگا، وەک گوڵێک بێت و با پەڕپەڕی کردبێ، رەنگەکانیان هەموو لێستاندبێتەوە، گوتی:

– شەرەفەدین با تەنها یەک خوێن بەلاچاوتەوە بێت، ئەو کوڕە میوانێکەو دەڕوات و هەموو ئەو حیکایەتانەی بیر دەچێتەوە. گوندەکەی ئێمەش موویەکی لێکەم نابێتەوە.

– با کەم دەکات، دەیبەم بۆ ناو گۆڕەکەی مەلا یارۆ وشکە، دەیبەمە سەر زالکی بیری ڕەش با لەوێوە بڕوات بۆ ناو ئەشکەوتی هەزاردەریا، با لەوێ چەندی حەز دەکات نهێنی ئەو گوندە بۆ دەریاکان بگێڕێتەوە.

## شەو

سیحربانوو وەک هەمیشە بێخەیاڵ بە پەنجە باریک و درێژەکانی قژی شانەدەکرد، تەواو لەو شانەکردنەدا، بایەک هەڵی دەکرد و بایەک بە مێرگی نێرگزە جاڕدا تێدەپەڕی، بای بەهەشت هەڵی دەکرد، بایەک لە گۆڕەکەی مەلا یارۆ وشکەوە، بایەک بەسەر تووڕەیی و بوغزی قاتیلانەی باوکیدا، بایەک بەسەر باخی گوڵاڵە سوورەی دایکیدا.

بۆ یەکەم جار شەرەفەدین بۆنی میوانی لەو بایەکرد، شەرەفەدینی روومەت خوێن بۆنی میوانی بە رووکەوت، ئەو بایەی ئەو ماڵەی لەسەر دەژیا و ئاگری سارد دەکردەوە ئەمڕۆ بۆنی میوانی لێدێت، میوانێک لەبێ ئاگاییدا دەسکاری نەخشەی ماڵەکەیان و رووحی گوندەکەیان دەکات. چ قورسە بۆنی میوان لەسەر بای بەهەشت! شەرەفەدین دەڵێ:

– با ئەویش بزانێ، با سیحربانووش کڵاوی خۆی هەڵداتەوە، با ئەویش ئاگای لێ بێت، نابێ ئەو میوانە لەو ماڵە بڕواتەدەر، هەموو سامانی ئێمەی پێیە.

ناز جەواهێرخان دەڵێ:

– نهێنی چ سەمەرێکی هەیە؟ هیچ گەوهەرێک لە نهێنیدا نادرەوشێتەوە، ئێمەش تا دنیا دنیایە ناژین.

ئەو هاوار دەکات:

– لەگەڵ خۆمانی دەنێژین، بای بەهەشتیش دەخەینە ناو ئێسقانەکانمان، با کەس نەتوانێ ئەو حەزرەتانە راچڵەکێنێ.

ئەو کورتتر، بەڵام رەقتر دەڵێ:

– تازە راچڵەکاون.

## ئافات

ئەوان لە شەڕی خۆیاندا بوون، سیحربانوو چووە ئەو ژوورەی کاکۆی ژەنیاری موراد بەگی تێدا نووستووە، ژوورەکە لە ڕەنگی بەفردا غەرق ببوو، ئەو ڕەنگی پەمەیی لەگەڵخۆی هێنا، سیحربانوو وەک نوورێکی پەمەیی دەڕژایە ژوورەکە، وەک شەکر لە ئاودا دەتوایەوە، دیار بوو درزی دەکردە ڕەنگی سپی، کاکۆ ڕووی گەش دەبۆوە، سوورایی دەگەڕایەوە ناو ڕوومەتەکانی، ئەو لە خەودا بوو کەچی بەفر وردە وردە لەسەر کوڵمەی شوێنی خۆی بۆ سوور جێدەهێشت. گەرچی ئەو لە خەودابوو، بەسەر دەریاکاندا دەفڕی، هەزار دەریا و هەزار ڕەنگ، لە قووڵایی ڕەنگەکاندا غەمباربوو، دەترسا مرواری ڕەنگەکان بکەوێتە دەستی کەسێک و بیکوشێ، زیندانی کات و بیشارێتەوە دنیا بۆ سەردەمێک بگەڕێتەوە کە تەنها ڕەنگی ڕەشی تێدابوو، ڕەنگێک بە سیمایەکی جیاوازەوە پێش ئەوەی ڕەش داگیری کات. ئەوەی ون بوونی مرواری ڕەنگەکانی دیبێت هەرگیز لە درەوشانەوەشیاندا ئاسوودە نابێت.

بایەک بە هەمان سیفات و لەزەتی بەهەشتەوە کەوتە سەر ڕوومەتی، مووە باریک و درێژەکانی قژی دەجووڵاندەوە، بێ ئەوەی چاو بکاتەوە دەستی دوعای درێژکردوو،

گوتی:

– بمبە، هەڵم بگرەو بمبە، جگە لە بۆنی خۆت بۆنی هیچی دیکەی لێ نەیە، جگە لە ئەفسوونی خۆت ئەفسوونی کەسی دیکەی لێ نەبێ، بمبە، هەڵم بگرە بۆ ناو سەرچاوەی رەنگەکان، لە قوماتێکی نەرم و شلم پێچە، بمبە و چی خوێنم هەیە لێرە لە ناو ئەو ماڵەدا بەجێیهێڵە، با وەک مێشوولە هەرە بچووک و بێ گۆشتەکان بێخوێن بم. بایەک دڵۆپ خوێنی بێ رەنگم تێدابێ، ئیدی نامەوێ خوێنێک بیرم خاتەوە من کێم، ئیدی نامەوێ خوێنێک لەناو مێشک و دڵم بێ پەروا بسوورێتەوەو جارڕدات و بۆ کوێی بوێت بمبات.

چیدی نامەوێ خوێنی باوکم بە ئازادی لە ناو جەستەی مندا بگەڕێ، نا، نامەوێ خوێنی کورد ئیدی بمکوژێ و هەموو رۆژێکم مردن و ترس و رسوایی بێت. نا ئەو خوێنەم ناوێت هەموو دڵۆپێکی گریان و کۆست و نەهامەتی بێت. هەموو دڵۆپێکی ئەنفال و هەڵەبجە و ژەهر بێت. نانامەوێت، خەریکە دەرشێمەوە بەبۆنی ئەو خوێنە سوورە تۆخ و کڵۆ کڵۆ و پارچە پارچە و مەییوو پڕ گرێیە خەریکە دواییم بێت و بتۆپم و لەبەر بۆنی ئەو خوێنە کەس بێزی نەیات دەستم لێدات. ئیدی من نامەوێ بۆ چرکەیەک ئەو خوێنە پڕ خەتاو کوژراو نەفرەت لێکراوە بە ناو بچووکترین دەماری مێشکمدا گوزەرکات. نامەوێ بیرکردنەوەم پڕکات لە تۆڵەکردنەوە، تۆڵەکردنەوە لە برا هاوئایینەکانی، لە دۆست و جیرانە بە دەسەڵات و جەلادەکانی، تۆڵەکردنەوەیەکی بێکۆتایی.

ئەو بۆنی بەهەشتە، ئەو رەنگی بەهەشتە رەنگی کاکۆیان بردبوو، شێوەو وجوودیان بردبوو بەڵام ئەو هەر لە خەودابوو، سیحربانوو لێوەکانی دەدیت دەجووڵێن:

– رزیم و بێزاربووم، نامەوێ خوێنی شێخ سەعید و پاڵەوانەکانی مهاباد و کچە فڕێنراوەکان بەجەستەی مندا بڕوات، نا نا نا من نامەوێ هێندە سەر بڵند و شاناز بم، نامەوێ پاڵەوان بم و لە سێبەرەکەم مێروولە زراوی بچێت. من دەمەوێ وەک خۆم، وەک سەگێک تادەمرم یاری سێرک بکەم و خەڵک پێمپێبکەنن. دەمەوێ بۆ هەمیشە لەبەر دەستی سیحربازێک بم و هەر کاتێک ویستی هێلکەیەک لە قوونم بێنێتە دەرێ. ئیدی با ئەو سەیدە جیهانگیرە نەمبات بۆ ئەشکەوتە و هەزاران دەریای ئەنفال و خوێنەم پیشان

نەدات. نا من نامەویّ جاریّکی دیکە ئەو خویّنی شانازی و سەربەرزی و پڕ کوشتنەی کورد یەک تاقەجاری دیکە بە دڵمدا بڕوات و سەر لە سکۆڵەی راست و چەپی دڵمدات.

سیحربانوو بێئەوەی مەبەستی بێت، لە فەزایەکدا، لە ئەفسوون و سیحریّکدا کاکۆی بەو شێوەیەی دەیەویّ خەلق کردبۆوە.

– وەرە تۆ، تەنها تۆ بمبە، هەڵم بگرە و بمبە، من سەد هێندە لەو خویّنە سارد و بێرووح و سەربڕاوەی دایکم بێزارم، بێزارم. تاوانم چییە هەر دڵۆپە خویّنێکم نمایندەی ئەرمەنییەکی سەربڕاوبێت. نمایندەی کچە هەشت ساڵییەکی ئەتکراو بێت، مردم و مردم و مردم، بەرگەی ئەو هەموو چاوە ئەرمەنییە سەربڕاوە ناگرم، ئەوەتا بە ناو خویّنی مندا هێواش و لەسەر خۆتێدەپەڕن. بمبەو هەڵم بگرە با هەرچی خوێن هەیە لە جەستەی مندا نەمێنیّ، نا، خوێنم بۆ ئەبەد ناویّ، هەر لێرە لەسەر جێگاکەم دەیڕێژم و بۆ هەرگیز تەماشای ناکەمەوە، ئای چەندم حەزلێیە وەک کوللە سەوزە هەرە بچووکەکان تەنها شلەیەکی سەوز یان بیّ رەنگ لە جەستەمدابێت ئەویش لە تاقە دڵۆپێک زیاتر نەبێت. چ خوێنێکی رەش و قورس و پڕ مردنە خوێنی ئەرمەنیانەی دایکم. نازانم ئەو ژنە نازدار و کاغەزە چۆن بەو خوێنە دەژی، نازانم ئەو پوورە هاریازییەم چ دوژمنایەتییەکی لەگەڵ مندا هەیە، جیناتەکانی ئەو کە هەر وا بە ناوی خزمایەتی و ئەرمەنایەتییەوە هاتوونە ناو خویّنی من، بیّ ئەوەی بزانم و ئاگام لێبێت، ئەو جیناتە دەروێشانە تەنها دەزانن هەموو نیازە خۆش و خەندە و پێکەنینەکانم ورد ورد کەن و تامی ژیان و منداڵی و گەنجیم پارچە پارچەکەن. نا نامەویّ من خوێنی ئەو پوورە پڕ گریان و حەسرەت و فرمێسکەم ناویّ.

– ئەی بای بەهەشت وەرە و بمبە، هەڵم بگرە، دوور دوور، بیّ خوێن و رەگەز و مۆرک. خوێنم بڕێژە سەر ئەو فەرشە کوردییە با سوور سووری کات و چاوی کورد با لە سوور تێر بێت.

نا من خوێنی ئەو رۆژهەڵاتەم ناوێت، نا من نامەوێت خوێنی موسڵمان لە جەستەمدا بێت و بچێت و ئیدی ببمە خاوەنی شمشێری ئەو هەموو ئەسحابانە، نا من خوێنی ئەو هەموو زانا موسڵمانەشم ناوێت بە ئیبن خەلدون و ئیبن روشدیشەوە، من نامەویّ خوێنی موسڵمان بە هەموو زیکر و ترس و نەهی و مونکەرەوە جاریّکی دیکە بچێتە ناودڵم.

نا من هەرگیز نامەویٚ خوێنی ئەو دیلە مەسیحییەشم لە دەمارەکانمدا بڕوات، نا خوێنێکی مەسیحیم ناوێت و نامەویٚ ببمە میراتگری هەزاران ساڵی تاریکی حوکمی پاپا.

من خوێنی هەرچی ئینسانە نامەویٚ، هیچ وەرزێکی شانازی نییە خوێنی تێدا بگەڕیٚ. هەڵم بگرەو بۆ دواخاڵی دنیا بەرێ کەوە.

کاکۆ وەک هۆنراوەیەک بخوێنێتەوە، وەک وشەبخاتە سەر نۆتەکانی ئۆرانۆس:

– من لە سروشت بێزارنیم، من لە تۆفان و رەهێڵە هەڵنایەم، نا من بورکان و بومەلەرزە نامترسێنن، نامن لەو خوێنە ئینسانییە خۆپەرست و سوور و پڕ هەڵپەیە بێزارم کە هەر رۆژە بەرەو کارەسات و تاوانێکم دەبات. تۆ بای بەهەشتی دەتوانی بمشۆیەوە، خاوێن خاوێنم کەیەوە، ئەو خوێنەم لێداچۆڕێنی، خوێنی کوللەیەکی سەوزی کاڵ کاڵم بکە جەستە، تەنها دڵۆپێک، تەنها تۆ دەتوانی ئاونگی گەڵایەک بنێرییە ناو دەمارەکانم، تەنها دڵۆپێک لە راوی دارەبەن بکە ژێر پێستم و بمبە، بۆ شوێنێک بمبە بەرزترین دەنگ هاواری ماسی بێت، قورسترین خەو خەوی کۆتربێت، گەورەترین شەڕ شەڕی چۆلەکەبێت. لەسەر ئاوازی پرخەی کەروێشک بمبە، ئەی بای بەهەشت بە دەرگایەکدا بمبە لە هەڵم دروستکرابیٚ، هەڵمی هەناسەی ئینسان نا، لە هەڵمی گوڵەکانی دار بەڵاڵووک دروست کرابیٚ وەختێک بەیانیان بۆ ئەوەی چاوبکەنەوە خۆیان دەتەکێنن.

وەختێک کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ چاوی کردەوە درەنگ بوو زۆر درەنگ، تازە دەرگایەکە دادەخرایەوەو دەنگی کشانی کراسێک هێواشتر دەبیسترا، درەنگ بوو زۆر درەنگ، بەڵام ژوورەکە پڕ پڕ ببوو لە بۆنی بەهەشت، لەسەر پەڕە کاغەزێک نووسی:

کە من رۆیشتم بسپێرم لاولاوێک،
دوای چوونەوەی بەفر خۆی لە من بئاڵێنیٚ،
باسەری پەنجەکانم گوڵ بگرن و هەموو جەستەم ببێتەگەڵا،
ئەوەندەی تەمەنی ئەو گوڵانەم ماوە لە هەناسە،
ئەوەندەی تەمەنی هەنگێک لە سەفەردا بە دواتدا دەگەڕێم،
دەبیٚ ناوێک لە تۆنێم، ناوێک من بدۆزێتەوە.

## سیحر

سیحربانوو هاتبۆوە ژوورەکەی باوک و دایکی، ئەوان کفت و ماندوو، شەڕێک لە قسەدا هێزی لێبڕیبوون، شەڕ چووبووە ناو وێنەکانی سەر دیوار و ناو ژێر پیاڵەکانی سەرتاقەکە، شەڕ چووبووە ناو ریزی ئەو ژن و پیاوانەی بەخوری و موو لەسەر فەرشێک لە کاتی شاییدا چنرابوون و ئێستا تاقێکیان شاردبۆوە، ئەوان چوار ژن و چوار پیاو بوون بەو پەڕی حەماس هەڵدەپەڕین، دەنگی هەڵپەو هەناسەیان هێشتا رۆژە ریێیەک دەرۆیشت، بۆنی توندی ئارەقەی بن باڵ و ژێرمووی پیاوەکان وەک هەور تێکەڵ بۆنی ناسکی سینگی گۆشتن و بە دەرەوەی ژنەکان دەبوو. هەموو ئەو پیاوانەی بەرانبەر ئەو وێنەیە چای دیشلەمەیان دەخواردەوە هێندە توند مژییان لە کڵۆ شەکرەکان دەدا، لەوەی بوو ددانەکانی خۆیان هەڵقەنن. بێگومان ئەو هەڵپەڕین و ژن و پیاوانە هەر تەنها رەنگێک بوون، رەنگێکی تۆخ وگەرم بە فەرشێکی سەر دیوارەوە.

شەرەفەدین لە قووڵایی خۆیدا و بەو پەڕی متمانەوە دەڵێت،

– من بڕیاری خۆم داوە.

ناز جواهیرخان قسە ناکات، ئیدی بیانوو ناهێنێتەوە، ئەویش لەوپەڕی هێمنیدا و لە

ناخی خۆیدا بڕیاری خۆی داوە.

نیوە شەوە، ئەو دەمەی بەفر وەک خۆر لە هەموو جێگایەک هەڵاتووە، دوو دەستی لەرزۆک و پڕ نهێنی دەرگای ژوورەکەی کاکۆ دەکەنەوە، دوو دەست وێنەکەی سەید حوسێنی جیهانگیر دەسڕنەوەو دێنە لای کاکۆ، بەرز بەرز بەرانبەر ئاسمان رادەوەستن و دوعایەک لەگەڵ فوویەکی گەرم دەکەوێتە سەر رووی کاکۆ و ئەویش چاو دەکاتەوەو بێ ئەوەی راچڵەکێ یان لە رووی غەمین و بێ ئۆقرەی نازجەواهێرخان بترسێ چاودەکاتەوە و لەبەر رووناکی تەنک و ساردی بەفر لە قووڵایی چاوەکانی دەڕوانێ و دەڵێت:

– دەبێ بڕۆم، چاوەڕێ بووم بێی.

ناز جەواهێرخان دەستەکانی کاکۆی لەوپەڕی نەرمی و موحیبەتدا دەلاوێنێتەوە و هیچ ناڵێ، هەڵبەت بەدەم. ناز جەواهیرخان هەموو کۆترە سپییەکانی ناخی خۆی هەڵدەفڕێنێتە سەر گومبەزی چاوە نەرمەکانی و هیچ ناڵێ، دەمدەکاتەوە و لێوی دەجووڵێنێ و دەیەوێ بڵێت، بەڵام هیچ ناڵێت.

چ هەست و سۆزێک لە نێوان ئەو دەستانە دەگوازرانەوە کە وەک دوو تۆپەڵە تیشک تێکەڵ ببوون، دوو تۆپەڵە تیشک هەریەکەو بە رەنگی خۆیەوە، کاکۆ کەلوپەلەکانی خۆی کۆکردنەوە و خستنییەوە ناو جانتاکەی، روانییە جەواهێرخان و هیچی نەگوت، سەیری جێگای بەتاڵی ناو جانتاکەی کرد و هیچی نەگوت، چووە بەردەم وێنەکەی جیهانگیر و دەمی کردەوە و هیچی نەگوت، هەنگاوێک لە وێنەکە چووە پێش و وێنەکەش ئەوەندەی دەکرێ لەودیو شووشە بەندێکەوە بجووڵێ هاتە پێشێ. ناز جەواهیرخان لە پشتەوە بەناسکی هەردووک شانی کوشی و ئاوڕی دایەوەو لە دەفتەری ناوجانتاکە دڵنیابووە و چووە دەرێ.

## فیلم

کاکۆ وەک بەشێک لە تاریکییەکە چووە ئەو دیو دەرگا. وەک بەشێک لە تاریکی دنیا تەماشای ناز جەواهێرخانی کرد، بۆ یەکەم جار لە خۆی پرسی:

– ئەریٚ کە هاتم ئەو دارەی ناوەندی حەوشە هەبوو؟

ئەو ویستی بڵیٚ:

– نا.

هەر ئەوەندەی لە سێبەری خانووەکە تێپەڕی و کەوتە سەر بەفرەکە، هەر ئەوەندەی لە سێبەریماڵی ئەوان ترازا، ناز جەواهێرخان وەک گوڵێک لە ئاسوودەیی خۆی خزاندەوە ناو جێگاکەی شەرەفەدین و نووست. جاریٚ کاکۆ ئەوەندە دوور نەکەوتبۆوە سێبەری کاڵی سەر بەفرەکەی نەدەبینرا، هەستی کرد هەمان بای بەهەشت، بە هەمان بۆن و تەشویقییەوە دێت و رەنگێک دەخاتە سەربەبەفرەکە، تێکەڵ هەنگاوەکانی دەبێت و دەیگێڕێتەوە، بە هەمان ڕێگای ترسدا دەگەڕێتەوەی، بەسەر توولەڕێی هەڕەشەکانی شەرەفەدیندا دەگەڕێتەوە، بەڵام بە بۆنی بایەک دەگەڕێتەوە کە چاوەڕێی دەکات، سەیری بەفرەکەی بەردەمی دەکات و دەڵێت:

– دەبێ فیلمی ناو سندووقەکە بێنم.

ئەو قسە هەر بەو گەرمییەوە دەکەوێتە سەر بەفرەکە. ئەو دوو دڵییە چییە دەیباتەوە ئەو ماڵە، مردنە؟ هەڕەشەکانی شەرەفەدینە؟ خوێنیەتی لە جووڵان وەڕز بووە؟ ئەوە چییە دەیگێڕێتەوە ژێر ئەو سێبەرە؟ یان ئەو وەک میوانێک نەیدەتوانی هەناسەیەکی زیاد هەڵکێشێ و ئێستا وەک دزێک بە ئازادی دەگەڕێتەوە؟ نا ئەوەی دەیگێڕێتەوە فیلمە ون بووەکەی جیمس پۆلڕ براونە، فیلمێکی نووستووی ناو هەندێ دەرمانی کیمیاوی، یان هەر هەمان ئەو سێبەرەیە کە ئۆرانۆس بۆ ئەبەد دوای کەوت، سێبەری کچێک لە نۆتەی مۆسیقادا، سێبەری کچێک لە رەنگی بەفردا، چ سێبەرێکە مۆسیقا و رەنگەکان دەبات! دەگاتەوە بن دیواری ماڵەکەی شەرەفەدینی چاو بەخوێن، ئەو ناوە بەشەو چەند ترسناکە، پەنجەرەیەکی بچووک دەکرێتەوە، دەترسێ و رەنگی بەفرەکەی سوور دێتە بەرچاو، ناوی دەکەوێتە سەر سندووقە بچووکە تەختەکەی فیلمەکەی جیمس پۆلْ براونی تێدایە، لەسەر لێواری پەنجەرەکە دانراوە، پێش ئەوەی دەستی بۆ بەرێ دوو چاو دەبینێ لەو دیوی پەنجەرەکە شەپۆل دەدەن، شەپۆلێک وەک گێژاو، دوو چاوی تەواو وەک هەنگوین، وەک ئەوەی لەو سات و وەختەدا هەرچی گۆزە هەنگوینی دنیا هەیە بڕژێتە ناوی، گۆزە هەنگوین وەک رووبار بڕژێت و چاو تەواو نەبێت. دوو چاو لەسەر رووکاری بای بەهەشت.

کاکۆی ژەنیاری موراد بەگ وەک ئەوەی بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا زمانی بەکاربێنێ، گوتی:

– من هەر بۆ ئەو رووباری هەنگوینە هاتووم؟

– ..........

– دەمەوێت لەو هەنگوینە زەردەدا بخنکێم و لە ناو ئەو وێنە رەش و سپیانەدا زەرد نەژیم.

– نا، ئەو فیلمانە لەو دنیایەدا نەماون تا تێیاندا بژیت.

– ئا، ئەوانەی ئەو فیلمانەیان دروستکرد نەماون.

– ئەگەر ناتەوێ بچییە لایان زووتر برۆ.

– چیرۆکەکەی ئۆرانۆس دووبارە ناکەمەوە، بە تەنها نارۆم و چاوەڕێتدەکەم.

– دێم بۆ شوێنێک جگە لە دەنگی باڵندەو ئاو تۆشی لێبی.

– کامیان ئەشکەوتی هەزار دەریا یان باخەکەی ئۆرانۆس؟

کاکۆ کە ترسێکی لە رۆحدانەمابوو، لە حیرس و تاسان چاوی نووقاند بوو کە چاوی کردەوە جگە لە سندووقێکی بچووکی فیلم چی دیکەی نەدی، هەر وەک ئەوەی لەو دیوی پەنجەرەکە تاریکی بەسەر یەکدا رووخابێ، ئەو سندووقە کۆنە بچووکەکەی هەڵگرت، تاکە دیاری سەید حوسێن و تاکە یادگاری جیمس پۆڵ براون.

خاتوو سیحربانوو لەو سەری دیوارەکەوە دەرکەوت، دەستی کاکۆی گرت و بێ قسە دوور کەوتەوە، دەنگی پێیان لەسەر بەفرەکە کرمەی دەهات، شەوێک تەواو وەک ئەو شەوەی ئادەم دروست نەکرابوو، لە دوورەوە ئاوڕیان دایەوە، سەرەتا سیحربانوو دواتر کاکۆ، چرایەک لەو دیو پەنجەرەکە هەڵکرابوو، یەکەم جار بوو چرا دەنگی مەرگ و ترس لەگەڵ خۆی بێنێ، کەسێک پرسیارێکی دەکرد و وەڵامی نەدەبیست ئەوان وایان زەن کرد. یەکە یەکە چرای هەموو ماڵەکان هەڵکران، بێ ئەوەی جارێ کەس دەرگای ماڵی خۆیانی کردبێتەوە، وەک کوژەکە کرابێتە شوێن پێکانیان دەدرەوشایەوە، تا ئەو کاتە کەسێک دوایان نەکەوتبوو، بەڵام بۆنێک لە دێیەکەوە بەرەو ئەوان دەهات ئەویش بۆنی ساردی دڵ و ساردی ئەنفال بوو.

## حیکایەت

ناز جەواهێرخان دەیگوت بە هەناسەی حیکایەتێکی سەد ساڵ کۆنەوە. دەیگوت:

– ئەو ژەنیار بوو، لەوجوودی ئەودا مۆسیقایەک دەنگی دەهات، پێ بەپێی مەلەکان دەفڕی، زەوی تەخت تەخت دەبوو، کەسێک، چیایەک بەپێوە نەدەما، مۆسیقای ئەو هەر حەسرەت بوو، کەسێک، زۆر دوور کەسێک، خەیاڵی کەسێک قژ ئاڵۆزکاو و ریش بەتۆز، ئەو بۆ خۆی دەیگوت ئەوە پێغەمبەر داودە.

دواتر ئەو ژنە گوندنشینە، کە هێندێک پێیان دەگوت، شێت، دەیگوت:

– ئەو، ئا ئەو هەر ناوی کاکۆ بوو دەنا یەک وشەی کوردی نەدەزانی، هەر ئەوەندە ناوی گوڵ سوڵتانی بیستبوو هاتبوو یەک تاقە گوڵ لەو دێیەی من بەرێت و بڕوات (هەموو بەیەک دەنگ دەیانگوت بردیشی، بەڵام نەیاندەگوت)، کەچی شەرەفەدین هەر لەبەر ئەو دڵۆپە خوێنەی لاچاوی نەیدایە، ئەویش هەر بەو قژە ئاڵۆز و زەردەیەوە لە حەیفان، لە حەیفان و بەس لەسەر ئەو گردەی دیار نەماو لە پەنا ئەو دارەی بۆ ئەبەد

توایەوە. من هەر سەرەتا باوەڕم نەکرد ئەو کوڕە گۆشت و خوێن بێت. هەر دیار بوو پارچە کاغەزێک بوو، منداڵێکیش نەیکردە کۆلارە.

ناز جەواهێرخان دەیرِوانییە قژی خۆی، لەبەر خۆیەوە دەیگوت، سیحربانوو، رستێک قژی رەش و قورس و درێژ تا مەککە، ئەوە قژی سیحربانوو بوو، ئەو لەبەر ئاوێنە دەیرِوانییە قژی خۆی، چەند تاڵێکی سپی دەدیت و دەیگوت:

– هەر ئەو چەند تاڵەی لە دوا بەجێما. زۆر تێپەڕیوە،ساڵی زۆر قەبە تێپەڕیون.

ئەو جار رووی لە ژنەکان دەکرد و دەیگوت:

– خۆ هەر پارچە کاغەزێک بوو، هەر کەسێک هات و گوڵێکی سوڵتانی بدەینێ ئیدی خۆ لەو گوندەدا گوڵێک نامێنێ بۆ بۆنکردنی خۆمان (هەموو دەزانن گوڵە سوڵتانە هەرگیز بۆنی نەبووە) ئیدی ناوی ئەو پیاوەش ون دەبێت و حاشا لەو، کەس نازانێ شوو برایەکی وام هەبووە. هەر دەبێ بە هۆی گۆڕەکانەوە بزانین چەند کەس لێرە ژیاون. ئەو رۆژەی هاتە ئێرە ئێوارە بوو ئێوارەیەکی درەنگ، من وامزانی میهرئاڵی ئامۆزامەو دوای ئەو هەموو ساڵە لە ئەشکەوت گەڕاوەتەوە، مووی ریشی زەرد و بەبریق دەتگوت هەنگوینی کوێستانانیان تێهەڵسووە.

بەیانییەکەی دارێک لە پێش ماڵمان شین ببوو، جارێ خۆر هەڵنەهاتبوو، روانیم سیحربانوو لەسەری سەرەوەی دارەکە دانیشتووە قژی تا عەرزەکە شۆڕ بۆتەوە، دیتم ئەو کوڕە میوانەکە نازانم چ ناوێکی لێ بنێم بەقژیدا هەڵدەگەڕێ، وەختێک دەمرِوانییە ژووریش دەمدی لە ناو جێگاکەی خەوتووە، بەیانییەکەی بەسیحربانووم گوت ئەو دارە چییە لە حەوشەکەمان رواوە؟ ئەو وەک لەو سەری دنیاوە هاتبێ گوتی:

– حەوشەکەمان!

دواتر گوتی:

– ئەی خودایە چ قسەیەکی کرد ئەو کچە سەر شینەم:

– دایە، دارێکی ئاواش، هەر ئاوا پرچ شۆڕ لە دڵی مندا رواوە، رۆژێک لق و گەڵاکانی لە سینگمەوە دێنەدەر»

من ویستم بگریەم، سەرسام و حەیران، گوتم:

– داریک؟ داریک لە دڵی تۆدا، بەو گەورەییە؟

هەر بە هەمان هێمنی خۆیەوە، گوتی:

– گەورەتریش، لقە درێژ و شۆڕەکانی تا قووڵایی دڵم هاتوون، تا قووڵایی خوێنم، بەڵام وەک ئەو دارە سەوز نییە، سوور سوورە، سوورێک بە رەنگی خۆر ئەو دەمەی خەریکە لە ناو تەمدا ون دەبێت.

ناز جەواهێرخان لای برادەرە هەرە نزیکەکانی، لای ژنە کامڵ و ران ئەستوور و قورسەکان، لای ژنە باریک و رەق و درێژەکەی سوڵتانی شوبرای، خەونێکی خۆی دەگێڕایەوە، خەونێک لەو رۆ، ئەها لەو لەحزەیە گەرم و گوڕتر، دەیگوت:

– من بە شوێنیاندا رۆیشتم، پێبەپێ، پێی ئەو تولفەی من هەر ئەوەندە بوو کەوتبووە سەر بەفرەکە، بە حاڵ شوێنی لێ کردبوو، دیار بوو زوو زوو ئاوڕی دابۆوە، روانیبوویە پەنجەرەی ماڵێ، بستێک دوور لە یەکتر لەسەر کۆتەرە داریک دانیشتبوون، نەمزانی هیچ قسەیان کردبێ، نازانم کەنگێ گەیشتبوونە کانیاوی سەرتەرزێ. ئەو کوڕە پەڕە سیغارە چووبووە ناوێ، چووبووە سەر سەرچاوەی ئاوەکە، لەوێ گوڵێکی دیبوو، وایزانیبوو گوڵە سوڵتانە، گوڵێک لەبەر تیشکێکی کزو لاڕێ حەوت رەنگی گۆڕیبێ. من ئەو چەند رۆژەی لێرە بوو نەمدی نوێژ بکات و ناوی خودا بهێنێ، بەڵام لەوێ لە بەرانبەر ئەو گوڵە مەخمەرییە بچووکە زستانییە پاڕابۆوە، بەڵام چونکە سەرگەرم و شێت بوو نەیزانیبوو دوعا بخوێنێ، هەر گوتبووی:

– خودایە مێروولەیەک لە ژێر زەوی، سەدساڵ دوور، با لە تەنهایی و تینواندا نەمرێ رزگاری کە.

من دەمزانی ئەو مێروولەیە بە دڵۆپە ئاوێک تینووەتی دەشکێ و بە دوو دڵۆپە دەتاسێ و بەسێ دڵۆپە دەخنکێ. بۆیە هەر لەو کاتەدا دەستم بەرزکردەوەو گوتم:

– خودایە حیکمەتی خۆت.

هەر لەو کاتەدا پیاوە یەکەیەکەکانی دێ دەگەنە وێ. ئەوەندەی من ئاگام لێبێ

سیحربانوو هەر لەسەر کۆتەرە دارەکە دەبێ، بێدەنگ و هێمن، زالکی ئەشکەوتەکە دەگرن، بە بەرد و گڵ دیوارێکی پان و بەرز و کونبڕ دروست دەکەن و شەرەفەدین، دەڵێت:

– دەبڕۆ چ ئەشکەوتێکت پێخۆشە بڕۆ ناوی، ئەو فیلمە سەیر و سەمەرانە بشۆوە کە هەر خۆت ناویان دەزانی. بیاندە دەست مرواری بە دەستەکانی ئەو دنیا، لێرە لەو ئەشکەوتەدا ئازادی.

ناز جەواهێرخان دەڵێت:

– دیسان دەستم بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، ئەوەندەی دەتوانم دەستم بەرزکردەوە و گوتم:

– خودایە حیکمەتی خۆت!

تەنها من دەمزانی ئەو کوڕە پەڕە سیغارە لەو ئەشکەوتەدا نەماوە. پەڵە خوێنەکەی سەر کوڵمی شەرەفەدین بریقەی دەهات، دەتگوت هەر ئێستا مەلا یارۆ وشکە ون بووە، هەر ئێستا سوڵتان کوژراوە، دەتگوت هەر ئێستا ئەو پەڵە خوێنە رژاوە. دەتگوت هائەوە ئێستا خوێنی لێ دێتەخوار، ئەو برینداربوو، برینێکی قووڵ، قووڵ کە بەو بەرد و گڵی ئەو شەوە پڕ نەدەبۆوە. ئەو دەیویست زوو بگەڕێتەوە لای وێنەکەی سەید حوسێن و بزەیەکی بۆ بکات و، پێی بڵێ:

– تۆ بۆ ئەبەد پیرۆزەی، نهێنییەکانی تۆ تەنها لە ناو دڵی ئێمەدا دەبێ.

ئێستا نازجەواهێرخان خۆی وەک ژنی ئاغر و سەنگین و گەورەی خانەوادە دەهاتە بەر چاو، دەیڕوانییە دەوروپشتی و بە هەمان لەبز و تامەوە دەیگوت:

– من ئەوم نەدی، تەنها دەمدی با، بایەکی لووت بەرز و سەرەڕۆ پرچی سیحر بانووی دەبرد، ئەو پرچە رەش و درێژ و قورسەی دوور دوور دەبرد، تەنها من دەمدی ئەو بایە کە راست لە مووە ئەستوورەکانی شەرەفەدینەوە هەڵی دەکرد شتێکی کەش دەبات، شتێک کە جەرگی منی لەگەڵ دەڕۆیشت و رۆحی دەسووتاندم، هیچ تێنەگەیشتم بۆ شەرەفەدین ئەو ئاغا بەڕێزەیماڵم هێندە توند لە من تووڕە بوو، ئاگری گرت و

گوتی:

– لێرەچی دەکەی ئافات، هەستە بڕۆوە ماڵێ.

ئیدی من هیچ نازانم، نازانم سیحربانوو چی لێهات، نازانم کاکۆ بردی ئەو کوڕەی ماڵەکەی سەرو بن کردم، نازانم شەرەفەدین ونی کرد، یان با هەڵیگرت.

## چاوەڕوانی

ئەوان هەر سێکیان ژەنیاری موراد بەگ و ئارتووش کوردە و کاڕۆلین بەسەر کەنیسەی سان ئەندریاسدا فڕین، نە لەخەوندا و نەلە ئەفسوون و سیحر هەروا بەفڕۆکە فڕین. لەو کاتەدا نەبیریان لە باڵندەی تۆس کردەوە و نە لە قەشە جۆلیۆس ئەندریاس، هەتا بیریان لەوەش نەکردەوە کە چەند خانوو و شوێنەواری کۆن، پایە و دیواری پڕنەخش لەو شارەدا هەن و ئێستا ئەوان بەسەریدا تێدەپەڕن، پاشماوەی نەوە ماندووەکانی مێژوون و پارێزراون.

لەو سەرەوە کاڕۆلین بۆ خانووە تەنها و غەمبارەی روانی کە بە حاڵ لە ناو دارە چڕو بەتەمەنەکان دیار بوو، خانووە غەمگینەکەی ئۆڕانۆس. بۆ لەحزەیەک هەستی کرد کاکۆ خودی ئۆڕانۆس بێت و بۆ سۆراغی کچی سەوز گەڕابێتەوە، ئەوەی بیرکەوتەوە کە کاکۆ چەند بەتاو و گەرم و گوڕ دوای باغەوانەکە کەوتبوو ئەویش وەک بەردەستێکی بەوەفا هەموو ئەو رووداو و یادگارانەی بۆ دەگێڕایەوە کە دوای ئەو روویانداوە. شیعری سەر پەیکەر و گەڵا و قەدی دارەکانی بۆ دەخوێندەوە. لە شێوە و ئاکاری هەموو

ئەو کچانە دەدوا کە بە تایبەتی هاتبوون و سۆراغی ئۆرانۆسیان کردبوو. زیاتر لە سەر ناوی ئەو کچانە دەوەستا کە بۆ جارێکیش بێت باسی ئەو نامەیان کردووە کە ئۆرانۆس لە دوای خۆی جێی هێشتووە.

کارۆلین سەرەتا هاوکاری کاکۆی دەکردو گەڵاو قەدە وشکبووە نووسراوەکانی لە تۆز و چڵکی زەمەن لەگەڵ پاکدەکردەوە. هەندێکیانی بۆ وێنە دەگرت یان دەنووسییەوە، هەندێکیانیان بە رۆحی رۆنی زەیتوون چەور دەکرد، بەشێکی دیکەیان چەند رۆژ بە هۆی هەڵمەوە لێک دەکردەوەو نووسینەکانیان دەبردەوە سەر یەک، زۆرجاریش هەموو ئەو وتەو قسانەی دەنووسییەوە کە کاکۆ لە کاتی کارکردندا دەیکردن. رووحی ئەو کارە تا خوا حەزکا عاشقانەبوو، بەڵام کارۆلین زۆر زوو زانی ئەوە عەشقێک نییە بگیرێ، ئەوە عەشقێک نییە بێتەدی، ئەوە عەشقێکە وەک نەخش و نیگارە شیرینەکانی سەر ئاو، وەک وێنە دڵفرێنەکانی سەر هەور، ئەوەش نیگەرانی و غەمگینییەکی ئەستووریان لەلا دروست دەکرد، هەر ئەو کاتەش ئەوەی زانی کە گوڵەباخەکانی نێوانیان رەنگیان وردە وردە دەگۆرێت و شتێک بە ناوی رەنگی سوور لە نێوانیان نامێنێ. بۆیە ئەو عەشقە لای کارۆلین جگە لە نیگارێکی ئاڵۆز بەسەر جەستەی مەرگەوە هیچی دیکە نەبوو.

کاکۆ دەیتوانی رۆژێکی تەواو خەریکی چاکردنەوەی پارچەدارێک بێت کە عاشقێک شیعرێکی بۆ کەسێکی نادیار و بە چەند وشە و رستەی پچرپچر لەسەر نووسیوە. ئەوەی کارۆلینی بە هەواوە هەڵواسیبوو ئەو کەسە نادیارە بوو. ئەو کچە یان ئەو کەسە نادیارە لە دوای هەموو دێڕێک و لە رووکاری هەموو گەڵایەکی پان و فراوان و پشت هەموو پەیکەرە بەرد و تەختەکان دەهاتە بەردەم کاکۆ و هەناسەیەکی هەڵدەکێشا. کارۆلین دەیزانی بەشێکی گەورەو دیاری عەشق توندوتیژی و شەڕە، بەڵام شەڕکردن بەرانبەر دوژمنێکی سەرسەخت و نادیار هەمیشە دۆڕانە، دوژمنێک کە شوێنی برینداربوون و شکستی پێوە نەبینی.

ئەو دەیدی، بوونەوەرێکی نادیار، کچێکی نادیار، دەسەڵات و هێزێکی لەبن نەهاتووی ون کاکۆی وەک مەملەکەتێکی وێران داگیرکردووە. کارۆلین وەختێک زانی تەواو دۆڕاوە

که ئارەزووی دەکرد ئەو کچە بێت. زۆر حەزی دەکرد کاکۆ شێوەی ئەو کچە لەودا ببینێتەوە ئەوەش جگە لە ئاشکرابوونی دۆڕانەکەی هیچی دیکە نەبوو.

کارۆلین هەر بەدەم فڕینەوە ئەوەی بیرکەوتەوە، کە جارێک لە بێزاری و تۆڵەکردنەوە لەو رکەبەرە نەناسە سێ رۆژ کاکۆی جێهێشت و لێگەڕا لەو باخە پڕ زوقم و نەبینراوە تەنهابێت. کاتێک خۆی پێ رانەگیراو ئێوارەی سێیەم رۆژ چووە لای پانتۆڵێکی تەسک و شینی کاڵی لە پێکرد، لەگەڵ تیشێرتێکی کورتی سپی هەر ئەو رەنگانەی کاکۆ حەزی لێبوون، مەمکەکانی قیت کردبوونەوە، نەرمایی هەردووکیان لەگەڵ هەموو هەناسەدانێکدا بەبارستەی ئەو هەوایەی هەڵیدەمژی لە تیشێرتەکەیەو دەهاتنەدەر تەواو بۆ دەرخستنی راستی بیردۆزەکەی باسکاڵ. کە گەیشتە لای باخەکە، کاکۆ هەردوو دەستی خۆڵ بوون، جلەکانی بۆنی گیای کۆنیان لێدەهات، چاوەکانی کە لە نێوان شین و رەساسیدابوون ئێستا سەوز دەچوونەوە، بەو پەڕی شەوقەوە بانگی کرد، بانگ کردنێک خۆشی بەو خەمۆکییە ئەستوورە بەخشی ئەو کچەی داگیرکردبوو:

- کارۆلین!

لەگەڵ ناوی خۆیدا کارۆلین گەشایەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی:

- چ رکەبەرێکی بێ جەسارەت بوو.

که دووبارە بە هەمان شەوقەوە گوتییەوە:

- کچێ کارۆلین!!

ئەوجارە هیچ بیانوویەک بەدەست دڵە هەرمێیەکەیەوە نەما بۆ ئەوەی نەداتە شەقەی باڵ.

دیسان لە دڵی خۆیدا گوتی:

- خودایە لەو بەختەوەریەدا بمکوژە.

سێ بارە کاکۆ هەر بە هەمان لەزەتەوە، بێ ئەوەی سەر هەڵبڕێ، بانگیکرد:

- کارۆلین وەرە بزانە ئەو دارستانە چەند ئاوەدان بووە؟ چ بەختەوەرە ئەوەی لێرەیە!.

کارۆلین ویستی بڵێ:

– ئێستاش ئاوەدەنە.

کە دیتی کاکۆ چاوەکانی، ڕوومەتی و قژی درێژی ڕژاونەتە سەر ئەو بەردە لووسەی بە دەستیەوەیەتی، ئەو بەردەی ئاوەدانی بەو دارستانە بەخشیوە، چووە تەنیشتەوەو لەسەر کۆتەرە دارێک دانیشت، دانیشت بێ ئەوەی کاکۆ سەری بۆ هەڵبڕیبێ.

سەرەڕای ئەو شەڕە قورسە کارۆلین لەو نووسینە سەرسام بوو، هێڵەکانی ورد و باریک و سوور بوون، ئەو دیوەی بەردەکە سپی بوو، لوس کرابوو، کاکۆ ئەوەندە خەریکی ببوو بۆنی ئەوی گرتبوو، بێ ئەوەی چاو هەڵبڕێ و سەیری کارۆلین کات، دەستی کرد بە خوێندنەوە:

**ئەستەمە تۆ دۆزینەوە..**
**کە من بارانم تۆ هاوین**
**کە من بەفرم تۆ هەتاو**

**ئەستەمە تۆ دۆزینەوە..**
**کە من زانابیم تۆ نەزانی**
**کە من جەهلم تۆ عیرفان**

**ئەستەمە تۆ دۆزینەوە..**
**کە من هەبوونم تۆ نەبوون**
**کە من خودام تۆ بێ ئیمانیی**

**ئەستەمە تۆ دۆزینەوە..**
**کە من خونچەم تۆ پیربوون**
**کە من هاتنم تۆ چوون**

**چەند ئەستەمە.....**
**مردن وەختێک تۆ دەژی**
**چەند ئەستەمە....**
**ژیان وەختێک تۆ دەمری.**

کارۆلین رەنگی وەک رەنگی پانتۆڵەکەی کاڵ بۆوە، حەزی دەکرد بۆ خۆشی کاڵ کاڵ بووبایەوە و وەک گەڵایەک یان توێکڵی قەدی دارێک، یان بەردێکی شینباوی بەنەخش لەوێ هەر لەو جێگایەی لێی دانیشتووە کەوتبا، بەڵکو کاکۆ تەپوتۆزی سەری تەکاندبا و رستەیەک یان دێڕە شیعرێکی کۆن و پڕ حوزنی لەسەر دیبایەوە. ئەو کچە خوێندەوار و ئەوروپایی و عاقڵە حەزی دەکرد لەسەری نووسرابا:

«ونم کە، ون ونم کە،
هێندەی سەدان دار هەنار،
گەڵام بەسەردا بڕێژە»
کە روانییە رەنگی خۆر ئەو جار بە دەنگێک کە ببیسترێ، گوتی:
– بەڵام گەڵای نارنجی.

کارۆلین لە بیری بوو هەر ئەو رۆژەی کاکۆ دەستی گرت و لە ناو دەستە خۆڵاوییەکانی خۆیدا ونی کرد، سەری خستە سەر سینگی، کە ئەو کاتە هێندە بە توندی هەناسەی دەدا خەریک بوو مەمکەکانی لە ملیوانەی تیشێرتە سپییەکەیەوە بێنەدەر، قژی خاوی کاکۆ کەوتبوو سەرەیان و بۆن خۆڵێکی شێدار لە قژییەوە بەسەر هەموو لەشیدا دەرڕژاو بۆنی گیایەکی بێئامانیش پڕ پڕ پڕ تاخوا حەز کات پڕی کردبوو.

کاکۆ دەستی گرتبوو، هەروا وەک دەفتەرێکی لوولکراوی باریکی بەدەستەوەبێ بە ناو دارستانەکەدا دەیگێڕا، لق و قەدی دارەپیرەکان چووبوونە ناویەک کە هەرگیز ئەو تێکەڵبوونەیان بە گەنجی بۆ هەڵناکەوێ. هەندێکیان تەنها کۆلکەدارێکی قەڵش قەڵش

و بەگرێ مابوونەوە، دەیان ناو و سەدان ناونیشانیان لەسەر هەڵکەندرابوو، وێنەی جۆراوجۆریان لەسەر کێشرابوو، هەزاران وشە و دەستەواژەی ناتەواو و پڕپچڕیان لەسەر بەجێمابوو کە بێجگە لە خاوەنەکانیان بۆ کەسی دیکەمانایەکی نەبوو، دواتر کاکۆ گوتی:

– هەر عاشقە و دارێکی هەبووە.

دواتر گوتی:

– دارێک هەم ماڵ بووەو، هەم ڕێگای سەفەر و هەم وێستگەی چاوەڕوانی.

جا گوتی:

– بێگومان هەر دارەو چەندان ڕێبواری هەبووە بۆ خۆیان نا، بەڵام لە دەفتەری زەمەندا ناویان کەوتۆتە سەر یەک. بێ ئەوەی ببنە هاوسێ و هاودەم.

کاڕۆلین ویستی بڵێ:

– با ئێمەش دارێکمان هەبێ.

بەڵام نەیگوت، ترساش بڵێ:

– بۆ چاوەڕوانی.

دواتر پرسی:

– تۆ لەبن کام دار چاوەڕێ دەکەی؟

ئەوە دەنگی کاڕۆلین نەبوو، دەنگێکی جیاواز لە دەنگی ئەو، کاڕۆلین لەو دەنگەی خۆی سەرسام بوو، کاکۆ لە ژێر دارێکی زەبەلاح وەستا کە بۆ خۆی لە ژێریدا هەر هێندەی هەنگێک دیار بوو. دەیان ناو لەسەر قەدەبڵاو و ڕۆچووەکانی نووسرابوون، کاکۆ نەیویست بیر لە ڕۆچوونی ناوەکان بکاتەوە، سەرنجی دایە ئەو شوێنانەی دارەکە کە وەک ئەشکەوتی لێهاتبوو، پەنجەی خستە سەر ناوێک و گوتی:

– ئەوەیان میر چاوک بیست و یەک ساڵ لێرە چاوەڕێ بووە، ئەوی دیکەیان سیزار ناوێکە سی و شەش ساڵ لێرە ماوەتەوە، ئەوەیان هەژدە ساڵ و ئەوی دیکەیان بیست و پێنج ساڵ...، هەر کەسەیان ئاسەوارێکی جێهێشتووە، بڕوانە ئاسەواری دڵ.....

پێش ئەوەی قسەکەی تەواوکات، کاڕۆلین پرسی:

– کەس بەدەنگیانەوە هاتووە؟

کاکۆ بێ بیرکردنەوە، ویستی بڵێ «خودا»، ناویستی بڵێ «عەشق» نا ئەویش نا، ویستی بڵێ «وشە» تەواو ئەوەیانە، هەر لەو کاتەدا «مۆسیقا» وەک مانگێکی خەمبار، خەمبار، بەڵام درەوشاوە لە ئاسمانێکی خۆڵەمێشییەوە دەرکەوت.

کوڕە گەنجەکەی باخەوان کە ئەو کاتە تەمەنی تەنها حەفتا و سێ ساڵ بوو لەجیاتی کاکۆ گوتی:

– دیارنییە، زۆربەیان هەر لێرە مردوون، ئەوانەی لە مردنیش بێئومێد بوون هەروا تاک و تەنها ژیانێکی دیکەیان لە دنیا یەکی دیکە پێک هێناوە.

کارۆلین دیسانەوە پرسی:

– واتە لە و دیو چاوەڕوانییەوە هیچیان نەدیوە، زەمەنێکی بێ سەمەر بووە؟

دیسانەوە کوڕە گەنجەکەی باخەوان گوتی:

– دیار نییە...سەرەڕای ئەوەش ئێمە هەمووومان چاوەڕوانین، چاوەڕوانیش شێوازێکی ژیانە.

کارۆلین گوتی:

– سەختترین شێوازیانە. هەموو باخەوانەکان وابیردەکەنەوە؟

ویستی بڵێ «بەڵام درەختەکان هەر لە چاوەڕوانیدا دەژین»

کەچی باخەوانەکە بە پێچەوانەی سروشتی کەم دوێنی خۆیەوە، دیسانەوە گوتی:

– نا، هەرگیز، باپیرم تەواو پێچەوانە بیری دەکردەوە، ئەو دەیگوت، ئینسانەکان، گیاندارو درەختەکان چاوەڕێن، پێش ئەوەی بێنە ئێرە (بە ئێرەی دەگوت دنیای بۆگەن کردن) لە مەودایەکی دیکە بە هەزاران ساڵ لە بێ ئاگاییدا چاوەڕێن، بۆیە کاتێک هەلێکیان بۆ هەڵدەکەوێ جارێک دەژین، نابێ هەرگیز لێرەش هەر چاوەڕێ بن، دەبێ بژین.

کارۆلین زۆر بە هێواشی گوتبووی:

– ژیان بەرگەی چاوەڕێکردن ناگرێ، راست دەکات ئەو باپیرەی تۆ تەواو راستی فەرمووە.

## نهێنی

ئەوان هەر سێکیان ژەنیاری موراد بەگ و کارۆلین و ئارتووش کوردە دەفڕین، پێکەوە بۆ سۆراغی کاکۆ کەوتبوونە فڕین. ئارتووش کوردە ئەو دیمەنەی کاکۆی هەر لەبەر چاو بوو، کە بەخۆی و باوەشێک لە بۆنی دارستان هاتەوە ماڵ و چاوی بە هەموو شوێنێکدا دەگێڕا وەک ئەوەی دنیا هەر ئێستا ڕۆنرابێ و ئەو بیەوێ یەکەم کەس بێت کەشفی کات، ئارتووش کوردە ئەو ڕۆژە چاوی کاکۆی وەک چاوی باڵندە هاتە بەرچاو، چاوی ئەو باڵندانەی لەزەتی گەرمی لەشی مرۆڤ دەزانن و چاویشیان هەر لە ئاسمانە، ئەو چاوانەی هەرگیز لە شوێنێک ناوەستن و بەسەر هیچەوە ناگیرسێنەوە. ئەو ڕۆژە کاکۆ لە پڕ و بێ بیانوو گوتبووی:

– ئیدی چاوەڕێ نابم،

ئەو فەرامۆشکارانە گوتبووی:

– ئی چی؟

کاکۆ یەکسەر ڕەنگەکانی دا بووە دەست:

– دەبێ من بە دوای ئەو نهێنییەدا بچم.

ئەو جارە دایکی سەرسام و حەیران پرسی بووی:

- کام نهێنی؟
کاکۆ ویستبووی بڵێ «نهێنییەک لەوسەری دنیا» ویستبووی بڵێ
«نهێنی کچێک کە هەمیشە بەدوامەوەیە» ویستبووی بڵێ
«نهێنییەک کە ئۆرانۆسی لەگەڵ خۆی برد، نهێنی کچی سەوز، نهێنییەک کە ناوێکی نییە و نازانم چییە» دیسانەوە ویستی بڵێ
«رازێک کە دەبێ بیدەمە دەست کەسێکی دیکە».
زۆر بەپەلە گوتی:
- نهێنییەک وەک مێرووله بەگیانم وەربووە.

ئارتووشەکان هەر هەموویان لە وشەی نهێنی دەترسن، نهێنی، واتە شاردنەوە، دەبێ ئێمە چی لەیەکتری بشارینەوە، هەر لە منداڵییەوە فێریان کردبوو، کەنهێنی ژیانی ئینسان وێران دەکات و بەختەوەری لێدەستێنێ. بۆیە هەوڵیان دەدا هیچ نهێنییەک لە ژیانیاندا نەبێ، ئەو رۆژەش کە لەگەڵ مینۆسی کوڕی قەشەی گەڕەکەکەیان، کە لە دایکێکی ئەرمەنی و باوکێکی جوولەکە کەوتبۆوە و جەنابی قەشە کردبووی بە کوڕی خۆی، یەکتریان لە باوەشکرد و ئاوزایە هەموو لەشییەوە، ئاوێک تۆزێک لە ئاوی باران گەرمتر، هەر کە گەیشتەوە ماڵێ هەمووی بۆ دایکی گێڕایەوە و باپیری کە تا ئەوکاتە لەسەر خۆی مابوو لە پشت چاویلکەکانییەوە تەماشاکرد و بە هێمنی لە ژوورەکە چووە دەرێ، ئەو رۆژە لە درکاندنی ئەو نهێنییە هێندەی باوەشی مینۆس لەزەتی برد، لەزەتێک لەوپەڕی ترسدا لە دایکبووبێ.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لە هەر شوێنێک کە دەیانزانی ئەرمەنییە، راستە ریزێکی زۆریان لێدەگرت و دڵنەواییشیان دەکرد، بەڵام لە کۆتاییدا واسەیریان دەکرد کە نهێنییەکی مەترسیداری لە پشت خۆیەوە شاردۆتەوە و نهێنییەک کە هەرگیز نایدرکێنێ.

لەو رۆژەشەوە کە پەیوەندی لەگەڵ دەفتەرە بەرگ چەرمە قاوەییەکەدا پەیداکرد ئیدی دیواری ئەو نهێنییە بەرزتر و پانتر بوو، هەمیشە نهێنی ئەرمەنی بوونی خۆی بەیان دەکرد و هیچی لەو هەستەی خۆی نەدەشاردەوە (بۆ خۆشی دەفتەرەکەی وەک بەشێک

له ژیانێکی دیکه تەماشادەکرد)، بەڵام دیسانەوە لەپشت چاوەکانییەوە نهێنییەک دەما کە بەرانبەرەکەی هەوڵی تێگەیشتنی نەدەدا و هەنگاوێک لێی دوور دەکەوتەوە. هەرکە یەکەم رۆژیش زانی کاکۆ دەفتەرە بەرگ چەرمەکەی بردووە، دیتی ئەو تاکە نهێنییە چۆن ژیانی خێزانەکەی وێران دەکات. ئەو دیسانەوە حەقی بە خۆی دەداو دەیگوت:

– بۆ نابێ من نهێنییەکی خۆم هەبێت، نهێنییەک کە تەنها پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە.

نەیدەزانی لەو دوو منداڵەی ونی کردوون کامیان خەمی قورسترە، کاکۆ کە هەموو خۆشییەکی دنیای بوو، کاکۆ کە لە جەستەی ئەودا دروست ببوو، تاڵە داوێکی باریک، بەڵام لە پچڕان نەهاتوو بە جەستەی ئەوییەوە دەبەستەوە کە چەند دوورکەوتبایەوە قایمتر و قایمتر دەبوو. یان دەفتەرێک کە بەڕاستی منداڵێکی بریندار و کوژراوی ناو مێژوو بوو، منداڵێک کە گیانی نەدەسپارد، کوژراوێک کە دنیایی جێنەدەهێشت، منداڵێک لە خێزانەکەیەوە، لە نەتەوەیەکەیەوە بە ئەمانەت دابوویانێ، منداڵێک کە بۆ ئەبەد پێویستی بە یەکێک بوو بیپارێزێ. دەفتەرێک خوێنی دەردەداو تەنها خوێنەرەکانیشی دەخنکاند.

## ژەهر

ئارتووش کوردە دەفڕێ بە ناو هەورەکاندا دەفڕێ، بە ناو زەمەنێکیشدا دەفڕێ کە دیسانەوە هەمووی هەور بوو. ئەو نامەیەی هاتەوە یاد کە بۆ کاکۆی منداڵی نووسیبوو، ئەو کاتەی بۆ خۆی چووبووە ناو گرووپێکی ژنانی ئەرمەنی، ئەو گرووپە ناویان لە خۆیان نابوو، «خێوەکانی ئارارات» ئەوان نیازی هیچ چالاکی و کارێکیان نەبوو لە ناو خەڵکدا، تاکە کاریان گێڕانەوەی حیکایەتە جیاواز و لە یەک چووەکانیان نەبێ بۆ یەکتری. هەموو ڕۆژێ ژنێک دەستی دەکرد بەگێڕانەوەی چیرۆکی بنەماڵەکەی ئەوانیش سەرەڕای ئەوەی بە هەست و سۆزەوە گوێیان دەگرت دەبوو بە دوو تەسجیلی جیاوازیش حیکایەتەکان تۆمارکەن. هەموو دانیشتنەکانیان بە گریانێکی بەکوڵ کۆتایی دەهات. گرووپی خێوەکان توانیان بێ ئەژمارە حیکایەت کۆکەنەوە، سەدان، بەڵکو هەزاران کاسێتیش پڕکەنەوە لەو حیکایەتانەو گریانی خۆیان. ئەندامەکانی ئەو گرووپە هەرگیز هەوڵیان نەدا ئەو چیرۆکانە بڵاوکەنەوە، بە شێوەیەکی نهێنی هەڵیان دەگرتن و دەیانپاراستن.

ئەوەی جێگای داخ بوو لە ماوەی کەمتر لە شەش ساڵ، بیست و یەک کەسی ناو

ئەو گرووپە بە تەواوی کوێربوون و زۆریشیان بە توندی چاویان دایە ئازار، یەکەم ئامۆژگاری پزیشکی چاو بۆ و نەخۆشانە بێ ئەوەی بزانێ چ کارەن ئەوە بوو، کە نابێ هەرگیز بگریەن و فرمێسک خەریکە بە یەکجاری چاویان داپۆشێ، ئەوەش واتا کۆتایی هاتنی گرووپی خێوەکانی ئارارات.

ناخۆشترین رۆژی ئارتووش لەو گرووپەدا ئەو رۆژە بوو، کە یەکێک لە کچە ئەرمەنییەکان کە دایکی ماوەیەک پێشتر کوێرببوو بۆ خۆشی ئەندامێکی چالاک و سەردولکە بێژو و دەنگ هەڵگرەوەشیان بوو، هەواڵ و پێشنیارێکی سەیری هێنابۆوە، هەواڵەکە ئەوەبوو لەو میوانخانەی ئەو کاری تێدا دەکات چەند ئەفسەرێکی تورکی بۆ هاتووە و بۆ ماوەی دە رۆژ دەمێننەوە، کاریان بە درۆخستنەوەی هەموو ئەو دەنگۆو قسەو قسەلۆکانەیە لەسەر کوشتاری ئەرمەنییەکان دروست بووە، بە درۆخستنەوەی ئەو نەتەوەیەیە کە تەنها لە سەر حیکایەتی خورافی دەژیت. ئەوانەش هەموو لە پرۆتۆکۆلێکی تێگەیشتن و هاوکاری نێوان نەتەوەکان جێ کراوەتەوە.

سەرۆکەکەیان لە مشتوومڕێکی شەوی پێشتر تووڕە ببوو، لە کاتی نانخواردنی بەیانیدا لە نێوان خۆیاندا گوتبووی:

– من ئەوکاتە هەبام بۆ دەرمانیش یەک تاکە ئەرمەنیی پیسم بەزیندووی نەدەهێشت هەم دنیام لێ پاک دەکردنەوە و هەم کەسیش نەدەبوو هەواڵی مردنیان بگێڕێتەوە.

دواتریش ئەو کچە ئەرمەنییە پێشنیارێکی پڕ مەترسی و پڕ تاوانی کردبوو، ئەو کچە دڵڕەقە گوتبووی:

– من دەمەوێ ئەو ئەفسەرە بکوژم.

خێوەکانی ئارارات هەموو بەیەکەوە، بێ ئەوەی بڕیاریان دابێت دایانە پڕمەی گریان، ئەوی هەرە بەتەمەنیان هەر بەگریانەوە گوتبووی:

– دایکی ئەو ئەفسەرە ئێستا چاوەڕێی دەکات.

کچە دڵڕەقە ئەرمەنییەکە گوتبووی:

– با ئەوەندە بگریت هەتا چاوی دادێت.

دواتر ئەو کچە وەک جەللادێک دێتە بەرچاویان و وەک گورگێک کەڵبەکانی خەریکە درێژبن. ژنێکی کە پرسی بووی:

– چۆن دەیکوژی کە تۆ تائێستا دەمانچەت نەدیوە؟

ئەو گوتبووی:

– من لە خوێن دەترسێم بۆیە خوێنی ناڕێژم، خوێنی ئەو ئەژدیهایە ببینم بێهۆش دەبم.

هەموو گوتیان:

– چۆن دەیکوژی؟ خۆ تۆ هێندەی فڕووجێکی! ئەوت پێ ناخنکێ.

ئەو زۆر دوور لە رۆحییەتی قوربانی خۆیەوە، زۆر دوور لە فرمێسکەکانی خۆی و کوێربوونی بێدەنگانەی دایکی، گوتی:

– ژەهرخواردی دەکەم، بەجۆرێک ئەو کرم و مارانەش بتۆپن کە گۆشتە بۆگەن کردووەکەی لە ناو گۆڕەکەیدا دەخۆن.

لەگەڵ ئەو قسەیە، لەگەڵ وشەی ژەهر ئەو ماڵە لە قووڵایی خۆیدا تاسا، وەک چەقۆیەک لە ناوەندی دڵی بدرێت کپ، کپ تا قیامەت کپ بوو. ئەو رۆژە بۆ ئارتووش کوردە رۆژێکی سەخت بوو، لەگەڵ وشەی ژەهر و ئەو دەمەقاڵییە بێ مانایەی هاوڕێکانی چاوەکانی تاریک بوون و دنیا لەبەر چاوی سووڕا و بێهۆش بوو. ئەو نەیدەزانی چەند کاتژمێر بە بێهۆشی ماوەتەوە، بەڵام هاوڕێکانی زۆر گرینگیان پێنەدابوو و لەسەر قسە و هەڵچوونی خۆیان هەر بەردەوام بوون، تا هاریازی خوشکی دێت و دەموچاوی دەشوات و عەتربە لووتی دا دەکات و بەئاگادێتەوە. وەک خەون ئەو بەشەی دوایی لەبیرە، ژنە ئەرمەنییە بریندار و دڵساردەکان ببوونە سێ بەش: بەشێکیان لەگەڵ ئەو کچە بوون و لایان وابوو ژەهرخواردکردنی ئەفسەرێکی تورک کە حەزی کردووە دوا ئەرمەنی بتۆپێنێ و بکوژێ تاهەواڵەکەشیان بەکەس نەگات کارێکی شۆڕشگێڕانەیەو ئەرکێکی نەتەوەییە، بەڵام ئەوانیش دیسانەوە دەترسان و ئەو ئیمزایانەیان بیردەکەوتەوە کە بۆ و رێکخراوانەیان کردبوو دژی بەرهەمهێنانی دەرمانی کوشتنی بە کۆمەڵی زیندەوەرە

بچووکەکانی ناوکێڵگە فراوانەکان کە بۆ قڕکردنیان بەکاریان دەهێنا.

بەشی دووەمیان دەیانگوت نەدەبوو ئەو کچە بەو شێوە دڵڕەقانە بیرکاتەوە، لەسەر ئەو تاوانەی کە باسێکی هێندە پڕ خوێن و مردنێکی هێندە کپی هێناوەتە گۆڕێ، دەبێ ڕێگای هاتنە ناو ئەوماڵەی بۆ ماوەی سێ مانگ لێ بگیرێ.

بەشی سێیەمیان کە پووره هاریازی دەمڕاستیان بوو، بۆ یەکجاری بڕیاریاندا لەو ماڵە بێنەدەرێ.

ئەو بڕیارەی پووره هەریازی لەو دڵتەنگییە قووڵەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە ئارتووش تێی کەوتبوو. هەر ئەو بڕیارەش ئەو ماڵەی لە بۆگەن کردن و کوێربوون ڕزگارکرد. ئەو گرووپە کە دواتر بە ژنانی پێڵاو مۆر لە ناو هەموو ئەرمەنییەکان ناسران، وەک کۆمەڵێک هەنگ و پەپوولەی سەرمابردووی زستانێکی سارد لەو ماڵە تاریکە هاتنەدەر و شارە و شار و دێ بەدێ دەستیان بەگەڕان کرد، چوونە هەر شوێنێ، هەر ماڵ و یانە و گازینۆ و مەلهایەک ئەرمەنییەکی تێدابێ، هەموو ئەو حیکایەتانەی فێری بووبن دەیان جار و سەدان جار گێڕایانەوە. چەندیان دەگێڕایەوە دەنگیان ناسکتر و نەرمتردەبوو.

شەوی ئەو شەڕە قورسەی ژنانی حیکایەتخوێن بۆ ئارتووش کوردە شەوێکی قورس بوو، نەیتوانی بیربکاتەوەو بڕیاربدات و لە هیچ تێ بگات، ئەو شەوە شەوێکی سەخت و پڕ برین بوو، کامیان.! ئەو ژنە دڵڕەقانەی دوای ئەو هەموو کۆستەی خۆیان دەیانویست ژەهر بەکاربهێنن؟ دواتر قەشەیەکی چەپرەو گوتبووی:

– ئەو ژنانە دڵیان رەش بۆتەوە، چۆن فرمێسک چاوی کوێرکردوون، هەر ئاوا بەو ئاسانییە حەسرەت دەشێ دڵی هەندێکمان ڕەش هەڵگەڕێنێ.

کامیان.! مانەوە لەگەڵ ئەو ژنانەی وشەی ژەهر گێژی کردبوون و ئەویان لەوێ جێهێشتبوو، گریان بەسەر یەکتردا تا کوێربوون. کامیان.! گەڕان و ئاوارەبوون بە دنیادا، گێڕانەوەی یەک لە دوای یەکی چیرۆکە سامناکەکان، دابەشکردنی حوزن بەسەر ئەو خێزانە بریندارانەی دەیانەوێ لە پەناوە جارێک وەک مرۆڤ بژین.

ئەو شەوە ئارتووش دەبوو یەکیان هەڵبژێرێ، پێش ئەوەی بڕیارەکە یەکلاکاتەوە نامەیەکی بۆ کاکۆی کوڕە بچووکەکەی نووسی کە ئەو کاتە لەگەڵ هاوپۆلەکانی بۆ گەشتێکی یەک هەفتەیی چوو بوو، نامەکەی بە ڕۆحییەتی حەکیمێکی دنیادیدەوە دەستپێکرد:

«تۆ جارێ لەوە بچووکتری لەو هەموو دەردەی من تێ بگەی، رۆژێک پێویستت بەوە دەبێ گوێت لە خۆم بێت، من بە سەفەرێک دەڕۆم، دەشێ دوا سەفەرم بێت، لە ژوورەکەت چاوەکانم جێدەهێڵم و لە ڕێگای مەکتەب پێیەکانم و لە پۆلدا دەستەکانم دەخەمە ناو دەستت، من هەمیشە لەگەڵت دەبم. ئەی کوڕە...»

هەر زوو لە نووسینی نامەکە پەشیمان بۆوە و خستییە ئەولاوە، هەرچۆنێ بێت دەست کاکۆ کەوتبوو. ئەو نامە ناکامڵە بۆ کاکۆ تەنها مەرەکەب و کاغەز نەبوو، ئەو نامەیە بۆ و منداڵە گرینۆک و ترساوە گوللە بوو، گوللەیەکی ئاگردار و ڕێک ناوچاوان بپێکێ. هیچ جێگایەک نەبوو بە ئەندازەی گرینگی ئەو پارچە کاغەزە تاکاکۆ لەوێدا بیشارێتەوە. ویستی بگریێ، گریانێک بۆ و حوزنەی لە قووڵاییدابوو نەدەکەوتە سەرلێوی. تاسا بوو. هەموو وشەکانی نامەکە نەرم و جوان و پڕ ئاسوودەیی بوون لەهەمانکاتدا پەیامێکی توند و قورسیش بوو، بڕیارێکی یەکلاکەرەوە لەو دیو دێڕەکانەوە بوو، کە کاکۆ نەیدەتوانی بەرگەی بگرێ.

## پڵینگ

ئەوان هەر سێکیان ئارتووش کوردە و کارۆلین و ژەنیاری موراد بەگ دەفڕین دارستانەکانی ئۆڕانۆسیان بڕیبوو، کەنیسەی سان ئەندریاسیش لەو پەڕی تەنهایی و پیریدا خواحافیزی لێکردبوون، ژەنیاری موراد بەگ ئەو کەنیسەیەی بە هۆی کاکۆوە ناسی، دەنا چەند ساڵ بوو لەو شارەدا دەژیا رۆژێک تەنهایی ئەو کەنیسەیە سەرنجی رانەکێشابوو. ئەمڕۆش لەوسەرەوە دەیدی قەشە جۆلیۆس ئەندریاس بێهوودە لەپە دەستی راگرتووە تا باڵندەی تۆس لەسەری بنیشێتەوە و ئەگەر بکرێ دڵۆپە ئاوێکی رووح کە هیچ شوێنێ تەڕناکات بخواتەوە، هەر چەندە ژەنیاری موراد بەگ باوەڕی وابوو، کە قەشە جۆلیۆس ئەندریاس تەنها خەیاڵێکە و هیچی دیکە. کاتی خۆشی بەکاکۆی گوتبوو بێگومان درەنگ پێی گوتبوو:

– ئەو باڵندانە رووحە سەرگەردان و ونەکانی دنیان ئێوە لە شێوەی باڵندەدا دیتووتانە.

کاکۆ هەر ئەو کاتە پرسی بووی:

– مەبەستان لە رۆحی سەرگەردان و ون چییە؟

ویستبووی وەڵامێکی سادەی بداتەوەو کۆتایی بە گفتوگۆکە بێنێ، بۆیە گوتبووی:

– هەموو ئەو رۆحانەی پێشوادەی خۆیان لە جەستەیان دابڕان.

ئەو رستەیە ئەو کاتە بۆ کاکۆ قورس و ناخۆش بوو، بەڵام دیسانەوە بە خۆشی پرسیبووی:

– تۆ رۆحێکی وادەناسی؟

ژەنیار زۆر فەرامۆشکارانە گوتبووی:

– هەزاران.

کاکۆ لە کاریگەری ئەو قسەیە هەنگاوێک لە بابی دوورکەتۆتەوە، گوتوویەتی:

– هەزاران! من تەنها وێنەیەکی دوور و کاڵم لەو باڵندانە دیتوە ئەویش پیرەمێردێکی تەرکە دینا و دیندارکێشاویەتی سەد و پەنجاو ئەوەندە ساڵ لەوەوبەر.

دواتر کاکۆ شەرمەزارانە گوتی:

– دەیانبینی؟ ئەو رۆحانە دەبینی؟

ژەنیاری موراد بەگ لەو پرسیارانە ماندوو دەبێت و دەڵێت:

– ئەو پیرە پیاوەش وێنەی سەرابی کێشاوە. واز لەوە بێنە، با تۆزێک گوێ لە مۆسیقا بگرین، بائەمڕۆ جارێکی دیکە بچینەوە سەیری فیلمی تایتانیک، دەزانی کاکۆ زۆر لە جاک دەچێت.

کاکۆ لەکوێدا لە جاک دەچوو، بۆ ئەو قسەیەی کردبوو، هەروا حەزی دەکرد کاکۆ وەک جاک بایە بێگومان تەنها لەسەرکێشی و رۆمانسییەتدا، ئەو حەزی چووبووە ئەو شیرینییەی جاک لە ناو خەڵک بۆ خۆی دروست کردووە. بیری لە ون بوون و مردنی جاک نەدەکردەوە، بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەو پاپۆڕە چۆن تێک شکاوە چۆن وێران بووە، بەڵکو ئەوەی بەلاوە گرنگ بوو کە کوڕێکی گەنج لەسەر وێرانەی کەشتییەکی غەرقبوو و دوای سەد ساڵ کۆشکی پاشایەتی خۆی لەسەر فراوانترین عەرش بونیاد دەنێ.

ئێستا ژەنیاری موراد بەگ و ژنە ئەرمەنییەکەی و دڵگری کوڕەکەی دەفڕن، بە ناو هەورەکاندا تێدەپەڕن، ئەو دوای تەمەنێک جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە وڵاتەکەی، هەر چۆنێ بێت بە زیندوویی خۆی، وەختێک کە خوێن هێشتا بە دەمارەکانیدا هەڵدەگەڕێ پێدەنێتەوە سەر خاکی کوردستان. ئەو هەستی دەکرد کە هەموو ئەو گەشکەو ئارەزوو و دڵگەرمیانەی لە ناخیدا ناشتوونی، جارێکی دیکە رایناچڵەکێنن. نەیزانی بوو، بەڵام زۆر بە وردی سەیری پێڵاوەکانی کرد و قورسی و خاوێنی و نەرمی چەرمەکەی هەڵسەنگاند. روانییە پێی هەردووک هاوسەفەرەکەی توند پێڵاوەکانیان گرێدابوو. نەیدەزانی چ هێزێک لە ناخەوە رایدەچڵەکێنێ و ئاگر لەسەر جومگەکانی دەکاتەوە. دەیان سەفەری کردووە و بە وڵاتاندا گەڕاوە، زۆر سادە و ئاسایی چۆتە شارەکان و تاکسی گرتووە و چۆتە ئوتێلەگرانبەهاکان و لە ماڵی کچان و ژنانی هاوڕێی ماوەتەوە و لەگەڵ ژنە سەرخۆشێکدا، کە هەر ئەو شەوە ناسیویەتی تا بەیانی گریاوە وگەشتی بۆ کەنار دەریاکانی ئیسپانیا و ئیتاڵیا و فەڕەنسا کردووە و هەتا چۆتە تایلەند و کۆریا و یابانیش هەرگیز پێش گەیشتنی هەستێکی نامۆ داگیری نەکردووە و تادانەبەزیوە بیری لەو وڵاتەش نەکردۆتەوە.

ئێستا دەڵێی یەکەم جارە سەفەر دەکات و یەکەم جارە دەچێتە سەرخاکێکی دیکە. هەرچەند دوای ژنهێنانی کەمتر بە تەنها سەفەری دەکرد، بەڵام جیاوازییەکی زۆری لە نێوان خاکی وڵاتاندا نەدەکرد. ئەو لە هەموو ئامێرە مۆسیقییە رۆژهەڵاتییەکاندا وەستابوو، زۆربەی کاتی تەنهایی خۆی بەو ئامێرانە دەبردەسەر، ئاوازەکانیان تاقیامەت، تا بئسەلمەسیر غەمگین بوون. بێگومان پێش ئەوەی ئارتووش بخوازێ. لەو ساڵانەی دواییدا سەرقاڵی ژمارە و کۆکردنەوەو ژمێریاری بوو بە هەموو تواناشی هەوڵی دەدا هیچ پەیوەندییەک لە نێوان ژمارەکان و رۆحی خۆیدا نەدۆزێتەوە، لە پیشەی ژمێریاریدا ژمارەکان تەنها نۆن، ژمارەی دوور و درێژ وجوودی نییە. خۆ رزگارکردنی لە ژمارەکان لە خۆرزگارکردنی لە مۆسیقا قورستربوو.

بەڵێنی دابوو خۆشی حەزی نەدەکرد ماڵەکەی پڕکات لەو ئاوازە دڵکوژ و غەمگینانە. هەرچەند کاکۆ گەورەتر دەبوو ئەو زیاتر سوور دەبوو لەسەر ئەوەی وەک جەستەی

خۆی لە بیریان کات ڕەگی ئەو خەمانە تاپلەی مردن لە ناخیدا بشارێتەوە. زۆرجار سەرکەوتنی خۆی دەدیت دڵشاد و خوێن سارد و ئارام دەبوو، ئەو جارانەی کە درەنگ دەیزانی لە شوێنێکدا سەرکەوتوو نەبووە تاشێت بوون خوێنی دەکوڵی.

سەرنەکەوتنەکانی هەمیشە ئەو کاتانەبوو کە دەبووەوە خۆی و دەموچاوی تەسلیمی ئەو هەموو حوزنە دەبۆوە لە نیشتیمانەوە هێنابووی، ئەو حوزنەی وەتەن لەسەر ئێسقانەکانی هەڵکەندبوو. شمشاڵ فەشەلی ئەو بوو، ئەو دەیتوانی تا سەدەیەک یەک ئاواز بژەنێ بێ مەوداو دوورودرێژ وەک مەرگ بێت. ئێستاش دەترسا، زۆر دەترسا ڕۆژهەڵات جگە لەو خەمە هیچی دیکەی نەبێت، خەمێک کە کوڕەکەشی تا ئەو سەری دنیا لەگەڵ خۆی بردووە. ئێستا لەو دوا فڕینەیدا هەموو ئەوانەی لە بیرچووبۆوەو ئاگرێکی بچووک لەناو چاوەکانیدا هەڵکرابوو. بانگیان دەکرد بۆ وڵاتەکەی، بۆ و شار و گوندە بچووکانەی جێی هێشتوون، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی دەدا ئەو مێژووە لەبیر خۆی بەرێتەوە و وەک هەر وڵاتێک بچێتە ئەوێ. لەو هەموو ماوە دوور و درێژەشدا قسەکانی ئاغای موحسین ئەتایی شیرازی لە بیر نەچوو بۆوە، پێی گوتبوو:

– تۆ لەو ڕۆوە دەژی وابزانە بە گەورەیی لێرە لە دایک بووی، وڵاتی ئێمە جگە لە تەمەن کوشتن شتێکی دیکەی بۆ ئێمە پێ نەماوە، ئیدی باکوشتن لە خۆمان دوورخەینەوە.

ئەو وەڵامێکی توند و گەرمی ئاغای ئەتایی نەدابۆوە، گوتبووی:

– چ پیاوێکی بێوەفایە! بە هەتاوی خۆرهەڵات گەورە بووی ئەی خۆپەرست.

ژەنیار ئەو وەڵامەی ئەودەم گوتبوو، بێگومان بە خۆی، ئاغای موحسین ئەتایی دەشێ هەستێکی وای کردبێ، بەڵام هەرگیز بەسەر خۆی نەهێنا، ئەو پیاوە فارسە نێوی توانا و باوەڕ بەخۆبوون و جوانی شیرازی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بەڵام هەمیشە لە دوورەوە دەیڕوانییە ئەو کەلتوور و هێزەی شیراز، شارێک کە زۆر پێش سەرتاپای ئێران چۆتە ناو ئەلبوومی شارە هەر سیحرییەکانی دنیا. وەک کەسێکی بێگانەو نەشارەزا ئەو کەلتوورەی بەکاردەهێنا و هەمیشە دەیگوت:

– شیراز بەهەشتە، شیراز دڵی فیلی هەیە، وەلێ بۆ من نا بۆ پیاوێکی مەشەدی.

هەر لەو ڕۆژە سەرەتاییانەدا وەک خەمخۆرێک بە ژەنیاری گوتبوو:

– تۆ وەک پڵینگێکی بریندار وای، کەوتوویتە لانەی بەرازەوە،

ژەنیار ئەو کاتە خۆی بینیبوو لە شێوەی پڵینگێکیدا بە ناو ئەو شەقام و باخچە جوانانەدا تێدەپەڕی، بە دوای خۆیدا جۆگەلەیەکی باریک و درێژ، بەڵام تۆخ و پەیت رادەکێشێ. ئەو پڵینگە بریندارەی ڕۆژهەڵات سەری لە زۆر لە شارەکانی ئەورووپادا و بەڕادەیەک بۆنی خوێنی ئاخنیبووناو گوڵەکانی باخچەو هەناسەی دڵداران و بۆنی تریاکی ئاڵوودەکان و پرۆتۆکۆلی نێوان دەوڵەتان، ئەو بۆنی خوێنە کە پڵینگێکی خۆرهەڵات بە دوای خۆیدا رایدەکێشا دزەی کردە ناو جانتای قوتابیانی سەرەتایی و رستە دوور و درێژ و پڕ حیکمەتەکانی مامۆستایانی زانکۆکانی سۆربۆن و ئۆکسفۆرد و بەرلین و بەنسلڤانیا. لە ئەمریکاو لە بەناوبانگترین زانکۆی زانستیاندا وێنەی گەورەی ئەو پڵینگە هەموو لەش بریندارەیان هەڵواسیبوو، زۆرجاریش وەک گیانداریکی وەحشی کە مێژوو بە هەڵە فڕێی داوەتە ناو کتێب و شاری ئەوانەوە لێکۆڵینەوەی وردیان لەسەر پێکهاتەی جەستەو بۆنی خوێنی ئینسانکوژی دەکرد، توانیبوویان بیسەلمێنن کە هیچ بەشێکی ئەو گیاندارە وەحشییە لەو وێنانە ناچێ کە داڤێنشی بۆ ئێسقان و ژمارەی جومگەی گیانداری ئاسایی کێشاونی. زانکۆیەکی دێرین هەوڵێکی زۆریدا بیسەلمێنێ کە ئەو خوێنە رژاوە وەک هێڵە سوورەکانی سنوور ترسناکە و پێشنیاری کردبوو، کە ئەو پڵینگە لەو خوێنە دارستانییە پاک بکرێتەوە. ئەوەی وای کردبوو بیروڕاکانی ئەو زانکۆیە جێگای بایەخ بن ئەوە بوو کە زانکۆیەکی زانستی بوو، و تایبەتیش بوو بە لێکۆڵینەوە لە سروشتی گیاندارانی کێوی.

کاتێک ئەو پڵینگە بە ئەڵمانیادا تێپەڕی و راستتر بە شاری بەرلیندا و بە ڤێنگنشتاین شتراسەدا یەکێک لەنەوە دوورەکانی گۆتە، کە تەنها عاشقی ژن و شەڕاب بوو، پەنجەیەکی لەو خوێنەدابوو بە لێوی ژنە دولبەرەکەی ئەو ڕۆژەی داهێنابوو هەر بەسەر لێویەوە توند مژیبووی. ئەو نەوە خۆش مەشرەبە هەر ئەو شەوە لەسەر مەمکی سپی و بچووکی ئەو ژنە حەیرانە بە مەرەکەبێک هەم دیار بێت و هەم دیارنەبێت نووسیبووی:

«من به دوو کانی دەژیم یەکیان سپی و ئەوی دیکەیان سوور»

ئەو شاعیرە یان ئەو نەوەیەی گۆتە نەیتوانی چەند شیعرێکی جوانمان بۆ جێ هێڵێ، بەڵام رەچەڵەکی شەرابی سوور و سپی بۆ ئاشکرا کردین.

ئەو قسەیەی ئاغا موحسین ئەتایی شیرازی ژەنیاری موراد بەگیشی لە خودی خۆی بە گومان کردبوو. خۆی وەک پڵینگێک دەهاتە بەر چاو کە خۆی بەسەر زەویدا بخشێنێ و ناوی پڵینگ و جەستەی قورسی ئەو گیاندارەی لێبار بێت. لەو کاتی خشانەیدا لە هەموو شت زیاتر پێڵاو و پاوپووزی ژنانی دەدیت و دەیروانییە بەلەک و رانی رێک و پتەویان، زۆر درەنگیش فێربوو کە پڵینگیش بێت و بشیانلێسێتەوە. بۆ یەکەم جاریش لەزەتی لە ناونیشانی شاجوان و درندەکرد. هەر ئەو کاتەش بوو خانمێکی بە ناوی شەیدا شیرازی ناسی، شەیدا وەک ژنی ئاغا موحسین ئەتایی هات بۆ ئەو وڵاتەو ماوەیەکی باشیش وەک ژن و مێرد پێکەوە ژیابوون. شەیدا تەواو لە موحسین گەنجتر بوو، تەنها بیست و سێ ساڵ تەمەنی هەبوو بێگومان ئەو کاتەی کە ژەنیاری ناسیبوو، چاوەکانی شەیدا لە چاوی ئەو ئاسکە سرکانە دەچوون کە تەنها بۆ لەحزەیەک لە نێوان دوو داری دارستاندا دەردەکەون. بۆ نەفامترین راوچیش ئەوە لەحزەی گیرۆدە بوون بوو.

شەیدا شیرازی، سینگ و مەمکی بە ئاستەم گۆشتن، پەنجە باریک و درێژ. ژەنیار بۆ یەکەمجار وەک پڵینگێکی بریندار و کەساس دوای ئەو ئاسکە کەوت، هەر بۆ یەکەمجاریش ئاسک بەو هەموو زەوق و زیرەکی و هێزەیەوە و پڵینگ بەو هەموو مردن و برین و دڵشکانەیەوە. نەک پڵینگێک بە جۆگەلە خوێنەوە، زێوانە هەرە دڵڕەقەکانی دۆزەخ لە باوەشی شەیدادا ئارام دەبوونەوە. ژەنیار دەیزانی لە قووڵایی دۆزەخدا ئەو ئەژدیهایانەی ریخەڵۆی مەلا ریاکارەکان دەردەهێنن و لە ملیانی دەئاڵێنن لەبەر دەم شەیدا ملکەچ و ئارام دەکەون و لەسەر ئاوازی هەناسەکانی سینگی خەویان لێدەکەوێ.

ژەنیار شەرمی دەکرد، لە تەنیشت ژنەکەی دانیشتووە ئەو خەیاڵە درندانە هێرشی بۆ دێنن ، تۆزێک شەرمی دەکرد بە تایبەتی کە ئێستا لە فڕیندایە و رۆژهەڵات سەرگەرمی کردووە.

یەکەمجار خۆی دایە دەست شەیدا، شەیدا پەنجە هەرە ناسک و نینۆکە سوورەکانی بە توندی کووشینی پرتەقالێک لەزەکەری ئالاند، دەمی بەو هەموو مکیاجە سوورە تۆخەوە، هەناسەیەکی سوور و گەرمی دەپژاند، هەر هەمان شوێنە نەحلەتییەکەی بەمکیاجە تۆخەکەی لێوی داهێنا، ئەو بەپێوە وەستابوو لەو سەرەوە سەیری چاوەکانی شەیدای دەکرد، کە جارجار لەویان دەڕوانی، لەوەتەی هاتبووە ئەورووپا بۆ یەکەم جار لەسەرەوە روانییە دەموچاوی ژنێک، چاوەکانی لە دوو کوپەی شەڕابی رژاو دەچوون، لە دوو پیاڵەی هەنگوین دەچوون دڵۆپ دڵۆپ بڕژێنە سەر ناوکی. دواتر زانی شەیدا ژنی ئاغای موحسین ئەتایی شیرازی بووە. موحسین ئازادی کردووە و ئەویش مانگی شەوێک ئەو ئازادییەی خۆی بەو بەخشیوەتەوە لەو شەوەدا سەردانی دەکات و تابەیانی شەراب لەسەر ناوکی یەکدی دەخۆنەوە.

ژەنیار سەردەمێک ناو و ناونیشان و کورتە پێناسێکی هەموو ئەو ژنانەی دەنووسی کە سەرجێی لەگەڵ دەکردن، جیاوازیان و ریتمی هەناسەیان و وڕینەو قسە شیلەدارەکانیشی دەنووسین، رەنگی پێست و ئەو وڵاتەی لێیەوە هاتوون و هەتا ناوێکیشی بۆ شێوەی لەشیان دادەنا تا پەنجاوهەشت کەسیان بەردەوام بوو ئیدی لەو ژمارەوە تەنها ناوی یەکەمیان و ناوی ئەو شوێنەی دەنووسی کەلێی نووستوون، جا تەنها ناو و دواتر هەر ژمارە تا بەیەکجاری دوای عاشق بوونی بەئارتووش وازی لە شەو هاودەم هێنانەوە هێنا، بەڵام تا ئەو کاتە ئاغای شیرازی کاری خۆی کردبوو رۆژهەڵاتی تاقووڵاییەکی زۆر لای ژەنیار سڕیبۆوە، دواتر ئەو سڕینەوەی رۆژهەڵاتەبووە ویستێکی سەرەکی ژەنیاری موراد بەگ بە تایبەتی کە لەگەڵ ئارتووشی بڕیاری ژیانی پێکەوییاندا، هەردووکیان کۆک بوون لەسەر ئەوەی کە برینەکانی رۆژهەڵات بۆ ئەبەد لە ناخی خۆیاندا بشارنەوە. پێش ئەوەی ببنە ژن و مێرد ساڵێک و پێنج مانگ دڵدار و عاشقی یەکتربوون، چەندجار ویستی گوێ بۆ ئاغای موحسین ئەتایی شیرزای بگرێ و ئەو ژنە کە رەگێکی هەرە برینداری رۆژهەڵاتە لە خۆی دورخاتەوە، ئاغای موحسین ئەتایی گوتبوویی:

– ئەو ژنە بورکانی خوێنە، رەشەبایی حوزن و فیراقە.

ژەنیار بەو قسە بێ بنەمایانەی ئاغایی شیرازی رانەچەنابوو پێی گوتبوو:

– ئەو ژنە بێجگە لە دەمێک بۆ زەردەخەنە و چاوێک بۆ حەیرانکردن و بالایەک بۆ سەما هیچی دیکەی نییە.

موحسین لە وەختێکدا ویستبووی بە درکە ماسییەکی گەورە کە ماوەیەک بوو دەیلستەوە زەیتوونێکی رەشی بێناوک هەڵگرێ و بیخوا، بە دوو چاوی پڕ پرسیارەوە گوتی:

– مەبەستت خاتوو رۆسنە؟ خاتوو ئارتووش بنیامین رۆسن، بالایەک بۆ سەما و لێوێک بۆ زەردەخەنە!

ئەو وەلامی نەدایەوە موحسین ئەتایی گوتی:

– ئەوروپاییەکانیش بۆ مێردەکانیان دڵسۆزن « ئەگەربیانەوێ « یەکێ لەوان بخوازە بێ سەر ئێشەن، بەو مەرجەی کتێبێکی زۆر بێ بایەخیشی لەسەر رۆژهەلات نەخوێندبێتەوە. ئیدی هەرگیز بۆی باس مەکە ولاتەکەت بۆتە چوار بەش، ئەو قسە قۆڕانە بێجگە لە خەم سەمەرێکی دیکەیان نییە، هەرگیز باسی ئەوە مەکە زمانەکەت لە دنیادا قاچاغە. نەکەی باسی ئەوە بکەی لە ناو نەتەوە یەکگرتووەکان کەسێک بۆنی کوردی لێ بێت بە مەشخەڵەکەی دەستی پەیکەرەکەی ئازادییەوە هەڵیدەواسن. نەکەی باسی ئەوەی بۆ بکەی کە هەموو کورد بکەوێتە دەریاوە یان بیسووتێنی هێندەی ژیانی ئەو سەگە گرینگی بۆ رۆژنامەکان نییە کە لە یەکێک لە کەنارەکانی ئەمەریکا عاسێ ببوو.

ژەنیار زۆر شێلگیر و سەرگەرمانە گوتبووی:

– ئاغای ئەتایی تۆ پیاوێکی بە ئەزموونی بە سووک مەڕوانە نەتەوەکەم، من چەند ساڵێکە دەمەوێ وەک بەشەر بژیم و ئەگەر بکرێ برینە قووڵەکان فەرامۆش نەکەم، تۆش لەوەدا یارمەتیتداوم، بەلام خاتوو رۆسن کە ئێمە هەر پێی دەڵێین ئارتووش زۆر هێمنە و پەروەردەی ئەوروپایە.

ئاغای ئەتایی وەختێک سەری دەلەنگاند گوتی:

– بەلام ئەرمەنە، ئەو ئەرمەنانە تائێستا خۆشیان رانەوەشاندووە تا وەک بەرخێک

خوێنی مێژوویان لێ بێتەوە. تۆی کوردیش.. من بەگوڵاو شووشتمی تا بۆنی خوێن بەردەی کەچی یەک تاکە دڵۆپم لە بیرچێ لەناکاو سەرلەنوێ هەموو لەشت دەتەنێتەوە.

ژەنیار دووبارە گوتبووی:

– من ئارتووشم خۆشدەوێ هەرگیز بۆنی خوێنم لێ نەکردووە.

موحسین پێکەنی بوو، دەموچاوی ئاڵ و رووناک بوو، ئەوکاتە لاجانگەکانی سپی ببوون، قژی درێژ کردبوو وەک کلکی ئەسپ لە دواوە بەستبوویی. پیاوێکی پتەوە و جوان مابوو. دەستی بۆ پێکە وێسکییەکەی بردبوو جا گوتبووی:

– سەرخۆشەکان بۆنی دەمی یەکتر ناکەن.

دواتر زۆرخۆش پێکەنی بوو، چەند مەسەلە و نوکتەی بۆ گێرابۆوە، باسی پیاوێکی رەشتی بۆ کردبوو کە چووبوو ژنێکی سیغە کردبوو شەوێکی تەواو لەگەڵی ببوو جا بۆ بەیانی زانیبووی ئەوە هەر ژنەکەی خۆیەتی پێی گوتبوو:

– بابرۆینەوە خانم بەڕاستی من وتۆ لە یەک گڵ دروست کراوین.

زۆر پێکەنی بوو، کە چاوەکانی پڕ ئاو ببوون هەر بەو زەوقەوە گوتبووی:

– دەبێ بڕۆم ئەو شەو خانمی شیرازی دێتە لام ئێمەش لە یەک ترێ گیراوینەوە.

## كۆخت

هەر سێکیان دەفڕین ژەنیار و ئەرتووش کوردە و کارۆلین، بە سواری فڕۆکەیەکی بۆینگی گەورە، هەر سێکیان بەڕیزی یەکترەوە. فڕۆکەکە وەک خەنجەرێک دڵی ئاسمانی دەبڕی، شریخەی بڕینەکە وەک خەون دەکەوتە بەرگوێیان. ئەوان هەر سێکیان بە دوای کاکۆدا دەچوون. ئەوان هەر سێکیان بۆ کاکۆیەک دەگەڕان لە ناخی خۆیاندا ونیان کردبوو.

دارستانێک تا ئەوپەڕی دنیا، کارۆلین دەبوو دارەوداری بگەڕێ، ئەشکەوت و پەنا و پەسیوەکانی بەسەرکاتەوە. تا ئەوکاتەی کاکۆ بۆنی گڵی کۆن و شێداری نەگرتبوو بە ئاسانی دەیتوانی بیدۆزێتەوە، بۆنی کاکۆ بێ عەتر لە بۆنی رازیانە دەچوو، بەڵام هەمیشە بۆنێکی نەرم و شیرینی لە خۆی دەدا کە لە شووشەیەکی مۆری بن پان دابوو، ژێرەکەی لە شێوەی کلکی ماسی دروست کرابوو، کارۆلین بەو بۆنە کاکۆی دەدۆزییەوە، ئەو بۆنە کاڵ ببۆوە سەرەتا بە بۆنی گڵ و دواتر بە بۆنی گیا، کاکۆ بۆن گیابوو، ئەو گیا کورتانەی بەسەر بەردێکەوە دروست دەبن کە لە قەوزە نزیکترە تا گیا.

لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کاکۆ شیرین بوو سەردەمێک وەک قاوەی وشک لە دڵی کارۆلین توابۆوە، پێکەوە چووبوونە ئیتاڵیا و فەڕەنسا، چووبوونە یۆنان، بەیانییەکی تاریک بە تەمومژ گەیشتبوونە ئەوێ، لە یەکەم ئوتێل پێش ئەوەی جانتاکانیان بکەنەوە خەویان لێکەوتبوو، بەیانییەکەی کارۆلین چاوی کردبۆوە دیتبووی کاکۆ لەوێ نییە، لە پەنجەرەکەوە روانیبووی ئوتێلەکەیان لە شوێنێکی زۆر کۆن و بەرز و دڵگیری یۆنانە، هەر لەوێوە دیتبووی کاکۆ خەریکی وێنەگرتنی دیوار و پایەی کۆن و قەوسی پەنجەر و گومەزی رووخاوە.

چوبووە دەرێ تەمەکەی دوێنێ شەو نیشتبووە سەر گیاکە، هەر دووکیان بە پێخواسی بە ناو گیا خاوێن و نەرم و دڵ فێنک کەرەوەکەدا غاریاندابوو، هێندەی پێیان کرابوو یەکتریان لە ناو ئەو گیایە گەوزاندبوو، کارۆلین سمت و مەمکەکانی سووربببوونەوە و خوێیان تێزابوو، کاکۆ دڵخۆش بوو، کە زۆر زیرەکانە کامێراکەی لەسەر کورسییەکی نیوە شکاوی بەرد دانابوو، کە دیاربوو شوێنی دانیشتنی پاشایەکی دێرین و بە دەسەڵاتە، بەڵام کارۆلین گوتبووی:

– ئەوە کورسی شاژن بووە.

هەر ئەو رۆژە، شەوەکەی کاکۆ نەخۆش دەبێت و ناتوانن دوو رۆژ ئەو ئوتێلە بەجێبهێڵن، بەقسەی کارۆلین «دوو رۆژی شیرین بوون»، کارۆلین رای وابوو کە کاکۆ تەنها ئەو کاتانە لەگەڵ ئەوبووە کە قسەیان پێکەوە کردووە دەنا کاکۆ دەچووە ناو فەزایەکەوە بۆ خۆشی نەیدەتوانی بیشکێنێ.

کارۆلین کچێکی ئەورووپایی، قژێکی زەردی خاو، دووچاوی شینی تەڕ، لووتێکی باریکی کورتی رۆمانی، دەمووچاوێکی خڕ و پڕ وەک ئەوەی لە کرێمێک و هونەرمەندێک دروستی کردبێ و لە ژێرییەوە خوێن پەمەیی هەڵگەڕاندبێ. کاکۆ لە وەسفی کارۆلیندا گوتبووی:

– چ دەموچاوێکە هەر دەڵێی لە بەرگی گۆڤارێکی ئارایشی ژنانم کردۆتەوە!

ئەو رۆژەی بوونە هاوڕێ رۆژێکی خۆش بوو هەتاو دەرکەتوبوو، ئەوان بە پایسکیل

چووبوونە ناو دارستان، زۆر گەڕابوون هێلانەی بولبولێکیان دۆزیبۆوە کە لەسەر دارێکی کورتی ڕۆنابوو، تەنها یەک هێلکەی تێدابوو کارۆلین تەنهایی ئەو هێلکەیەی زۆر پێناخۆش بوو، کێ ئەفسانەی هێلکەیەکی تەنهای بۆ گێڕابۆوە، هێلکەی تەنها شوومە، گوتبووی دەبوو ئەو بولبولە دوو هێلکەی کردبا، کۆرڤیان بە ساردی خوارد، لە گەڕانەوەدا باران باری، توند، زۆر توند باری، تەڕ تەڕ ببوون، بەڵام سارد نەبوو، لە کۆختێک لایاندا، چۆڵ بوو لەسەر کای ناو کۆختەکە جلە تەڕەکانیان هەڵخست، هەر ئەو ڕۆژە، هەر ئەو ڕۆژە سەیر و تەڕە، هەر ئەو ڕۆژە پڕ باران و چۆڵ و هێلکە تەنهایە، هەر ئەو ڕۆژەی کۆرڤی ساردیان خوارد و سواری پایسکیل بوون، هەر ئەو ڕۆژەی لە کۆختی جووتیارێکی نەناس لایاندا، کەسەکەم هەر ئەو ڕۆژەی هێلانەکەیان دۆزییەوە و بەقسەی کارۆلین تاکە هێلکەیەکی خەمباری تێدابوو هەردووکیان بەپاڵ جلە تەڕەکانیانەوە، لەسەر کایەکی وشک ڕاکشان و لێوی یەکتریان زۆر بێ ئاگایانە لستەوە و پەنجە و گوێ و لووت و پێی یەکتر و نازانم کوێی دیکەی یەکتریان لستەوە دوای ئەوە هەر کەسە و جلی خۆی لەبەر کردەوە و سواری پایسکیلی خۆی بوو وەک دوو کەسی نەناس تەماشای یەکتریان نەکرد و بە دوو ڕێگای جیاوازدا هاتنەوە ماڵێ.

هەردووکیان خۆیان شووشت و بە خاولییەکی سپی و نەرم بێ ئەوەی بیر لە یەکتر بکەنەوە خۆیان وشک کردەوە. پێش ئەوەی ڕاکشێن بزەیەکی سەیریان هاتبووە سەر لێو هەر بە تەوس هەر کەسە بەخۆی گوتبوو:

– ئەرێ ئەو کۆختە چ بوو هاتە سەر ڕێمان.

دواتر چاویان لێک نابوو دووبارە بێ ئەوەی ئاگایان لە یەکتر بێت گوتبوویان:

– چ شیرینە باران و هەتاو پێکەوە.

هەر بۆ خۆشی بە پێکەنینەوە دیسان بە خۆیان گوتبوو:

– ئەرێ ئەو کۆختە چۆڵ و هۆڵ و سەگبابە چ فێڵێکی لێکردین.

هەروا سارد و ساکار و چۆڵ و هۆڵانە بوونە هاوڕێ بێ پەیمان و سوێندخواردن و داد و فیغان.

## تەم و مژ

ئەوان هەر سێکیان ژەنیاری موراد بەگ و ئارتووش کوردە و کارۆلین دەفڕین بە قووڵایی ئاسماندا، بۆ سۆراغی کاکۆ دەفڕین، بەڵام کاکۆ لە کوێیە؟ ئەرێ دەکرێ کاکۆ بەدوای هاورێیەکیدا کە هەرگیز ناوی کاکۆی نەبیستووە، کە لە زەمەنی کاکۆدا نەژیاوە چووبێتە ئەنادۆڵ؟ جیمس پۆڵ براون نزیکەی سەدەیەک لەمەوبەر، بەکامێرایەکی رەشەوە دەیان وێنەی سەربڕین و چاڵەخوێنی جێماو و کەنیسەی سووتاو و کێردی قەساب، سەرابی ترسی گرتبوو. هەرچەندە جیمس پۆڵ براون گەڕابۆوە ئەمەریکا و سەرۆکی ئەو وڵاتەی دیبوو چەندان وێنەی لە رۆژنامەکان بڵاوبۆوە و ژیاننامە و بەشێک لە کارەکانی و ئەرشیفەکەی لە کتێبخانەی کۆنگریس و کۆپیشیان لە کتێبخانەی نیشتیمانی ئەو وڵاتە پارێزران.

جێگەی باوەڕ نەبوو کاکۆ بۆ سۆراغی ئەو هاورێیە چووبێتە ئەنادۆڵ، با ئەوەشی زانیبێ کە دوای ونبوون و مردنی لەوێیان دیوە و بە رێگا باریک و بێ بڕانەوەکانیدا

سووڕاوەتەوە. ڕاستە لەو ساڵانەی دواییدا کامێرایەکی براون دەست سوپای تورکیا کەوت و دوای پشکنینی ورد وێنەی چەندان گەریلا و سەربازی کوژرا و بریندار تێدابوو، وێنەی دەیان گوندی چۆڵ و کەڵەکە تەرمی سووتاو و شێواوی تێدا دۆزرایەوە، بەڵام دیسانەوە ڕێی تێناچێ پیاوێک هەرچەند وێنەگرێکی سحری و ئەفسانەیش بێت دوای ئەو هەموو ساڵانە لەو شاخ و کێوانە هەر خەریکی هەڵگرتنەوەی وێنە بێت.

ئەدی کاکۆ لە کوێیە؟ هەر سێکیان لە خۆیان دەپرسی دەبێ کوێی بۆ بگەڕێین؟ کارۆلین دەیانجار چووبووە لای باخەوانەکەی دارستانی ئۆرانۆس و هەموو کونوکەلێنەکانی ئەوێی بەدوادا گەڕابوو، سەرەڕای ئەوەش ماوەیەکی زۆربوو ئەگەر کاکۆ چووبایە دارستانەکەی ئۆرانۆس شەوانە هەر لەگەڵ باخەوانەکە و لە ژوورەکەی ئەو دەنووست، بەشی زۆری کاتی خۆی بە هاودەمی ئەو بەسەردەبرد.

ژەنیاری موراد بەگ کە خوێنێکی گەرم و کەف کردوو لە پلێتی ئاسنی فڕۆکەکەوە دەرژایە ناو پێیەکانی و خەیاڵی کوردستان کە لە خەوێکی پایزانەوە ببووە ڕاستی هەموو جەستەی داگیرکردبوو، وەک ئەوەی تەنها بۆ مردن بگەڕێتەوە ناو ئەو کێوانە، وەک ئەوەی چەندان ساڵ بێت زیندانی بێت و ڕێگەی گەشت و سەفەرکردنی لێ گیرابێت، هێندەی ژیان تامەزۆریی گەیشتنەوە بوو، هێندەی مردنیش لە گەیشتنەوە دەترسا، دواتر غیرەتی کرد و درکاندی:

- باشە دەبێ ئەو کوڕە لە کوێ بێت؟

هەردوو ژنەکە لە یەک کاتدا، بەڵام هێواش و تاساو سەریان بەرزکردەوە و چەندان جار ئەو پرسیارەیان لە خۆیان کردبوو، کاکۆ تەنها بەنیازی سەفەرێک لە ماڵ هاتبووەدەر، گوتبووی:

- دەچمە ئوتێلێک و هەر لەوێوە سۆراغی خزمەکانی بابم دەکەم.

گوتبوویی:

- زۆرم پێناچێ.

چەند جارێک لای کارۆلین گوتبووی:

- هەموو ئەو شوێنانە بەسەر دەکەمەوە کە جیمس پۆڵ براون وێنەی گرتوون.
کارۆلین پێی گوتبوو:
- ئەو زەمەن و ئەو شوێنانە بەسەرچوون ناتوانی هیچ شوێنێ بدۆزییەوە.
ئەو بێ ئەوەی سەیریکات وەڵامی دابۆوە:
- هیچ نەبێ گەڕەکەکان یان لادێ و شارەکان، ئەگەر کەسێک ببینم بابی یان باپیری یان لە زمانی هەر کەسێکەوە ناوی جیمس پۆڵ براونی بیستبێ، وادەزانم دنیا بۆتە هیمن، هەر کەسێک، هەر شوێنێک ببینم بۆ من کەڵکی دەبێت.
دەبێ کاکۆ لەکوێ بێت؟ ئارتووش کوردە تاسابوو دڵی سارد و بێدەنگ بوو، دەتگوت لە جێگەی دڵی بەردێکیان بۆ داناوە، بەردێک بێ دەنگ و بۆ.
روانییە مێردەکەی سەری بۆ لای پەنجەرە خڕەکەی فرۆکەکە سووڕاند، تا چاو بڕکات باقە هەور پشتیان پێکەوە دابوو، هەتاو لەسەر پشتیان باوێشکی دەدا.
رۆژێک کە هەور هەر ئاوا بەچڕی خزیبووە ناو ماڵەکان و باغەکانی تەنیبۆوە، کاکۆ پێی گوتبوو:
- بابچین بگەڕێین.
ئارتووش گووتبووی:
- بەو تەمومژە؟
ئەو پێی داگرتبوو:
- ئا من دەمەوێ بە رێگا باریکەکانی ناو دارستاندا بگەڕێم و هەور بێتە ژێر پاڵتۆکەم و هەور بێتە ناو دەرپێ کورتەکەم و ژێر فانیلەکەم.
هەردووکیان چووبوونە دەرێ، گەڕابوون، بە ناو هەوردا گەڕابوون، شەقام و کۆڵانەکانیان تەی کردبوو، چەند تەمەکە چڕتر دەبوو کوڕ و کچەکان زیاتر دەچوونە باوەشی یەکتری، لە خانووەکان دەرچوون بە پەنا دارەکاندا تێپەڕین کاکۆ گوتبووی:
- ئیدی دارەکان تەنها نین هەریەکە و کۆڵێک تەمی لە باوەش کردووە.
بەڵام بە چاوی خۆی خەمێکی قووڵی لە ناخی دارەکاندا دیبوو، خەمی ئەو عاشقانەی

هەرگیز بەیەک ناگەن. کاکۆ دەیدی دارەکان لق و پۆپ دەردەکەن و هەزاران گەڵا و چرۆ لەسەریان دەپشکوێ، کەچی لە خودی خۆیاندا هەر تاقە دارێکن و ناتوانن پەنجەیەک بجووڵێنن لە یەکێکی دیکە نزیک ببنەوە. بۆ ئەبەد بە خەیاڵێکی قورسەوە کە مرۆڤ بۆ چرکەیەک بەرگەی ناگرێ بەرانبەر یەکتر وەستاون.

ئەو هەموو لق و گەڵا و گوڵەشی بەو حیکایەتە خەیاڵیانە دەزانی کە دڵدارێکی تەنیا و دوورە دەست و غەمبار بۆ خۆی دروستیان دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا خولیایەکی سەیر بۆ ژیان لە وجووددا هەیە، چەکەرەی ئەو ئەڤینە تەنیا و غەمگینە لە قووڵایی مرۆڤدا پەرپوەتە سروشت.

هەر ئەو رۆژە کاکۆ هەستی بە عەشق و خولیایەکی قووڵ لە ناخی خۆیدا کردبوو، خولیایەک تا مردن غەمگین، بە دایکی گوتبوو:

– دەبینم لە پشت هەر دارێکەوە کەسێک چاوەڕێم دەکات، کەسێک لە هەور.

نەیگوتبوو کچێک چاوڕێم دەکات، بە سۆزێکی گەرمەوە لە دارەکان نزیک دەبۆوە، لە ژێر دارێک کە تا ناخی رەگەکانی هەور و تەم بوو، کوڕەکەی لە باوەش کرد، ئەو پەژموردەیەی هەژاندبووی، لە ناو ئەو تەمومژەدا هەستی بە گەرمییەک کرد لە سینگی کوڕەکەیەوە هێرشی بۆ دێنێ، گەرمییەک کە جێی باوەڕ نییە لە جەستەی کوڕێکی واسارەوە هەستێ، وەختێک بەوپەڕی سۆز و خۆشەویستییەوە باوەشی پێداکردبوو، لۆرانسی بیرکەوتەوە واهاتە بەرچاوی کە ئەو پیاوە نووسەرە خیانەتکارە «قاتیلی دایکانە» نەیزانی بۆ دایکان، بەڵام هەستی کرد لۆرانس بە زەردەیەکی گاڵتە ئامێز و پڕ ماناوە کە لە هی حەرامزادەیەک دەچێت سەیریان دەکات.

هەموو ئەو خەیاڵانە بۆ لەحزەیەک بوون، لۆرانس لە تەمەکەدا توایەوە و ئارتووشیش بەگەرمییەکی لە رادەبەدەرەوە گەردەنی کوڕەکەی ماچ کرد، کە نەیدەزانی چ کۆستێکی کەوتووە. لە دوورەوە سەیرت کردبان بەو منداڵە بێکەسانە دەچوون لە شەوێکی زوقمدا لە دەرەوەی ماڵ بەجێمابن، لە جیاتی ئەوەی بچنە ناو چیرۆکێکی هۆگۆوە سەرما لە باوەشی یەکتردا کردبنییە شەختە. ئەوانیش خەریک بوون دەبوونە شەختە، بەڵام بە

هۆی سەرما و بەفرەوە نا! بە هۆی زوقمێکەوە لە ناخیاندا بارییوو.

هەورەکە وەک سەهۆڵ چین چین لەبەر پێیان دەنیشت، نائومێدی دوو خۆشەویستی تەنیا لە پێیەکانیانەوە سەردەکەوت، نائومێدی و تەنهاییەک لە سەهۆڵەکە ساردتر، ئارتووش بە هەمان ئەو هێزەی خۆی لە ناخی دەفتەرە بەرگ چەرمەکەوە دەردەکێشا، بەو توانا و باوەڕە دروستکراوەی خۆی لەو دەفتەر قەسابخانەیە رزگار دەکرد بە هەمان هێزەوە باسکەکانی لە ملی کوڕەکەی رزگار کرد و گوتی:

– ئەوە چییە خەریکە دەمانکوژێت!؟ کاکۆ بجووڵێ.

ژەنیار پێشتر گوتبووی:

– کوردەکان کە لە ناو بەفر عاسێ دەبن رێچکەیەک دروست دەکەن و هاتوچۆ دەکەن بەو ئومێدەی بە فریایان کەون.

دایکی بۆ یەکەم جار راشکاوانە گوتبووی:

– ئومێد؟ ئەوەی کەنیمانە.

کاکۆ سەیری قووڵایی چاوی دایکی کردبوو، بەڵام وەڵامی نەدابۆوە بۆیە هەر خۆی گوتبووی:

– ئومێدەکانی وڵاتی باوکت دوو هێندەی نا ئومێدییەکانی ئێرە کوشندەن.

کاکۆش بێ ئەوەی سەیری بکات گوتبووی:

– بەڵام گەرموگوڕن

## ئازەری

ژەنیار چەنگە گڵێکی هەبوو، ئەو چنگە گڵەی لە دۆڵێک، سەد مەتر دوور لە کانییەک تاودابوویە، لەسەر گەڵایەکی دانابوو، پارچە پەڕۆیەکی لێ پێچابوو، گڵێکی شینباو، کە چەند توێخێک بەردی سەوزی لە ناو وردببوو. ئەو گڵە لە کاتی زۆر ئەستەم بە فریای ژەنیار هاتبوو، هەموو ئەو بەستەڵەکەی ئەوروپا نەیتوانیبوو ساردی کاتەوە، ئێستا ژەنیار لە ناو ئەو هەموو هەورە چڕ و بێ بنانەی ناوەندی بەهارێ پێیوایە لاقەکانی رووتن و تابەلەکان لەناو گڵێکی تەواو گەرم و گوڕدا ون کردوون.

سەردەمێکی زوو ئەو چەنگە گڵە وەک تاکە غەنیمی بەوەچ و سەنگین و سەرکەشی ئاغای موحسین ئەتایی شیرازی مابۆوە، ئاغا ئەتایی سەرەتا شتێکی دەربارەی ئەو گڵە نەدەزانی، بەڵام دڵنیا بوو لە ناخی ئەو پیاوە کوردە رۆژهەڵاتییەی بەرماوەی شۆڕشە ورد و هاڕبووەکان شتێک هەیە، جگە لە ئێسک و پروسک و جەستەی پڕ لەزەتی تەسلیم بووی شتێکی دیکە لە ناخیدا هەیە، کە ئەوا سەرسەخت بەرەنگاری دەبێتەوە، ئەو ئەودەم

نەیدەزانی غەنیمەکەی ئەو چەنگە گڵەیە. دواتر بە ژەنیاری گوتبوو:

– چنگە گڵێک لە مەدەنییەتی کردووی.

ژەنیار کە تا ئاستێکی بەرز تەسلیم بیرکردنەوەکانی ئەتایی ببوو، گوتی:

– وانییە، من تەسلیم بووم، بۆو تێکشکانە قورسانە ناگریم، کوا بیری هاوڕێ بە جێماوەکانم و دۆستە کوژراوەکانم ناکەم، کوا ئێستا ماوەیەکە بیری ئەو پیاوەناکەم شکۆیان تێکشکاندو لەوپەڕی تەنهایی و غوربەتدا هەمووماني جێهێشت. ئەو کاتە بەردێک بە ئەندازەی دڵی و بە کێشی دنیا بەرسەرم کەوت. نابینی هەرگیز باسی گوڵ عەتری ئامۆزام ناکەم، برام ئەتایی دۆستە شیرازییەکەم، ئاغای بەڕێزم من ژەنیاری موراد بەگی بە رەسەن کورد تەسلیمی مەدەنییەت بووم، هەر رۆژە لە باوەشی ژنێکم، ئەوەندەم ناوگەڵ لستوونەوە هەتا شیری بەیانیان و هەمبەرگری نیوەڕۆیانم بۆنی پێستی ئەوانی لێدێت.

ئاغای ئەتایی، پێکە وێسکییەکەی بە دەستی راستییەوە گرتبوو، زۆر حەزی دەکرد بەرانبەر پەنجەرە بە تایبەت کاتی بەفربارین وێسکی بخواتەوە ، بەڵام بە دڵ هۆشی لای ژەنیار بوو، ویستی بڵێ:

– ئەوە چ مەدەنییەتێکە !

ویستی بڵێ:

– کام تەسلیم بوون !.

کەچی هیچیانی نەگوتبوو.

ژەنیار زۆر نەرمتر و بە سۆزتر بەردەوام بوو:

– ئاغا شیرزای تۆ ئێستا ناوی شارەکەی خۆت بە قونەوەیە، من وڵاتەکەم و تایفەکەم و گوندەکەشمان لە بیرچۆتەوە، ئیدی کوا ئەوە دوو بەهارە هەر باسی رێواسیش ناکەم، چەندە گوێ لە هەواڵەکانیش ناگرم. ئەوەتا وەک خەڵکی ئێرە سەری ساڵان بەفر نەبارێت دیق دەکەم، کێشەی کەس ناکەمە هی خۆم، سەد کەس بکوژرێت ئاوڕ نادەمەوە دەڵێم کێشەی خۆیانە، سەگێک خەمبار بێت هەزار جار قوربانی دەبم و وەک مەیموون بۆی

هەڵدەپەڕم تا شادمان بێت.

گوێ لە کۆنسرێت دەگرم و بۆ فیلمێکی بەناوبانگ شەو لە سەرەی بلیت بڕیندا دەخەوم.  کۆڵانە و کۆڵان بە دوای قونچکە جگەرەیکدا، بە دوای کلینکسێکی پیس و فڕدراودا دەگەڕێم، گەڵا لەبەر من لە کاتی وەریندا ناگاتە زەوی هەڵیدەگرمەوە. سەری ساڵان بە هەر نرخێک بێت بەرگی بابە نوئێل دەکڕم و لەبەری دەکەم و منداڵانە دەخەمە پێکەنین و پیرێژنێک ماندوو بێ تا ئەو سەری دنیا لە کۆڵی دەکەم و هەمووان دڵخۆش دەکەم.

ئاغای موحسین ئەتایی زۆر بە هێمنی گوتی:

– خۆشت دڵ ناخۆش.

ژەنیار لە دڵی خۆیدا گوتی:

– ئەوە ئەو موحسین ئەتاییە سەگ سیفەتە بە چ چاوێک سەیری ناخی من دەکات، هیچی لێ ون نابێت.

دەمێک بوو پێکەکانیان وەلا نابوو، ئەم شەو خواردنەوە دادی نەدابوون، ئاغای شیرازی هەستا چوو قاوە دروست کات، ئەویش خەریکی ئامادەکردنی پایپەکەی بوو، شیرازی بە دوو قاوەی تاڵ و سەربەکەفەوە هاتەوە، هەر لە دوورەوە بۆنی هێمن و مێگری پایپەکەی سەرنجی راکێشا. بۆیە گوتی:

– چ تووتنێکە! بەه بەه چ بۆنێکی هەیە!!

ژەنیار وەختێک پایپەکەی بە دەستی چەپ گرتبوو، گوتی:

– کچێکی مەغریبی بۆی هێناوم، خودایە هێندەی دووکەڵی ئەو تووتنە نەرم و سپی و بۆندارە، هێندەی فەڕەنسییەکانیش توندە.

وەختێک ئاغای شیرازی بەدڵ پێدەکەنی، پرسی:

– بۆ فەڕەنسی؟

– دایکی فەڕەنسییە. لە مەغریب لە دایک بووە، لە تەمەنی یازدە مانگییەوە لێرە دەژیت. نەناوی دیدرۆ دەزانێ نە موتەنەبی لە کارگەیەکی دەرمانسازی کاردەکات. دواجار بە

بۆنەی ڕۆژی لە دایکبوونییەوە شەو چوومە لای، بیست و حەوت ساڵی تەواوکردووە، پوورێکی لەوێ بوو لە خۆی بچووکترە، ئێمە بڕیارمان دابوو ئەو شەوە تا بیست و حەوت نەوەستین، ئەو پوورە بەستەزمانەی تا بەیانی لە کونی دەرگاوە سەیری کردین. ئێمەش زۆر دڕندانە و بێوەفایانە ڕەحممان پێنەکرد. هەستم دەکرد هەموو وجوودم، بەڕۆحمەوە لە شێوەی شلەیەکدا دەچێتە لەشییەوە. ئەو شەوە فوارەکانی بەهەشت هاتبوونە ناو منەوە، لە هەموو کونێکی لەشم، لەبەرەدەستم و سەرنینۆکەکانیشم ئارەقە و ئاو و شیر وەک یەک هەڵدەقووڵان، ئەو شەوە زانیم کە ڕۆماننووسە خەیاڵبازەکان ڕاست دەکەن و دەشێ شەوێک ئەوەندەی سەدەیەک درێژبێت.

ئەتایی شیرازی کە خەریک بوو لە دووکەڵی پایپەکەیدا ون دەبوو گوتی:

– ئەوەتان زۆر نامەردانە بووە ئەو پوورە بێدەرەتان و بەستەزمانە لە ژووری ماوەتەوە و لە کونی دەرگا وە سەیری کردوون. ببوورە ئاغای ژەنیار ئێوە زۆر خۆپەرست بوون بە تایبەتی ئەو هاوڕێ فەڕەنسییە مەغریبییەت، ئەو شەوە بەشی هەرسێکتانی دەکرد.

ژەنیار تەریقایەوە، دەموچاوی سوور سوور ببۆوە، بە دووکەڵی پایپەکە و پێکەنینە فراوانەکەی چاوەکانی تا ئەندازەی نەبوون بچووک ببوونەوە. لە پشت پێکەنینەوە لە پشت بژۆڵەکانییەوە کە بە ئەستەم ڕێگەیان دەدا ئاغای ئەتایی ببینێ، دەیگوت:

– ئای تۆش دڕندەی ئاغای ئەتایی شیراز. ئەی تۆش خوێنڕێژ (لە کاتێکدا بە تەواوی چاوەکانی نوقاندبوون لە دڵداوە ڕەهاببوو گوتی) خوێنڕێژ و بێویژدانی، ئاغای ئەتایی برام تۆش بوویە مەخلووقێکی سەیر و دڕندەیەکی بێ وێنە.

بەڵام نەیگوت ئەوانەی هیچ نەگوت، ئەوەشی نەگوت کە ڕۆژی دوایی، وەختێک لە ماڵەکەی خۆیدا بەتەنیشت ئەو تاقە داپۆشراوەدا تێدەپەڕی کە چەنگە گڵەکەی لێدانابوو، بۆنی هەموو ئەو گیایانەی تێکەڵی ببوون هێشتا بەلووتی دادەچوون، ڕاستە هێمن و خۆش و فێنک بوون بەڵام وەک خەنجەر بە لووتیدا دەچوون. ژەنیار ئەوەی نەگوتبوو، باسی ئەوەشی نەکردبوو، کاتژمێرێک دواتر کە دیسانەوە بەلای ئەو تاقەدا تێپەڕیوە

سامێکی قوڵ لە ناوەندی دڵی پڕخوێنی سەری هەڵداوەتەوە و نەیتوانیوە ئاوڕداتەوە و وایزانیوە شاخێکی گەورە و پڕ دارستان لە دوایەوە رایدەکێشێت. جاری سێیەم هێواش و هێمن بۆ خۆی تەسلیم دەبێت و چنگە گڵەکە وەک مەلۆتکەیەکی تازەبوو دەست داوەتێ و لەسەر مێزەکەی دادەنێ و دەیکاتەوە، بێ ئەوەی بیەوێ گریابوو، بێ ئەوەی بزانێ بۆچی، فرمێسکی باراندبوو. ژەنیار هەرگیز باسی ئەو گریانە قووڵ و بێ ئامانەی نەکرد کە وەک تاعوون تەواوی جەستەی گرتبوو.

ئەو تەواو دەرکی بەوە نەکردبوو لە نێوان ئەو چەنگە گڵ و رابواردنی شەوانی، لە نێوان ئەو گڵە و ئاغا موحسینی ئەتایی، لە نێوان ئەو گڵە و ساز و کەمانەکەیدا چ هەیە، بەڵام هەمیشە هەستی بەشکان و وردبوون و گڕگرتنی هەزاران کیلۆمەتر لە بۆشایی دەکرد لە نێوانیان.

رۆژی دواتر بە خۆیی و کەمانەکەیەوە چووە باخچەی کەنار رووباری ساو، ئەو رووبارە بێ کەس و بێدەنگ بەداوێنی رۆژهەڵاتی شارەدا تێدەپەڕی، لەبن دارێک دانیشت کە ئێستا ناوەکەی نازانێ هێشووە گوڵی وەک ترێی دەگرت، رەنگیان سپییەکی شیری کاڵبوو، ئەو هێشووە گوڵانە بەیانیان و شەوانێکی درەنگ بۆنێکیان دەردەدا هەتا سنوورێکی دوور لە خۆیان بۆنی هەر گوڵێکی دیکەیان دەسڕییەوە. پەیوەندییەکی توند و بە هێز و رۆحی لە نێوان ئەو بۆنە و هەرچی گلاندی ئەنزایم رژێنی لەشدا هەیە دروست دەبوو.

رۆژی یەکەم دوای رۆیشتنی خەڵکەکەی گوێیان لە مۆسیقاکەی گرتبوو پیرەمێردێک و ژنێکی بە تەمەن بەرانبەری بێدەنگ دانیشتبوون و دەیانڕوانییە گوڵە کەمیلیاکانی بەرپێیان، هێندە خەیاڵ و غەمگین بوون کە گوڵە مۆرەکان وردە وردە سەریان شۆر دەکردەوە و سیس دەبوون. ئەو پیاوە بە تەمەن و باڵابەرز و ئێسکنە، تا هەڵنەستاو دەستی ژنەکەی نەگرت کەس دەرکی بەوە نەکرد کە ئەو دووچاوە شین و پڕ ئاوە توانای بینینیان نییە.

رۆژی دووەم کە ژەنیار بە هەمان سۆز و تەنهاییەوە لە ژێر هەمان دار کەمانی

لێدەدا، لەسەر کورسی ئەو ژن و پیاوەی دوێنێ ژنێکی تەنهای دیت کە جارجار منداڵێکی هەشت ساڵان دەهاتە لای ئەویش بێ ئەوەی هۆشی بەسەرییەوە بێ گوێی بۆ کەمانەکە گرتبوو. ژنەکە بە هەمان شیرینی دەیڕوانییە منداڵەکەی گوێی بۆ کەمانەکە گرتبوو.

لە رۆژی سێیەمدا زۆر درەنگ بارانێک باری، زۆر درەنگتریش دارەکەی هێشووە گوڵی دەگرت قورس ببوو، دڵۆپە باران لە گوڵە سپییەکانەوە دەتکایەوە سەر دەست و پەنجەی ژەنیار و لە بوولیڵێکی تاریکدا کچێکی سەرتاپا سپی دیت لەسەر هەمان کورسی بەرانبەر دانیشتبوو، بە یەکێک لە خودایەکانی یۆنانی کۆن دەچوو، بەڵام ئەو یۆنانییە ترساو ژن پەرستانە نەیانزانیوە ناوێکی وەکو خودایەکانی دی لێبنێن یان ئەرکێکی وەکو خوای بدەنێ بێگومان دەبوو خودای گریان یان دڵشکان بایە. ئەو خودای دڵشکانە دوایی هەموو فەزای بۆگەن کردوو شێواوی ژەنیاری تێکشکاند و وەک خودایەک فەزایەکی ئاڵۆز و پڕ نهێنی لە ژیانی ئەو پیاوە رۆژهەڵاتییەدا هەڵبژارد.

لە بوولیڵی ئێوارەدا تاریکی هێواشتر لە پەردەی سینەما بەسەر باغەکەدا کشا. دەنگی سروشت کە دەنگێکی نەبڕاوەی بێ کەلێن بوو بێدەنگی ئەو دوو نەناسەی نەدەشکاند. ئەوان کە تەنها تارمایی یەکتریان دەدی، بێ ئەوەی لە یەکتر بڕوانن بەبێ هیچ نیازێکی دیار مابوونەوە. دواتر ژەنیار ئاوازێکی رۆژهەڵاتی زۆر کۆنی ژەنی کە بە ئاوازی «زیندان» ناسراوە. لە سەردەمی ئاوارەییدا لە تەورێز زۆر هەوڵیدا بوو ئەو ئاوازە لە پیاوێکی پیری ئازەری فێرببێ، هەرچەند پیاوەکە کوردی دەزانی و چەند گۆرانییەکی بە ئاوازی ئازەری و وشەی کوردی ناڕێک و تێکشکاو دەگوت، ئەو پیاوە ئازەرییە سەر بە رەگەزی زمان نەبوو ئەو پیاوە لە رۆحی نۆتە و مۆسیقادابوو، ژیان ددانێکی بەو نەبەخشیبوو جگە لە پێکەنینێکی پڕ شەرم و بێدەنگ، وتەیەکی نەبوو بۆ ئینسانەکانی دەوروپشتی، بەڵام بۆ خۆی هەر بۆ خۆی و بەس مۆسیقای هەبوو، ژەنیار ئەو کاتە نەیتوانی ئەو ئاوازە فێرببێت و کابرای ئازەری زانیبووی ژەنیار هەست بەبێ توانایی و بێ بەهرەیی خۆی دەکات هەرچۆنێک بێت پێی گوتبووی:

– تۆ ئاوازی زیندان فێربووی، بەڵام تا لە دڵتدا نەکولێ، تا نەچیتە زیندان ناتوانی

بیژەنی.

ژەنیار ئەو کاتە زانیبووی ئەو ئاوازە بە ژێیەکانی ژیان لێدەدرێت نە ژێ و تەلی نایلۆنی کەمان.

بێ مەبەست پرسیبووی:

- زیندان کوێیە؟

ئەویش گوتبووی:

- لە دڵی خۆتدایە. دەکرێ هەموو دنیاش بێ!

ئەو دەم لەو باخەسەر سەوزە حەزی دەکرد پیرەی ئازەری لە وێبا و گوێی لێبا چۆن ئاوازی «زیندانی» ژەنیوە، هەرچەند نەشیزانی ئەو ژەنینەی بۆ یادی ئەو پیرە بوو یان دەنگی زیندانێک بوو لە دڵی دەهات، هەر ئەو ئێوارەیە و لە ژێر ئەو دارەی هێشووە گوڵی دەگرت ئاوازێکی دیکەی ژەنی کە ناوی «گوڵخانە»بوو، ئەو ئاوازە پەیوەندی بە ژنێکەوە هەبوو کە مێردەکەی نەزەری کردووە، یەکەم شەوی زاوایی، بێ ئەوەی دەست بۆ بووکەکەی بەرێ، کەوشەکانی بکاتە ملی و هەر بە پێ بڕواتە مەشهەد، زیارەت بکات و ئەوجار بگەڕێتەوە و ببێتە زاوا.

سەرەتا بووکەکە هەر لە ژوورەکەی خۆیدا چاوەڕێی دەکات و هەر لەبەر پەنجەرەکەی رادەوەستێ و هەر لەوێش سیس دەبێت، دەچێتە هەیوان و حەوشە، دوای سێ مانگ دەچێتە سەربان و هەرگیز نایەتەخوار، ئەو سەربانە هەمووی دەکاتە گوڵێکی زەرد، ئەو کچە هەست بە گۆڕانی رەنگ و دەموچاوی خۆی ناکات و سپی بوونی قژی خۆی نابینێ، زەردبوونی ئەو پارچە پەڕۆ سپییە نابینێ کە هەروەک شەوی یەکەم لە ناوەندی دۆشەکەکەی راخراوە. دوای چاوەڕوانی و تەماشاکردنی دوور بۆ ماوەیەکی درێژ لەبەر هەتاوی ئەو تەورێزەی هاوینان چاوەکانی لە دەست دەدات و کوێر دەبێت، ئەو هەر گوڵەکان خزمەت دەکات و لەسەربان دەمێنێتەوە. تارۆژێک دەڵێت:

- پەیامی پێغەمبەرانیش کۆتایی هەیە.

خۆی لە سەربانەکە دەخاتە خوارێ و دەمرێ، کەس نەیتوانیبوو لەو ناوەدا داوەری

بکات چونکە ئیدی لێرەوە بڕیاری خودای دەویست.

ئاوازەکە وانووسرابوو، کە کچێک چاوەڕێ دەکات و دواتر لە ناو دەشتێک لە گوڵی زەرد سەما دەکات و تا بۆ خۆشی لە ناوەندیان دەبێتە گوڵ، بەڵام بە ڕەنگی سپی.

ژەنیار وەک دڵۆپە ئاوێک دەکەوتە سەر ئەو گوڵە سپییە، ئەو لێدانی یەک ئاست و قووڵ و پڕ مردنەی سپی کۆتایی ئاوازی گوڵخانە بوو. ئێستا ئەو زۆر بە شەوقەوە لە ناو تاریکی شەودا تەنها ئەو گوڵە سپییەی دەدیت و گوڵە زەردەکانی لێ ون ببوون، وەختێک کچەی بەرانبەری هەستا و جووڵایەوە جا زانی هەموو ئەو ماوەیە سەیری کراسەکەی ئەوی کردووە، کە لە تاریکیدا وەک گوڵ هاتۆتە بەرچاوی. ژنە یان کچەی بەرانبەری هەستاو بەوپەڕی ڕێز و ڕەزامەندییەوە لە ژەنیار نزیک بۆوە، لێوی هێندەی گوتنی دە ڕستە جووڵاندەوە، بەڵام هیچی نەگوت و تێپەڕی.

دوای سێ ڕۆژ بەسەر ئەو ڕووداوەدا ڕۆژێک لە ژێر دەرگاوە نامەیەکیان بۆ خستبووە ژوورەوە، زۆر سیحرئامیزانە و بە خەتێکی درشت نووسرابوو «گوڵەکان چاوەڕێت دەکەن» پێی وابوو هەر کچە مەغریبییە فەرانسییەکەیە، زوو لەوە پەشیمان بۆوە و گوتی:

– ئیدی لوغزێک لە نێوانماندا نەماوە تا گوڵی بۆ بەکاربێنین.

بیری لە زۆر کچ و ژنی دیکە دەکردەوە و هەتا سەرنجی بۆ شەهلا شیرازیش چوو، کاتێک دوای دوو ڕۆژ بەلای باخەکەدا تێپەڕی دڵنیابوو کێ ئەو نامەیەی نووسیوە لەگەڵ ئەوەشدا حەزی نەدەکرد هیچ کەسێک لەو دنیایەدا چاوەڕێی کات و ئەو بەو چاوەڕوانییە ئازار بچێژێت، لەگەڵ ئەوەشدا شەوێکی درەنگ کەمانچەکەی هەڵگرت و چووە باخەکە. یەکەم جار ئاوازی چاوەڕوانی لێدا جا گوڵەکان ملیان لارکردبۆوە و هەناسەیان تەنگ ببوو کۆتایی ئەو ئاوازە لە مەرگ ڕەشتر بوو. دواتر ئاوازێکی دیکەی لێدا کە کاتی خۆی لەسەروبەندی هاتنی بۆ ئەوروپا لەسەر کەشتییەکی یۆنانی کە شەش مانگی ڕێک لە سەری مابۆوە، کە شتیوانێکی یۆنانی فێری کردبوو، ئەو کەشتیوانە لە ماسی زیاتر نزیک بوو تا ئینسان یان شینە شاهۆ، ئەمەش ئاوازێکی ئەفسانەیی بوو، گوایە دەریاوانێک نۆ

مانگی تەواو لە قوولایی دەریادا بەدیار مەرگەوە ماوەتەوە و ئەوەندە لە یەکتر نزیک بوون بەیانیان سلاویان لە یەکترکردووە و بۆیەکتریش چاویان گێڕاوە ئەنجامیش دەست بەرداری یەکتردەبن و ئەو کەشتییە فریای دەکەوێت و ئەویش سواری شەپۆلە شێت و هەتا خوا حەزکات بەرزەکان دەبێت و ئەو تاکە ئاوازە جارێک ناوی«قوولایی دەریا» و جارێک ناوی «مرواری رەش» و جارێک ناوی «دۆستایەتی راستەقینە» بوو.

ئەو ئاوازە بە هێمنییەکی سەیرەوە دەستی پێدەکرد کە هەستت دەکرد، هەموو خشتوخاڵی دەروون لەگەڵ خۆی دەبات و فرێی دەداتە شوێنێک هیچ کەس نایدۆزێتەوە، لە ناخی گوێگردا کانییەک هەڵدەقوولا رستێک کۆتر بەشاقەلی تەڕەوە لە ناویدا دەیاندا لە شەقەی باڵ، لەوکاتانەدا بوو گوڵەکان سەریان بەرز دەکردەوە ئەگەر شەویش بایە چاویان دادەگرت. ئەو شەوە کەسی نەدی، کورسییەکەی بەرانبەری چۆڵ بوو، بەلام نەیزانی بۆچی وابیر دەکاتەوە کە لە شوێنێکی نزیک کەسێک گوێی گرتووە.

بارانێکی وردوخێرا باری، ئەو روانییە ئەو باڵندانەی لە ناو لقی دارەکان وەجووڵە کەتبوون بارانەکە سووکتری کرد، ئەو کەمانچەکەی هەڵگرتبوو دەڕۆیی، ئاسمان بواری دابوویە بگەڕێتەوە دەنا هەورەکان بە نیازی بارانێکی سەرشێتانە بوون، ئەوانیش سیمفۆنیایەکیان ئامادەکردبوو.

شار خامۆش بوو، بە چدا بزانێ بەیانی لە خەو هەڵدەستێ، بەژێر رێزدارێکدا تێپەرێ لە کۆمەڵە کەسێک دەچوون دەستیان خستبێتە گیرفانیان و چاوەڕێی پاس بن، زانی یەکێک لە دوورەوە لە دوایەوە دەڕوات. خێراتر رۆیی تا بارانە کە ئەویش نەگرێتەوە، دواتر لە ژێر چەتری پاسێک دانیشت، کە گەڕایەوە دیسانەوە نامەیەک بە ژێر دەرگاکەدا خرابووە ژوورەوە لەسەری نووسرابوو؛

«رۆحێک دەخەیتە ناو دەماری گەلاوگوڵ لە هەموو شتێ زیاتر بۆ من پێویستترە. لە ژێری نووسرابوو رۆسن.

## گوڵخانە

ئەوان هەر سێکیان دەفڕین، کارۆلین و ژەنیاری موراد بەگ و ئارتووش کوردە. نیگەران و پڕ پرسیار، دەبێ لە کوێ بیدۆزینەوە؟ ئارتووش سەیرێکی ژەنیاری کرد، هەمان چاوەڕوانی ساڵانی زوو گەڕابۆوە ناو چاوەکانی، بەڵام ئەوکات بێباک و گەنج و باریک. ئێستا تاڕادەیەک قەڵەو مووهەڵوەریو، ړوومەت سوور، بەڵام گۆشتن و لەسەرخۆ. ئارتووش هەستی بە حاڵەتی نالەباری ژەنیار کردبوو، دەستی خستە سەر ئەژنۆی و گوتی:

– لە هەموو کاتێ پێویستتری بۆ من.

کەسیان نامەکەی ژێردەرگایان بیرنەکەوتەوە.

ئەوکاتەی ببوونە هاودەمی یەکتر، یان ئەوکاتەی ئارتووش نامەکانی لە بن دەرگاوە بۆ دەخستە ژووری، ئەودەم تا ئارتووش بەردەوام گوێی لە هاوڕێیەکانی هاریازی خوشکی دەگرت و ئەو چیرۆکە پڕ حەسرەتانەی ئەویان تا ڕادەی کوشتن ماندوو دەکرد،

بەڵام کاتێک بڕیاریاندا پێکەوە بژین، بە کاریگەری ئاغای ئەتایی شیرازی و خاڵۆ ژیاکۆی پیری ئەرمەنی کە دەبێ وەک دوو کەسی بە ئومێد و زیندوو ماڵێک ئاوەدان کەنەوە، لەگەڵ یەکەم منداڵ بوونیش، واتە لە یەکەم ڕۆژی تەمەنی کاکۆوە ژەنیار کەمانەکەی بە دیوارەوە هەڵواسی پەیمانیدا ئەو ئاوازانەی ڕۆژهەڵات هەرگیز نەژەنێتەوە و خۆی بەکاری حیسابداری کارگەکەوە خەریک بکات. کەنگێ ئەو بڕیارەیان دا؟ ئەوکاتەی هەموو ژوورە نهێنییەکانی ناخی یەکیان پشکنیبوو، ئەوانە لە تاریکترین گۆڕخانەی تەمەنی یەکتردا ژیابوون. پێبەپێ سەرکەوتبوونەوە، هەناسە بە هەناسەی یەکتریان ژماردبوو. ساڵێک و پێنج مانگ، بە شەو و ڕۆژیەوە بە بەستەڵەکی ژیانی یەکتردا سەفەریان کردبوو، هەموو ئەشکەوتەکانی ناخی یەکتریان لە نووکەوە ناسیبوو، لەبەردەم تاریکترینیان هاواریان کردبوو هەتا دەنگی دابۆوە، لە دەنگدانەوەکەدا قووڵی و فراوانیان زانیبوو. کە شەوانە لە یەکتر جیادەبوونەوە نامەی درێژیان بۆ یەکتر دەنووسی، دەیان نامەیان بۆ یەکتر دەنارد و دواتر لەبەر یەکتر دەپاڕانەوە تا بیانسووتێنن یان بیاندڕێنن و نەیانخوێننەوە، نامەی سووتاو بە مۆم و هەڵقرچاو.

بە هەردووکیان سێ سەدو یازدە نامەیان بۆ یەکتر نووسیبوو. لە لاپەڕەی گەورە و بچووک و ڕەنگ جیاواز لە سەر پاکەتی بۆن و زەرفی هەمبەرگر. ئەو نامانە جوانترین نووسراو بوون کە لە ژیانیاندا نووسیبوویانن، جوانترین لەحزەکانی ڕووت بوونەوەی ڕووح و عەشق بوو بۆ ئەوان، جوانترین ئەرشیفی یەکتر دواندنی ڕۆژهەڵات بوون لە دڵی ئەورووپادا نووسرابێ. کە بڕیاریان دا پێکەوە بژین یەکەم پێشنیاری ئاغای موحسین ئەتایی شیرازی ئەوەبوو:

– ئەگەر بتانەوێ پێکەوە بژین دەبێ ئەونامانە بسووتێنین.

ژەنیار گوتی:

– ناکرێ، ئەو نامانە یادگاری ئارتووشن، ئەوانە هەر هی ئێمە نین دیاری لە حزەیەکی تایبەتن.

ئارتووش گوتبووی:

– ناکرێ، ئەوانە تاکە سامانی ژەنیارن، ئەو نامانە مافی باخچەو باران وشە و و رووباری بەسەرەوەیە.

ئاغای ئەتایی کە ئەوکاتە لەوپەڕی هێزی خۆیدا بووە گوتبووی، وەک فەیلەسووفێک:

– تا ئەو نامانە نەسووتێنن وەک ئەوە وایە تەرمێکی وەک سەهۆڵتان لە نێوان خۆتاندا دانابێ.

ئارتووش لە تەرمێکی وەک سەهۆڵ لە نێوان خۆی و ژەنیار ترسا و زراوی چوو، تەرم چ پەیوەندی بەو عەشقە زیندووەی ناو نامەکانەوە هەیە، ژەنیار بەو وێناکردنە تاسابوو. پوورە هاریازی هەوڵی دابوو چارەسەرێک بدۆزێتەوە، چارەسەرێک پێش ئەوانە دڵی خۆی رازی بکات گوتبووی، چونکە ئەو کرمی چارەسەر بوو:

– ئەو تەرمەی وەک سەهۆڵە، ئەو لاشە سەهۆڵبەندە بدەنە من.

ئاغای ئەتایی وەک راوێژکاری سەرەکی، بەدەم مژ لێدان لە پایپەکەی دیسانەوە گوتبووی:

– ئەوانە تەرمن، دەشێ لە هەر کاتێک هاریازی فرێی داتەوە نێوانتان.

دیسانەوە هەر بە پێکەنین گوتبووی:

– دەبێ لە ئاگر دابن یان لە نێوان جەستەی ئێوە یان لە گڕدا.

نامەکان کەوتنە لای هاریازی، بڕیاریان دا دوو رۆژ پێش زەماوەندیان بیانسووتێنن، رێک لە بیست و یەکی نەورۆزدا کە هێشتا بەفر لە ناو دارستان و سەر تەپۆڵکەکان مابوو، بە ئامادەبوونی هەرچواریان، ئاغای ئەتایی و پوورە هاریازی و ژەنیار و ئارتووش، لە ژێر ئەو دارەی ژەنیار مۆسیقای لێدابوو،ئارتووش بەدیارییەوە دانیشتبوو نامەکانیان سووتاند، ئەو رۆژە سەر و پێک وێسکیان خواردەوە، بەڵێن و پەیمانی نهێنی تازەکرانەوە، ئاغای ئەتایی بە ئاگرێک لە سووتانی نامەکان کەوتبۆوە پایپەکەی داگیرساندەوە، بەڕاستی ئەوان هەستیان کرد ناخیان گەرم بۆوە، رووناکییەک لە هەناویاندا پێکرابوو، وشە و رستەکان، هەست و چاوەڕوانییەکان لەسەر رووکاری ئەو کاغەزانە رزگاربوون، پەڕی

کاغەزەکان وەک مەیدانێکی هەڵقرچاو و بەزیوی دوای شەڕ وێران و شەپرزەبوو، ئیدی کۆتایی هاتبوو بۆ ئەبەد گریانەکانی ڕۆژهەڵات، غەدر و خیانەتەکانی ڕوو لە دڵی ئەوان ناکات، ئەوەی هەموویان لێی بێ ئاگابوون ئەوەبوو، کە نامە ئەسڵییەکان لە نەهێنیترین شوێنی ژوورەکەی پوورە هاریازیدا پارێزرابوون.

ڕاستە ئەوان هەردووکیان ئارتووش و ژەنیار ئاسوودەبوون بە پرۆسەیەکی پاکبوونەوەدا تێپەڕیبوون، بەڵام لە نێوان خۆیاندا، لە نێوان خۆیان و ئاگردا بۆشاییەکیان دەدی کە تەنها بە دڵی ئەو نامانە پڕ دەکرایەوە کە نەیاندەزانی لە کوێی ئەو کەونە خۆیان شاردۆتەوە. ئەو ئاگرە ڕەنگێکی جیاوازی هەبوو، ئارتووش گوتبووی:

- باڵەکانی سووتانی نامەکانی ژەنیار ئاوازی «گوڵخانە» یان «سێبەری فڕینی باڵدارێک» یان «نووشتانەوەی دارەکان لە کاتی تریقانەوەدا» یان هەر هەموویان بوو. ئەتایی گوێی لەو سێ ئاوازانە گرتبوو، تاسابوو، وەک لە دووکەڵدا ون ببێ دوورکەوتبۆوە، کە هەناسەی هاتبۆوە بەر گوتبووی:

- خودایە چەندم بەرەو دۆزەخ دەبەن ! ئەرێ ئەو شوێنە دۆزەخ بوو؟ لە منی دوورخەنەوە پێنج سەد ساڵ با لە من دوور بن.

ئەو ئاوازانە شتێک بوون بۆ سینەما نووسرابوون، بۆ سینەماو فیلم نووسرابوون نەک ژیانی ڕاستەقینە. ئارتووش سێبەری باڵندەیەکی دیبوو، ڕاستە دەفڕی بێ پەروا دەفڕی، بەڵام فڕینەکەی تەنها باڵ لێکدانەو ناتوانێ بستێک بڕوات و دوورکەوێتەوە.

چیرۆکە ڕاستەقینەکە هەرگیز وانەبوو، ڕاستە ئاوازەکە چیرۆکێک بوو چیرۆکێکی سینەمایی، سینەمایەک هەر کەسێک پێی خۆش بێت ببینێت، دەکرێ نەشچێتە ناوی فرمێسکێکیشیان بۆ نەڕێژێ. دەنگی مۆسیقا هێمن تێدەپەڕی، سێبەری باڵندەیەک کەوتۆتە سەر ڕێگایەکی گڵ، مۆسیقا دەڕوات و باڵندەش نا، تەنها سێبەرەکەی دەڕوات، ئێمە نازانین تەنها سێبەرەکە دەبینین، دەکەوێتە سەر گەڵای پانی دارمۆزەکان و دواتر دار پرتەقاڵ و هەنار و لیمۆکان و دار قەزوان و دار بەڕووەکان، هەزاران گەڵا و گوڵ و داری دیکە، مۆسیقا دەڕوات، سێبەری باڵندەکە بەسەر دەشتێکی پان و پۆڕدا دەڕوات،

دەکەوێتە سەر لاقی تێکەڵی ژن و پیاوێک و کراس و تیشێرتێکی بابردوو، دەکەوێتە سەر سفرەی بەجێمای ناو چیمەن و تێدەپەڕێ و دەکەوێتە سەر میدالیای بە وێنەی هیتلەر و ستالینەوە دەکەوێتە سەر دەیان کتێب و ڕۆمان و میدالیای زێڕ و زیو، مۆسیقا هێمن دەبێتەوە، وێنەی باڵندەکە دەکەوێتە سەر دەریا و دەریای پڕ تیشک وێنەکەی پێ کاڵ نابێتەوە لەگەڵ دوا نۆتە و وەستانی مۆسیقادا باڵندەکە، کە سێبەرەکەی کەوتۆتە سەر پشتی منداڵێک هەر لە دەریادا، پێکەوە هەرچواریان، سێبەرەکە و منداڵەکە و باڵندەکە و مۆسیقاکە ون دەبن، بەڵام ئێمە کە گوێمان گرتووە تەنها دوویان دەبینین، تا کە پەیوەندی لە نێوان مۆسیقا و سێبەرەکەدا، خێرایی باڵ لێکدان و خێرای مۆسیقاکەیە.

دوای ئەوە ئارتووش ئەوەندەی حەزی لێبوو سێبەری باڵندەکان ببینێ هەرگیز ئەوەندە حەزی لە بینینی خودی باڵندەکان نەبوو. ئاغای موحسین ئەتایی شیرازی گوتبووی:

– ئەوە باشترین نموونەیە با واز لە بینینی سێبەرەکان بهێنین و باڵندەکان ببینین. زەردەخەنەیەکی زۆڵانەی گرتبوو:

– با واز لە نامە و نامەکاری بهێنین، با واز لە خەیاڵ و ئەفسوون و خەون بهێنین ژنەکان لە باوەش کەین.

هەر لەگەڵ ئەو قسەیەدا ئاگریان لە نامەکان بەردابوو، ژەنیار ئارتووشی لە باوەش کردبوو، بۆ یەکەمجار هەستی بە توندی مەمکەکانی کردبوو. ئاغا موحسین ئەتایی گوتبووی:

– لە دوای کوژانەوەی نامەکان مۆمێک پێکەن تەنها ماڵەکەی خۆتان ڕووناک کاتەوە.

کەس نەیگوتبوو مۆمێک لەپیووی بەراز.

## سنه

نامەکانیان سووتاند و شتە هەرە گرینگەکانی ژیانی خۆیان شاردەوە، پشتیان لە خۆیانکردو روویان کردە ژیان. دوو ساڵی یەکەم پەیمانەکەیان بردە سەر، کاریان دەکرد و دەچوونە سەیران و مریشکیان سوور دەکردەوە و دەنووستن. لە ناو هۆڵی سینەمادا ماچی یەکتریان دەکرد و لە پێشوازی میوانەکانیاندا پێدەکەنین، دەچوونە نمایشی سێرک تائاو بەچاویاندا دەهاتەخوارێ دەتریقانەوە، پانتۆڵی جینزیان لە پێ دەکرد و بابۆڵەی درێژیان بە ڕێگاوە دەخوارد و قاوەیان دەخواردەوە و گوڵە باغییەکانیان ئاودەدا و دەچوونە مەلە.

ساڵی سێیەم هەندێ کاتی تایبەت لە یەکتری ون دەبوون و هەر کەس لە ژوورێک دەمانەوە، تاساڵەکان پیرتر دەبوون و ژمارەیان زیادی دەکرد زیاتر خۆیان لە یەکتر دەدزییەوە و ئەو لەگەڵ چەنگە گڵێک و کڵاو و تەسبیحێک، ئەو لەگەڵ دەفتەرێکی بەرگ چەرم و سندووقێکی پزیشکی کۆن و هەندێ وێنە و ڕۆژنامەدا دەژیا.

کاکۆ لە ناخی ئەو نهێنییە توند پێچراوەدا لە دایک بوو، کاکۆ لەماڵێکی هێمن و پڕ پێکەنیندا پەروەردەکرا، بەڵام لە ناو دنیایەکی پڕ نهێنی و ترسناکدا ژیا. لە یەکەم فامکردنەوەیدا بێ ئەوەی کەس ئاگاداری کاتەوە ئەو دەیزانی بە ناو شووشەدا دەڕوات و هەنگاو دەنێ، دەبێ وریا بێت و بەریان نەکەوێت و نەیانشکێنێ.

ئەو هەموو زەردەخەنە بێ رووحە! ئەو هەموو گریانە شاراوەیە! هەمیشە چاوەڕێبوو کەسێک، رووداوێک، بوومەلەرزەیەک، بورکانێک ئەو تەونە توند و نهێنییەی ماڵیانی گەمارۆداوە بدڕێنێ و پاڵەوانە راستەقینەکانی ژیان دەرکەون. حەزی دەکرد هەمیشە سەیری ئەو فیلمە کارتۆنیانەکاتەوە کە منداڵێک یان گیانداریکی بریندار دەکەوێتە دارستانێک و مەرگ بەسەریەوە دەسووڕێتەوە تا دواجار پاڵەوانێک پەیدادەبێت و نهێنی دارستانەکەی بۆ ئاشکرا دەکات. ئەو فیلمە خەیاڵیانەی هەر فڕین بوون و هیچیان لەو جیهانە درزبردووە نەدەچوون سەرسامیان دەکرد.

ژەنیار قسەیەک لەسەر زمانی بوو هەمیشە دەیویست بیدرکێنێ. ئارتووش دەستی خستە سەر ئەژنۆی و گوتی، بێگومان هەر لە ناو فڕۆکە بۆینگە زەبەلاحەکەدا:

– دەبێ حەبەکانت بخۆی داوای ئاوت بۆ بکەم ؟

ئەوان دەفڕین و هەورە پەراگەندەکانیان دەبڕی، تەماشای دەستی ئارتووشی کرد لەسەر ئەژنۆی بە ئاستەم دەلەرزی، قامکەکانیشی لە جاران کورتتر هاتە بەرچاو، گوتی:

– بەقاوەکەوە خواردم.

ژەنیار لە وڵاتێک نزیک دەبۆوە سی و ئەوەندە ساڵ بوو جێی هێشتبوو، هەر لەوێ هەواڵی مەرگی ئازیزانی بیستبوو، ئەو هەواڵە قورسانە و بەو سادەییە، ئەو رۆژەی بۆ پێشوازی دۆستێکی نەشارەزا چووبووە وێستگەی شەمەندەفەر، مامۆستایەکی کۆنی شارەکەی خۆیانی دیت و لە یەکەم دیتندا پێی گوتبوو:

– چەند بە باپیرت دەچی، خوا عافووی کات پیاوێکی مەردبوو.

ئەو رۆژە سێ ساڵ و حەوت مانگ و چواردە رۆژ بەسەر مەرگی ئەو پیاوە بە

هەیکەل و کارکردەدا تێپەڕیبوو کە ژەنیار بەشێکی زۆر شیرینی ژیانی لە باوەشی ئەودا بەسەربردبوو، وشەی «خوا عافووی کات» چەند سادە هاتە سەر زاری ئەو دۆستە کۆن و سادەیە، وەک ئەوەی دەمێک بێت زانیبێتی رانەچڵەکاو تەسلیمی گریان و تەریقبوونەوە نەبوو، وای بەباش زانی دواتر بچێتەوە باخچەیەک و لەوێ بگریێ، یان بە پێ بچێتەوە بۆ ماڵ و لە رێگا تا خوا حەز دەکات بگریێ، دەکرێ بچێتە ئاو دەست و فرمێسک برێژێ، کە ئەوانەی بۆ نەکراوە زۆر درەنگ گەیشتەوە ماڵ و ئەوان خەریک بوون دەنووستن، زۆر بە هێمنی چووە ناو جێگاکەی و یەکسەر لە دوای تێکشکانێکی قووڵ و تاقەت پڕووکێن خەوی لێکەوت، بۆ بەیانی ئەو هەواڵەی بەیەکجار لە بیری خۆی بردەوە.

دواتر هەواڵی مردنی مام شالیاری و بەرتۆپکەوتنی ماڵی پوورە نازنازی و قورسترینیان خنکانی پوورە مەستوورەی کە بە منداڵی هەر بە مەستوورەی عەیار بانگیان دەکرد و ئەو پوورە ژیانی منداڵی خۆی بۆ هەموو کەس دەگێڕایەوە و دەیگوت:

– من لە کۆشکدا لە دایکبووم و لەبەر جوانی و ئەو هەموو نیعمەتەی ئەو ساڵە بەسەر ماندا باری کۆشکەکەیان هەر بە ناوی منەوە کرد، کۆشکەکە پڕ تاق و ژوور و هەیوان و هۆڵی گەورە بوو، هەر حەوشەکەی جێگای راوەستانی سێ سەد ئەسپ دەبۆوە.

ئینجا زۆر عەیارانە دەیگوت:

– ئەو کۆشکە بووە هی من و ئێستا برۆ بۆ سنە لە هەر لە منداڵێک بپرسە و بڵێ «کۆشکەکەی مەستوورەخانم» لە کوێیە بەو پەڕی رێزەوە تا بەردەرگاکەی لەگەڵت دێت.

ژەنیار دەیزانی لەو پەڕاگەندە بوونەی بنەماڵەکەی ئەو پوورەی لە سنە لە دایک بووە، بەڵام هەمیشە پوورە سەرناس و گەورەکەی کە لە دایکیان زیاتر خزمەتی دەکردن دەیگوت:

– لە بەردەمی ئەو کۆشکە کەلاوە و لەسەر پشتی کەرێکی دێز لە دایک بووە، مامانەکەشی ئایشە گوێدرێژ بوو.

یەکێکی دیکەش دەیگوت:

– چاوەکانی ئایشە گوێدرێژ جوانترین چاوەکانی دنیان. بۆ خۆشی شاژنێکە، پێیاندەگوت سەیارەی گوندیان.

خەریک بوو بزەی بێتێ کە لەناکاو قسەیەکی ئاغای ئەتایی بیرکەوتەوە کە دەیگوت:

– سەربووردی منداڵی ون بوونە لە پیریدا.

دەستەکانی ئارتووش کە تا ئەو کاتە هەر لەسەر ئەژنۆی بوون، پیرتر و بێدەسەڵاتتر هاتنەبەر چاوی. لەوە سەرسام بوو، کە تەمەن چەندە بە دڵ رەقی دەچێتە ناوپێستەوە. چاویلکەکەی لە چاو کرد و بۆ چرکەیەکیش بێت خۆشنوودبوو بەو رەنگە سپییە درەوشاوەی پانتۆڵە کەتانەکەی و لووسی و بۆنخۆشی کراسە رەشەکەی، وای بەچاک زانی ئاسوودەبێت و خۆی لەو هەڵچوون و ئاگر گرتنەی سەرەتای گەشتەکەی دوورخاتەوە و هەروا بزانێ دەچێتە وڵاتێک هەرگیز ناوی نەبیستووە و نەیدیوە و بۆ سۆراغی کەسیش ناچێت.

قسەکەی ئاغای موحسین ئەتایی شیرازی هاتەوە یاد کە دوای تەمەنێک لە تاران دادەبەزێ و دەڵێت:

– سینگم توندە، هەوای ئەو شارە رێی سییەکانم پێنازانێ.

ژەنیاری موراد بەگ هەوای تارانی دەناسی دەیزانی دەچێتە سینگی مردووشەوە، دوور لەو هەوا ئاڵوودەی ئێستای، بەڵام نەیگوت، نەیگوت ئاغای ئەتایی خەتات فەرموو ئاغای ئەتایی دواتر گوتبووی:

– ئیسلامیش خراپ نییە ئەگەر کچەکانیان زیندانی نەکەن.

ژەنیاریش شارەزایانە گوتبووی:

– کچی فارس لەودیو زیندانیشەوە هێندەی سەد ئەورووپای باوەشی پیاو گەرم دەکەنەوە. بەڵام دیسانەوە پاڕابۆوە کە چیرۆکی کابرای مۆسیقاژەنی ئازەری نەیەتەوە یاد.

ئاغای ئەتایی بێدەنگ پێکەنیبوو، پێکەنینێکی پان و فراوان و گوتبووی:

– بەڵێ سەروەرم تۆ هەمیشە گرەو لە من دەبەیەوە.

ئێستا ژەنیار دەڕوانێتە دەستەکانی ئارتووش و چاوە بێدەنگەکانی کاڕۆلین و دەڵێ:

– خودایە من چیم بردۆتەوە!

بێگومان لە دڵی خۆیدا. لەرزینێک لەبنی پێیەکانییەوە هەست پێدەکات کە ناهێڵێ ئاسان لەسەر تەختی فڕۆکەکەیان دانێ، ئەوە هەر هەمان ئەو لەرزینەیە سەردەمێک چنگە گڵێک دەیخستە دڵییەوە. نەخۆشی دڵی هاتەوە یاد و رەنگی حەبەکانی بەمێشکدا گوزرەیان کرد و هیچ گلەیی لەو دڵە جەربەزە و بێ حەیایەی خۆی نەکرد کە لە هەر چرکەیەکدا راوەستێ و بڵێ «من تائێرە و بەس» پارچە گۆشتێک ئەوەی ئەو لە کاتی پشکنینی دکتۆرەکان لەو ساڵانەی دواییدا دیبووی بێگومان لەسەر شاشە لەکەیەوە لێدەدات و چ لێدانێک، تا ئێستا سەدان جار ئەو پڕکێشییەی کردووە لەو قەفەزە زیندانەی سینگی بێتە دەرێ و ئارام ئارام بکەوێتە بەردەم پشیلەیەکی برسی و بەلەزەتەوە بیخوات و تۆزقاڵێکی لێنەهێڵێتەوە، دڵە کوتەی هەڵاتن و پەلە پەلی لە کاتی راکردن و خۆشاردنەوەدا، حەسرەتی ئاوارەیی و ساردبوونەوەی لە کاتی نائومێدیدا، دواتر لێدانی وەک بروسکی لەسەر سینگی کچان، «بزەیەکی شەیتانانەی هاتێ».

کچەی خزمەتگوزار شەربەتێکی مزری بۆ هێنابوو، زۆر بەلوتفەوە لێی وەرگرت، هەروا لەبەر خۆیەوە گوتی:

– تێپەری هەموو شتێک تێپەڕی. ئارتووش نەیزانی مەبەستی چییە، بەڵام دڵنیابوو ئەگەر لە ماڵی بووبان، لەبەری دەپاڕایەوەو دەستی ماچ دەکرد تاجارێکی دیکە کەمانەکە داگرێت و ئاوازی «سێبەری باڵندەیەک لە کاتی فڕین» دای بۆ بژەنێ، ئەو ئاوازە وەک بۆنی گوڵی عەقیق دەچووە ناو خوێنییەوە. ئەگەر ئێستا ئەو داوایەی کردبا ژەنیار رەتی نەدەکردەوە ئەگەرچی بێ ئەوەی پرسی پێ بکات ئاوازی «بۆ ئەبەد خامۆشی» دەژەنی ئەو ئاوازەی هەروا لە مێشکی خۆیدا دانابوو، چەند جارێک هەوڵی نووسینەوەی دابوو، ژەنیار چاوی دەنووقاند و هیچی نەدەدی کەمانێک لەوانەی هونەرمەندانی سیرامیک

دروستی دەکەن، ئەوەندە بچووکە لەسەر نینۆکەکانی دادەنێن، کەمانێک بەو بچووکییە لە مێشکدا، لە هۆڵێکی فراوانی مێشکدا دەژەنی لە هەموو ماوەی ژەنینەکەدا سەیری خۆڵەمێشێکی ئەستوور و تۆخی دەکرد، لە دوا لێداندا هەندێ جار تروسکەیەکی لە ژێری ژێرەوە دەدی. ئاوازی بۆ ئەبەد خامۆشی جیاواز بوو لەو کەڕەنایەی ئیسرافیل لە دوای بە خۆڵەمێش بوونی دنیا لێی دەدا.

کارۆلین بەوپەڕی متمانەوە پرسی:

– دەبێ ئومێدێکمان هەبێ؟ دەشێ بیدۆزنەوە؟

ئارتووش چاوەکانی تەڕبوون، دەستی خستە ناو قژی زەردوخاو و کورتی کارۆلین کە بێدەنگ دەیڕوانی، گوتی:

– دڵم بەوە خۆشە کە لەگەڵمان هاتی، ئەوەش فیداکارییە.

وشەی فیداکار چووە دڵی کارۆلینەوە، ئەو یەک تاکە هەڵوێستی خۆی بە فیداکاری دەهاتە بەرچاو ئەویش «فەرامۆشکردنی نامە دڵدارییەکانی کوڕێکی هاوپۆلی بوو، سەرەتا ئەو کوڕە ویستی ڕووبەڕوو لەگەڵی بدوێ، هەمیشە لێوەکانی دەلەرزین و سوور هەڵدەگەڕان، دواتر هەندێ دیاری و کارت و قەڵەمی نایاببوو سەیر و سەمەرەی بۆ دەنارد، ڕۆژێک کتێبێکی دایە و بە پێچەوانەی چاوەڕوانی کارۆلینەوە کە دەبوو ڕۆمانێکی عاشقانە بێت، ڕۆمانێک بوو دەربارەی ڕاوچییەک، کە سێ مانگی تەواو بۆسە بۆ باڵندەیەک دەنێتەوە، تەواوی ڕۆمانەکە باسی ژیان و سرکی ئەو باڵندەیە دەکات لەگەڵ شێوازی پڕ فیڵ و زیرەکانەی ڕاوچییەکە. ناوی ناوچەیەکەی ئەو باڵندەیە «سان پادینۆ» بوو، ئەو ڕۆژەی ڕاوچییەکە لە پلانێکی زۆر ورددا، بەبێ ئەوەی چاوەڕێ بێت، باڵندەکە دەکوژێت، ئەو دەیان نەخشەی دیکەی کە داینابوون پاشتر بیخاتەگەڕ بۆ گرتنی باڵندەکە بەخەسارچووبوون. ڕۆژی دواتر لە هەمان جێگا تەرمی ڕاوچییەکە دەدۆزنەوە، کەس بۆی ئاشکرانەبوو کە بۆچی خۆی کوشتووە.

جگە لە ڕۆماننووسەکە ئەویش دوای ئەوەی بە هەموو نەخشەکانی ڕاوچییەکەدا دەچێتەوە کە چەند تۆکمە و ورد و زیرەکانەن، بەڵام لە هەر هەموویاندا زیرەکی باڵندەکە

لەبەرچاو گیراوە کە بتوانێ لە دوا قۆناغدا خۆی رزگار بکات.

رۆماننووسەکە ئەوەی بە خۆشەویستییەکی قووڵ و بێپایانی راوچییەکە دانابوو بۆ باڵندەکە. لە دوای بڵاوبوونەوەی ئەو رۆمانە زۆر کەس، بەتایبەتی ڕاوچییەکانی خوارووی ئیتاڵیا و کەنارەکانی ئیسپانیا چەند راوچییەک لەوانەی پێیان دەڵێن راوچییەکانی جەنگەڵ هەوڵیاندابوو باڵندەیەکی سان پادینۆ بدۆزنەوە ئەگەر نەشتوانن راوی کەن وێنەیەکی لێ بگرن بیناسێنن. رۆماننووسەکەش یازدەجار رستەیەکی دووبارە کردبۆوە، ئەویش دوای کوژرانی راوچییەکە

«هەرکەسێ باڵندەی سان پادینۆ بکوژێ خوێنی دەرژێ» بەڵام و چۆن و بۆچی ئەوە دیار نەبوو. هاوشێوە واتای ئەو رستەیە چەند جارێک لە پێش پێکانی باڵندەکەش بە شێوازی جیاواز دووبارەکراوەتەوە وەک ئەوەی راوچییەکە دەڵێت «دیارە بڕیاری داوە من راو بکات»، یان «بەنیاز نییە پێش من ئاسمان جێهێڵێ» یان «برۆ واز لە گیانی من بهێنە» ئەو ژنەی کە دیار نییە چییە، تەنها لە کاتی ئامادەکردنی کیسەی خەودا ناوی دەهێنێ پێی دەڵێ:

«خۆت قوربانی ئەو تەیرە شوومە دەکەی.»

کارۆلین رۆمانەکەی لەوپەڕی ئاسوودەیدا خوێندەوە، لە دوای تەواوکردنی رۆمانەکە هەستی بە پەیوەندییەک کرد لە نێوان هاوڕێ هاوپۆلەکەی و راوچییەکەدا، کە ئەو نامەشی خوێندەوە کوڕەکە لەگەڵ رۆمانەکەدا ناردبووی لە ژێرەکەی نووسرابوو «راوچی سان پادینۆ» بەراستی ترسا و هەرگیز نەیتوانی لەو کوڕە شەرمن و تەریک و باریکە نزیک بێتەوە، نەیدەویست داوەتەکانی قبووڵکات و متمانەی پێ بکات و بەتایبەت دوای ئەوەی کاکۆی بەدڵ کردبوو.

زۆر دواتر راوچییەکان هەر کەسە و بەجیا چەندان وێنە و ژیاننامەی باڵندەی سان پادینۆیان بڵاوکردەوە، بەڵام هیچ کامەیان لەیەک نەدەچوون، تا ئەو رۆژەی ئەو رۆمانە بووە بابەتی دەرسەکەیان و مامۆستایەکی تاڕادەیەک فەیلەسووفیان زۆر لایەنی شاراوەی ئەو رۆمانەی روون کردەوە و هەر کەس و رای خۆی لەسەر دەربڕی،

دواكەس هاوپۆلەکەی کارۆلین بوو، گوتبووی:

– سان پادینۆ باڵندە نییە، عەشقێکە کە دەبێ بتکوژێ.

کارۆلین تێنەگەیی کە کوڕە گوتی دەبێ بیکوژی یان بتکوژێ.

مامۆستا فەیلەسووف و تاڕادەیەک گاڵتە جاڕەکەیان چەپڵەکی بۆ لێدابوو جا گوتبووی:

– بە ڕاستی ئەوەش ڕایەکی تایبەتە.

کاکۆ ئەو ڕۆژە گوتبووی:

– پێشتر من ئەو کوڕەم نەدیوە هەستم کردووە شتێک هەیە، تەنها وامزانیوە بە ڕاڕەوێکی تاریکدا دێت و لە شوێنێکی تاریک دادەنیشێت و لە تاریکیدا زۆر کەم دەنگی دێت.

هەر دوای ئەوە گوتبووی:

– بەڵام دوای ئەو بەیانییە هەستم کرد هەموو شوێنەکان تاریک بوون و جێگای ئەو ڕووناک بوە.

کەچی ئەو قسەیە هەرگیز نەبووە هۆی ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ ببەستێ و کاکۆ هەمیشە لە تەنهایی خۆیدا حەزی هاوڕێیەتی دەکرد ئەویش کچێک نەک کوڕ.

## پەمۆی سوور

ئیدی وەک هەر سێکیان بریارپیان دابێت، سەیری پەنجەرەکە نەکەن و لەگەڵ یەک لە ناو فڕۆکەکەدا بژین، سەیری یەکتریان کرد و بزەیەک، دەست لە سەر شان دانان و ئومێد بەیەکتر بەخشین. ژەنیار گوتی:

– هەر سەردانێکیشە، دەمێک بوو دەبوو هاتبامەوە.

هەر بە هەمان زەردەخەنە و سادەییەوە بە ئارتووشی گوت:

– زۆر تێپەڕیوە دەنا دەکرا زەماوەندەکەمان لە دێیەکی بچووک و هێمندا تازە بکەینەوە. ئارتووش وەک نۆبووکێک ئەو رایەی پێخۆش بوو، سەرشێتی کورد لە هەڵپەڕینیدا، دەهۆڵ کوتان و پێ بە عەرزدادان و هاوارکردن بێ ئەوەی کەس گوێ بگرێ. هەڵم و دووکەڵی سەر مەنجەڵ و پشتێنی خشاو چاوی پڕ ئاوی کابان و سەبیلی درێژ و باریک و پڕ نەخشی پیاوێکی ریش سپی، دیسانەوە گوپی پڕ هەواو و بە هەتاو سووتای زورناژەن و پێکەنینی ریزە کچێک، لەگەڵ ئەو هەموو دیمەنانەش ئارتووش

پەی بە دڵی بچووک و بێ هێز و نادیاری بووک نەبردبوو لەو دیو جلەکانییەوە.
وەکو بووکێک بیری لە دڵی خۆی کردەوە، دڵێک بە هەمان بچووکی خۆیەوە دوای ئاواز و مۆسیقای ژەنیار دەکەوت، بە ناو گەڵاکاندا، لەودیو لقەکانەوە، لە چاو هەڵهێنانی کۆڵۆکێک مۆسیقای قەرز دەکرد، ئەوەی زیاتر لێی دڵنیابوو، ئەو ئاوازانە برینەکانی ئەویان سارێژ نەدەکرد، چارەسەر و تیمار نەبوون ئەو ئاوازانە نەرم و هێمن تا قووڵایی برینەکانی شۆردەبنەوە، لەوکاتانەشدا برین تەواوی جەستەی دادەگرت، بەڵام رۆحی ئارام دەبۆوە، بە تەواوی بەو دەرزی رێژکردنەی چینەکان دەهاتەبەر چاوی کە بۆ چارەسەری نەخۆشی بەکاریان دەهێنا.
زووتر لەوەی کە چاوڕەێی دەکرد زانی کە هەڵەیە، کە ژیان لەسەر رێکەوتن و پەیمان ناچێتە سەر، چ هەڵەیەکی ترسناک، هەڵەی سووتانی نامەکان، سووتانی ئەو هەموو هەست و یادەوەری و وشە پڕ ژیان و ئازارە، لەوەش ترسناکتر هەڵەی هەڵواسینی کەمانەکەی ژەنیار بوو بە دیواردا، دوای چەند ساڵێک هەردووکیان لە ناخەوە هەستیان دەکرد، ئەویش لە یەک کاتدا کە ئەوە تەنها کەمانێک نییە، بەڵکو تەرمێکی هەڵواسراوە. تەرمێک، یان زیندانییەکی مەحکوم بە مەرگ کە تائێستا بەسەر سێدارەکەوەیەتی و گیان نەدا. سزادانی نامەکان و کەمانەکە رێگای بۆ ژیانێکی نهێنی و تا قیامەت بریندارەکەر خۆشکرد. ئەو نامانە هەرگیز نامەی دڵداری نەبوون جۆرە نامەیەک بوون لە وەرشە و کارگەی مێژوویەکی کۆن کە گوازرابۆوە ناخی ئەوان نووسرابوون یان کۆپی کرابوون.
هەر لە ناو فرۆکەکەوە، وەختێک دەستی لە دەستی ژەنیار دابوو گریانێکی قووڵی بۆ ئەو ئاوازانە هات کە بەسەر گەڵای دارەکانی باخێکەوە جێیان هێشتبوون، گریانێک وەک دەنکە تەسبیح بەسەر کۆڵمەکانی شۆڕدەبۆوە، ژەنیار دەمێک بوو چاوەڕێی ئەو گریانە بوو، بەڵام نەک لە ناو فرۆکەدا، دەستی خستە سەر شانی و سەری بە سینگی خۆی کردو گوتی:
– دڵنیابە دەیدۆزینەوە.

پێش ئەوەی ئارتووش خەیاڵی بۆ هیچ شتێ بڕوات ئەو گوتی:

– هەر حەز دەکات ئەزیەتماندات، دەنا ئێستا ئاگاداری ئەو سەفەرەشمانە.

ژەنیار هەرگیز حەزی لە دڵدانەوەیەکی ئاوا منداڵانەو راستەوخۆ نەبوو، لە تەمەنی درێژی ژن و مێردایەتیاندا سەدانجار بە سینگیدا گریابوو، هەمیشە رێگای دەدا لە رێگای هێمن و یەک ریتمی لێدانی دڵی خۆی ئارامی بە هەنسکەکانی ئەو ببەخشێ. تەواو پێچەوانەی ویستی خۆیان وەک دوو کەس پێکەوە نەژیان، دووکەسی عاشق و هەست ناسک مامەڵەیان لەگەڵ یەک نەکرد و لەسەر گۆرانییەک لێیان نەبوو بەمشت و مڕ، لەسەر سووتانی پەتاتە شەڕیان نەکرد، بە هۆی درەنگ هەستانەوە بەگژیەکتردا نەهاتن و نان خواردنی بەیانیان نەبووەکێشە، لە بیریان نییە لەسەر رەنگی جل و شووشتن و ئوتی کردنیان دەنگەدەنگیان کردبێ، وەک دوو کەسی کۆست کەوتوو کە خەمێکی گەورەتر و قووڵتریان هەیە هەرگیز لە خەمی رۆژانەدا نەژیان.

یەکەم شەوی پێکەوە ژیانیان ژەنیار نەیدەتوانی لە باوەشی کات، نەیدەتوانی ئەو ئەزموونە زۆر و زەوەند و گەورەیەی لەگەڵ جەستە و ران و مەمکی ژناندا هەیبوو لەگەڵ ئەودا بەکاربێنێ.

قورس بوو بۆ ژەنیار جەستەی ئەو، جەستەی کەسێک کە بۆ هەمیشە دەبێتە بەشێک لە خوی، دەبێتە بەشێک لە کەرامەتی لەگەڵ هیچ جەستە و جنس و ژنێک بەراورد کات.

نەشیتوانی وەک کەسێک بجووڵێتەوە کە بۆ یەکەم جار ژن بە رووتی لەتەنیشت خۆیەوە دەبینێ، ژەنیار بۆ یەکەم جار لە جەستەی ژنێک ترسا کە بە رووتی لە تەنیشتییەوە راکشابوو، جەستییەکی لووس و سپی و بێ موو، باریک بەڵام پڕ، بۆ خۆشی بێجامە و دەرپێیە کەی داکەندبوو، گڵۆپەکەی کوژاندبۆوە، دەستی بە ئاستەم بەرمەمکی کەوت، بچووک و توند، گۆیەکی خڕ و چاوەڕێ، سەدان مەمکی هاتبۆوە ناو زەین، مەمکی گەورە و نەرم، بچووک و رەق، گۆ رەش و ترێی، قیت و باریک، هەرمێی و سێگۆشە، پان و هێرشبەر، شەرمن و پڕتاسە، دڕندەو فوودراو، خێرا هەستا گڵۆپەکەی

داگیرساندەوە، ویستی لەبەر رووناکیدا تەنها لەگەڵ ژنەکەی خۆی بێت و بەو رووناکییە ئەوانی دیکە هەموو بشارێتەوە، شەرمی لەوە کردبوو، کە سێبەری زەکەری لەسەر دیوار وەنەوزی دەدا. لە بەختی ئەو ئارتووش چاوەکانی نووقاندبوون، ئەویش بڕیاری دا لە ڕێگای دەستییەوە و بەبێ چاوەکانی هەموو ئەندامەکانی جەستەی ژنەکەی بناسێ.

دەستی بۆ بەرزایی خوار سکی برد، ختووکەی یەکەم شەمامەی منداڵی، ختوکەی لووسی پێستی ژنێک دەخزیە ناو خوێنی، دەستی بەرەوخوارتر برد، ئاگرێک، هەمان ئەو ئاگرەی لەسەر زەکەرییەوە دەخزییە ناو پەنجە باریک و سپییەکانی ئارتووشەوە، تەنها ئەوەندەی دەربارەی ئەو ئاگرە دەزانی کە وەک ئاگری دۆزەخە سووتێنەر نییە، بەڵام تەواو وەک ئەو بەگڕوتین و هەناسەبڕە. «هەناسەیەک بۆ بڕان نەبێ بۆ چ باشە» چ ساڵانێکی ڕزیو بە سەر ئەو قسانەدا تێپەڕیون، ئەو قسەی ئیڤا کە هەموو گرووپەکە بە «پەمۆی سوور» بانگیان دەکرد، ئەوەش ئەوکاتە بوو کە ژەنیار لەگەڵ گرووپێکی خۆبەخش مۆسیقای بۆ نەخۆش و ئاوارە و بێدەرەتانان لێدەدا لە نەخۆشخانەکانی نەخۆشی قورس و خانەی پیران و کامپی ئاوارەکان کەوتبوون.

هەر یەک شەمەیەو دەچوونە شوێنێک، شەوێک دوای ئەوەی لەگەڵ کۆمەڵێک پیر شەرابیان خواردەوە و خەیاری سوێرکراویان خوارد و سەمایانکرد، هەموو گرووپەکە شەو هەر لەو شوێنەمانەوە و ئەویش تابەیانی لەگەڵ ئیڤا لە ژووریکدا پێکەوەبوون، سەرەتا لەشی یەکتریان بە کرێمێکی سپی چەورکرد کە بۆن گوێزی لێدەهات، زۆر جار بۆ نەخۆشەکانیشیان بەکاردەهێنا، ئیڤا چنگی پڕکردبوو لەو کرێمەو گونەکانی ئەوی تێدا ون کردبوون، چارەگێک لەشی یەکتریان چەورکردبوو، نیو سەعات یەکتریان لستبۆوە، نیو سەعاتی تەواویش لە ناو یەکتردا ون ببوون، ئیڤا کە پێشتر تەواو ببوو، لێدانی دڵی ژەنیاری گرتبوو سێ سەد و پازدە جاری لێی دابوو، لەوکاتەدا خەریک بوو ژەنیار ڕۆحی لە کونی زەکەرییەوە بێتە دەرێ گوتبووی:

– هەناسەبڕ بووم.

ئیڤاش هەر بەو لێوە ئەستوورانەی بۆ هەموو شتێکی بەکاردەهێنا گوتبووی:

– هەناسەیەک بۆ بران نەبێ بۆچ باشە.

بۆنی ئەو کرێمە چووبووە ناو پێستیانەوە مانگێکیش تێپەڕیبوو، دەچوونە هەر شوێنێک بۆنە کە لە پێش ئەوان دەگەیشت و بڵاودەبۆوە. لەو هەموو ساڵەی پێکەوە بوونیان لەگەڵ ئارتووش جارێک بەوجۆرە سەرجێیان نەکرد، هەرگیز دەربارەی رابردووی جەستەی خۆیان قەسەیەکیان نەکرد، ئێستا کە ژەنیار تەمەنی لە پەنجا و هەشت ساڵیدا بوو، ئارتووشیش چەند مانگێکی دیکە دەبووە پەنجا و یەک ساڵ.

ژەنیار خەریک بوو باوەڕی بەوە دەکرد ئەو پیاوە سەرسپی و بەرچاو تاڕادەیەک رەشەو دەموچاو بەگنجە و مل چرچەی لە ئاوێنەکەوە دەیبینێ خۆیەتی. چەند ساڵ پێشتر دەیویست بە رووتی لە کاتی مەلەکردن و جل گۆڕیندا ببینرێ، چونکە وایدەزانی بە رووتی جەستەی پتەوەو گەنجانە دیارە، بەڵام ئێستا ئەو ئاواتەشی نەمابوو.

## دیاربەکر

ئەوان هەر سێکیان ئەوەیان بەبیر یەکتر هێنایەوە کە زۆری نەماوە و دەبێ دابەزن، لە ئاسمانەوە ئەستەنبوڵ لە وڵاتێک دەچوو ژێر ئاو کەوتبێ و ئێستا بەشێکی کەمی شارەکە ئاوی لێ کشابێتەوە، ئارتووش لە قووڵایی دڵییەوە گوتی:

– لەگەڵ ئەو هەموو چیرۆکانەش ئەو شارەم هەر خۆش دەوێ.

دەیویست هیچ کام لەو حیکایەتە پڕ گریانانەی لە خانووی ژنە ئەرمەنییەکان بۆیان گێڕا بۆوە نەیەنەوە خەیاڵی، دوای ئەو تەمەنە ئاغای موحسین ئەتایی شیرازی بەپەنا دەزانی و ئەو کاتەبە چرپەوە پێی گوتبوو:

– خوێن، خوێنی رەچەڵەک نییە، ئەوە قسەیەکی رواڵەتی و هیچە، خوێن بەرهەمی ئەو نان و شیر و زەیتوونەیەکە دەیخۆی، خانمی رۆسن تۆ لە وڵاتێک پێگەیشتووی بە باران و گوڵ دەژی، ئیدی واز لەو خاکە بێنە کە باپیرانی تۆی نەویستووە و فڕێی داونە دەر.

ئارتووش ویستی وەک گەڕیدەیەک ئەو شارە جوانە ببینێ، هەر کە دابەزی پیاوێکی بچووک، بەڕیشێکی سپی و کراسێکی سپیترەوە، لووتێکی باریک و چاویلکەیەی پزیشکی لێوار زەردەوە، بۆی پێکەنی و گوتی:

– پێڵاوەکانت داکەنە.

ئارتووش پێڵاوەکانی داکەند و پێی خستە سەر چیمەنەکە، پیاوە پیرەکە پەنجەی بۆ شوێنێکی دوورتر درێژکرد و گوتی:

– بە پێخواسی بڕۆنە ناو ئەو گوڵانە پێ لە خاکی رووت نێ، گڵ و خۆڵی رووت.

ئەو چووە ناو گوڵەکان و پێیە پەنجاو یەک ساڵییەکانی لە بن گوڵەکان لە ناو خۆڵێکی ورد ون کرد. ختووکەیەک لە قووڵایی گڵەکەوە بە پێیەکانیدا سەرکەوت و دڵی وەک گوڵە لاولاوێک هەتاو لێی نەدا بێت گەشبۆوە، لە دوورەوە سەیری پیاوە پیرەکەی کرد دیتی سەماعەی پزیشکی بەسینگیدا شۆڕبۆتەوە، بێ ویستی خۆی وەک منداڵێک هاواری کرد و گوتی:

– ئۆی کوێربم باپیرە، ئەوەتۆی.

بەڕاکردن گەڕایەوە بۆ لای و دیتی پێڵاوەکانی بەدەست ژەنیارەوەن و سەرسام و حەیران تەماشای دەکات، ئارتووشیش زوو زوو دەڵێت:

– کوا؟ کوا؟ ئێستا لێرەبوو.

ژەنیار سەیری پێیە بچووک و سپییەکانی کرد، لە تۆز و خۆڵدا ون ببوون، هەر لەوێ دانیشتن و خەریک بوو پێیەکانی بۆ خاوێن دەکردەوەو پێڵاوەکانی لە پێی دەکردەوە. ژەنیار وەک پێی منداڵێکی بەدەستەوە بێت، لە تۆز و خۆڵ هەڵکێشرابێ، نەوازشی دەکردن.

کارۆلین هەنگاوێک لەوانەوە دوور بوو، بەڵام وەک سەدساڵ دووربێت، هیچ لەو دوو مەخلووقە، لەو پیڵاو داکەندن و تۆز و خۆلڕ و لە پێکردنەوەیە حاڵی نەدەبوو،

بەڵام وەک ئەوروپاییەک دەیزانی لە ناخی پەیوەندییاندا، دروست لەو شوێنەی پەنجەیان بەریەک دەکەوێت برینێک هەیە، برینێک کە ئەو لە ئازارەکەی ناگات.

بە ناو شەقامەکانی ئەو شارەدا سووڕانەوە، بەرانبەر دوکانەکان وەستان و روانیانە ئەو ریزە خەڵکەی خۆیانە بەسەر پەرژینی ئاسنینی پردەکەدا شۆڕکردبۆوە و راوە ماسییان دەکرد، هەتاو وەک هاوڕێیەکی خیانەتکار ماسییەکانی لە قووڵایی ئاوەکەدا دەدرەوشاندنەوە، ماسییەک بەو بچووکییە چ دڵخۆشییەکی لە رووخساری ئەو پیاوە دەموچاو داغانەدا دروست دەکرد. چوون بۆ ئوتێلێک و پشوویان دا ، نانیان خوارد و قاوەیان خواردەوە، چوونە سەر دەریا و کاڕۆلین مەلەی کرد، بە ناو خانووە رۆژهەڵاتییەکاندا گەڕان، ئارتووش بۆ دیواری بەرز و خشت چندا دەگەڕا، پەیامی ناو دەفتەرە بەرگ چەرمەکەی بیرکەوتەوە،

«لە پشت کەنیسەی رۆژهەڵات، سێیەم کۆڵان، یەکەم دەرگا یازدە پێ بۆ ژووریێ، نۆ پێ بەدەستە چەپدا، چوارگۆشەیەکی پەنجا و پێنج سانتیمەتری، چاڵێک هەڵکەنە، هەر لەوێ ئێسک و پروسکی شازادە رۆسنی گەورە و هەموو کەلووپەلە تایبەتەکانی و نهێنییەکانی دەدۆزنەوە»

ئارتووش بە هێمنی ناو کەنیسەکە گەڕا، بە دەوریدا سووڕایەوە، چەند رێڕەوێکی بەردین بە ناو باغ و چیمەنەکەدا تێدەپەڕین. تا ئەوکاتە نهێنی دەفتەرەکە و دیار نەمان و بردنی باس نەکردبوو، بە ژەنیاری نەگوتبوو کاکۆ تەنها دەفتەرە بەرگ چەرمەکەی بردووە؟ نەیگوت کاکۆ نهێنییەکی بردووە کە ئەوان لە منداڵییەوە لێی دەشاردنەوە، نەیگوت ئەو نهێنییەی ماڵەکەی لە کاکۆ کردووە بە دۆزەخ. ئەو دەفتەرە نەخشەی زۆر وردی ئەو شارەی تێدابوو، ماڵی خزم و کەس، دوکان و نووسینگەی دکتۆر، کەنیسە و قوتابخانەی مۆسیقی، یانە و شوێنی حەوانەی ئەرمەنەکان، هەموو شتێک دەیویست بڵێ کاکۆ بە دوای ئەو نەخشانەدا هاتووە، دەیویست بڵێ دەکرێ لەو نەخشانەوە سۆراغی کاکۆش بکەن. یان نەخشەکان لەگەڵ خۆیان بردبێ، بەڵام کاتی

خۆی ئاغای موحسین ئەتایی شیرازی لەسەر نەخشەی وڵات بەژەنیاری گوتبوو:

– ئەو هێڵە سوورانەی جوگرافیا بێمانان، هەر ئەوان خوێنی ئینسانەکان دەدزن، تۆ خوێنی خۆت بکە ناو هێڵی نەخشەکانی ژیانتەوە.

ژەنیار کە ئەوکاتە فێرببوو نەفەس نەفەس تریاکی لەگەڵ ئاغای شیرازی دەکێشا گوتبووی:

– ئاغام، جەنابت دەزانی ئەو هێڵانە چەند بێڕەحمانە خوێنی ئێمەیان دزیوە.

ئاغای ئەتایی بۆی تەواوکردبوو:

– بێ ئەوەی هێڵێکێشتان هەبێ.

دواتر ژەنیار نەفەسێکی قووڵی هەڵمژێ بوو، گوتبووی:

– خۆزگە ئەو هێڵانە سوورنەبان:

ئەتایی گوتبووی:

– من لە هێڵە سوورەکان و تۆ بۆ هێڵە سوورەکان رامان کردووە، بەڵام خوێنی ئێمە پەیوەندی بەوانەوە نییە، خوێنی ئێمە بۆ جووڵانی دەستمان و درەوشانەوەی چاومان و لێدانی دڵمان و نەوەستان مێشکمانە.

ئاغای ئەتایی لە دوای چەند نەفەس تریاک دەگەیشتە ئەوپەڕی زەوقی خۆی و دەیگوت:

– خوێنی من دەستی خانمی شیرازیشی نەدا، ئاخ ژەنیار ئەمشەو چەن پێویستم پێیەتی.

ئەو شەوە ژەنیار ئاهەنگی «پەڕەندەی سەر دەریای لێدابوو» ئەو ئاوازە لە یەکێک لە باڵندەکانی سەر کەشتییەکەی نوح دەدوا، بەڵام ئەو باڵندەیە ناگەڕێتەوە سەر کەشتییەکە و لەسەر دەریا عاسی دەبێت، نەفەسە هەرە تەنگەکانی ئەو ئاوازە لەو کاتانەدایە کە باڵندەکە دەنگێکی سەیری وەکو هاوار لێ بەرز لێ دەبێتەوە، لەوکاتەدا نەدەگاتە وشکانی نەدەشتوانێ لەوە زیاتر لە هەوادا بفڕێ. ئەو شەوە

ئەتایی شیرازی گوتبووی:

– ئەو چەتیوە کەشتی نوحە، بەڵام هەمیشە من بە دوای چڵەگیایەکدا دەنێرێ.

ئارتووش چوار دەوری کەنیسەی گەورەی رووەو رۆژهەڵاتی بەسەرکردبۆوە، لە هەر بنچکە گیایەک و برگە گوڵێک رامابوو، زەینیدا بۆ ژێر هەر درەختێک، دەبێ ئەو چاڵە یان ئەو گۆڕە لە کوێ بێت؟ گۆڕی رۆسنی گەورە، گەورەی خانەوەدەیان لە بن کامەیان بێت، لە دەفتەرەکەدا نووسرابوو، لە دەستی راستی رۆسندا کلیلێک شاردراوەتەوە، ئەو کلیلە لە بەرگێکی چەرمی قاوەییدایە، بە تەواوەتی لەبن قوبەی ناوەندی کەنیسەی گەورەی رۆژهەڵات، کاشییەکی شینی کاڵ هەیە، پێنج کاشی بە چوار دەوریدا لابرێ، دەرگایەک هەیە، کە تەنها بەو کلیلە دەکرێتەوە کەنیسەی راستەقینە، کتێبی راستەقینە لەوێدایە»

ئەوان هەر سێکیان لە کەنار دەریا دانیشتبوون، کارۆلین ئاوی لێدەچۆڕا، سواری بەلەمێک بوون، بە دەوری شاردا گەڕان. کاکۆ جارێک بە جلێکی سپییەوە، جارێک بەتیشێرتێکی سوورەوە، جارێک چەتر بەدەست و جارێک پرچ درێژ دەردەکەوت، بەڵام کەسیان دەنگیان نەگەیشتە ئەو هەموو کاکۆیانەی دەیاندیتن.

جارێکی دیکە فڕین، دیاربەکر کە بۆ ئارتووش تەنها فرمێسکێکی گەورە بوو، بۆ ژەنیار شاری رەنگ و بۆ کارۆلین شاری هەتاو بوو.

چ گاڵتەیەکە پێت وابێ نەوەکانی ئەڤینتوو لەو شارەمابن، ئارتووش سەدان جار ناوی ئەو شارەی لە حیکایەتە لە بن نەهاتووەکانی ژنانی ماڵی ئەرمەنیدا بیستبوو، بەڵام لەو حیکایەتاندا ئەو شارە هێلانەیەک بوو لە پووش کە دەکرا هەر لەحزەیەک گڕبگرێ. بۆیە زۆرجار بە هێلانەی پووش ناویان دەبرد، یەکێک لە ژنە ئەرمەنەکان گوتبووی:

– دوای سی و سێ رۆژ ئەوان گەیشتبوونە شارێک، شارێک کە دانیشتووانەکەشی پێیانوابووە ماڵیان لە پووشە، ماڵیان هێلانەیەکە لەسەر بەرە دەستی دێوە.

ژنە وەک تەندوورێک بێت و لەناکاو لە خەفە بوونی هەناسەیەکی تەقیبێتەوە، دەڵێ:

– چ کاروانێک! بەدبەخترین کاروانی دنیا.

بێ ئەوەی لە گەڵ کەس قسە بکەن، بێ ئەوەی گوێیان لە گۆرانییەک بێت، بێ ئەوەی بزەی منداڵێک ببینن بەو شارەدا تێپەڕین، ئیدی ناوی هیچ شارێک و هیچ گوندێکیان نەپرسی، حەزیان نەکرد دابەزن و شنەیەک لێیان دا، بە ناو هەوایەک لە پۆڵادا تێدەپەڕین، ئەو وڵاتە وەک نەفرەتێکی زێڕین وەک مەحیبەتێک لە ئاسن و خەنجەر دەچوون ناو قووڵایی دڵیانەوە.

بە راستی ئەوان هیچ بوون، هیچ هەر هیچ بەرانبەر مێژوویەک تا قیامەت نەفرەت. زۆرجار دەیانویست پەنجە راکێشن، بێگومان لە ناو خەیاڵی کاکۆدا، پەنجە راکێشن بۆ پیاوێک، پیاوێکی باڵا بەرز و قژدرێژ لە ژێر دارێکی تەنها و تاقانە خەریکی وێنەگرتنی گەڵایەکە کە خەریکە لە هەوادا دەکەوێ، ئەو گەڵایە لە هەموو وەرزەکاندا وەک یەک دەوەرێ.

کارۆلین باوەڕی بەو پیاوە نەکردبوو، چونکە «لە ژێر دارەکان هەبوو» ئەو رای وابوو کەسێک کە بتوانێ بۆ هەمیشە لە ژێر هەموو دارەکان و لە سەر هەموو رێگا باریکەکان بێت ئەو کەسە ئەگەر هەموو دنیا ببینێ وجوودی نییە. ئەو رایەی کارۆلین جگە لە سادەییەکی ئەوروپاییانە کە هەندێ جار دەچووە خانەی گێلییەوە هیچی دیکە نەبوو.

ئەو پیاوە باڵا بەرزە، جیمس پۆڵ براون، ئەو پیاوەی وەک ئەفسانەیەک چووە ناو مێژووی کامێراوە، ئەو پیاوەی رۆح ویژدانی گەورەترین سەرۆکی دنیای لەرزاند و بۆ هەمیشە لە ترسێکدا بەجێی هێشت کە ناشاردرێتەوە. ئەو پیاوە بە هەمان کامێرای سندووقەوە بەردەوام وێنەکان دەگرێت. ئەو پیاوە سەیری رێبوارەکان دەکات و بەرانبەریان رادەوەستێ و وەک ئەوەی چاوەڕێیان بکات، هەر کەسێکیش لێی نزیک

بێتەوە، پێش ئەوەی دەستی بەربکەوێت لە ناو گێژەڵووکەیەکدا ون دەبێت.

ژەنیار بێ ئەوەی هەست بەو تەمەنەی خۆی بکات، بە سووکی منداڵێکەوە چاوەڕێ بوو، چاوەڕێ بوو دوای ئەو هەموو وتە پڕ حیکمەت و تورەهاتانەی بە هیچ دەهاتنە بەرچاوی رۆژێک لە رۆژان لە دەفتەرەکەی یاداشتی دەکردن، وەک ئەوەی باسی پێڵاو و نیشتیمان دەکات. هەستی بەگەنجی خۆی دەکرد، هێز و توانای لێدەڕژا، بەڵام ئاخ لە دڵێکی پیر و پەککەوت کە هەمیشە تێپەڕینی زەمەنی بەبیردێنایەوە، دڵێک لە دوای کاروانەوە بێ پەروا هاواری دەکرد بوەستن.

ژەنیار دڵی خۆی وەک ئەو قۆریە شووشە چینییە گوڵ سوورە دەهاتە بەرچاو بۆ ئەوەی لێک نەبێتەوە تەڵ بەند یان کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا گوتی:

– دڵێکی تەڵ بەند..ئەویش زیادە.

کاڕۆلین لەو هەموو پۆلیس و پشکنینە سەرسام بوو. سەربازە روو گرژەکەی سەرسنوور وەختێک دەستی لە ستییان و دەرپێ سوورەکەی ناو جانتاکەیدا تەزوویەکی پێداهات و پێکەنی، بەڵام ئەو زۆر نیگەران بوو، کە سەربازێکی دیکە لەو کاتەدا خەریکی راکێشانی فیلمی ناو کامێراکەی بوو بۆ ئەوەی هەموو ئەو وێنانەی گرتوونی لەو وڵاتەدا بسڕێتەوە، ئارتووش چاوی بڕییە تەیرێکی بەرسک سپی، ویستی بە نیگەرانی خۆی بڕەوێنێتەوە، گوتی:

– چش لە وێنەکان.

ژەنیار هیچی نەگوت، حەسرەتێک و دنیایەک بیرەوەری قوتدایەوە، کاڕۆلین وەک لە کاکۆی بپرسی گوتی:

– ئەو جیمس پۆڵ براونە بێ مێشکە ئەو وێنانەی چۆن رزگار کردووە.

ئەو کات کاکۆ تاکە خولیای وێنەبوو، تاکە خولیای کامێرەی براون بوو، گوتبووی:

– زۆرجار منداڵێک لەبەر دەستی چەندان جەردە رزگار دەبێت و بە ناو

شمشێرەکانیدا تێدەپەڕێ بێ ئەوەی دڵۆپە خوێنێکی لێ بێت.

ئەودەم کاکۆ ناوی سەید حوسێنی جهانگیری نەبیستبوو، بەڵام دەیزانی چیرۆکی براون لە شوێنێکدا قرتاوە، هەر ئەو قرتانەش لە ژیانی کاکۆدا لەرزی خستبووە ژیانی هەموویانەوە.

## بەهەشت

کاکۆ هیچی لەگەڵ خۆی نەهێنابۆوە، سندووقێکی بچووکی فیلم و دووچاو، دووچاوی گیرۆدەی ئەو دیوی پەنجەرە، دەفتەرێکیش، وەک گەڵایەک بە دۆزەخدا تێپەڕیبێ هەڵقرچابوو. کاکۆ نەک دەفتەرەکە، هەروا گەڕابۆوە باخچەکەی ئۆڕانۆس، دارستانێک کە جگە لە باخەوانەکان کەس خاوەنی نەبوو، کوڕە هەرە بچووکەکەی باخەوان کە ئەوکاتە تەمەنی حەفتا و ئەوەندە ساڵ بوو، گووتبووی:

– چاوەڕێت بووم، من خزمەتی دارەکانی دەکەم و تۆش ئاگاداری پەیکەر و گەڵا نووسراو و تەختە و دارە هەڵکەنراوەکان بە.

کاکۆ لەوپەڕی ماتیدا، ماتییەک بەشی هەمووان بکات دەڵێ:

– نا، من هاتووم چاوەڕێ بم.

پێش ئەوەی قسەکەی تەواوکات، کوڕە بچووکی باخەوان، گوتی:

– تۆ پێشتریش چاوەڕێی بووی. تۆ وەسیەتی باپیرە گەورەمانت لە بیرنییە، کە ئۆرانۆس یەکێک لە ئاوازەکانی بۆ ئەو دانابوو، «قەدەری ئاو» ئەو باپیرەمان گوتبووی

تا دەتوانی بژی کاتێکی ئەبەدیتان بۆ چاوەڕوانی هەیە.

کاکۆ لەبەر خۆیەوە گوتی «قەدەری ئاو» هەر وەک ئاو پڕ بوو لە چاوەڕوانی و ژیان، بەڵام باخەوانی چووکەڵە بیرکردنەوەی دەشێوێنێ بەو پەڕی دڵنیاییەوە دەڵێت:

– قوربان قەدەری ئاو ڕۆیشتنە نەک چاوەڕێکردن.

ئاو دەوەستێت لەو دیو دیواری گوێتەوە دەوەستێت، وەک دڵۆپە ئاوێک لەودیو دیواری گوێتەوە بوەستێ، وەک دەریایەک لەودیو چیایەکەوە بوەستێ، بەڵام ئاوازەکە زوو دەیگوت ئەوە چاوەڕوانی نییە، ئەوە کون کردنی ئاسنە بە نیگا، ئەوە کونکردنی رووناکییە بە دەرزی.

کاکۆ تا ئەو کاتە جانتای سەفەری بەشانییەوە بوو، بەباخەوانە هاوڕێ و هاونشینەکەی دەگوت:

– من سەفەرم کرد تا بەردی چاوەڕوانی بشکێنم، چوومە ئەو سەری دنیا، بەناو باخدا تێپەڕیم و دوای پێچی شاخەکانم بڕی. وەک دوا نەفەر سواری ئۆتۆبووس بووم و سەندەویچی سارد و بێتامی دەستگێڕەکانم خوارد، سواری کەشتی بووم و وەک نەناسێک لە ناو هەزاران ڕێبواردا شاد و ساز چاوم دەسووڕاند و بەدەم هەموویانەوە پێدەکەنیم.

هەتیوبازەکان دەستیان بۆ دێنام و بە چاوێکی وەک شەڕاب سوورەوە داوایان دەکرد هێلکە کوڵاوەکانی سەرمێزەکەم پاک کەن، ئەو پیرە پیاوانەی ئاڵووش کەوتبووە لەشیانەوە کیسە باخەڵەکانی خۆیان دەدامێ هەر ئەوەندەی رازی بم نەفەسێک لە نێرگەلەکەم دەن کە بۆنی سێوی بە هەموو ڕاڕەوەکاندا بڵاوکردبۆوە، ژنە سۆزانییەکان ئەوانەی ئەو ڕۆژە کاری کەمیان دەستکەوتبوو ستیانەکانیان بە پەنجەرەکەمەوە هەڵدەواسی، منیش حەزم لە ڕەنگی ستیانەکانیان بوو هەرگیز نەمتوانی بۆنی لەشی بەخەنجەر بێژراو و ئەو هەموو بۆنە بکەم لە سەر لە شیان کەڵەکەببوو.

دوا نەوەی باخەوانەکان وەک ئەوەی بۆنی جەهەننەم بکات، هەنگاوێک دوورکەوتەوە و گوتی:

– چ میحنەتێکت هێناوەتەوە ئەی سەرگەردان! دارەکان لە توندی ئەو هەناسەیەی لە حیکایەتەکانتەوە دێن خەریکە بڕشێنەوە، تەنها باسی خۆتم بۆ بکە، لەبەر کێ هەڵاتووی؟

کاکۆ جەنتاکەی دانا و لەسەر بەردێکی شینی تاشراو و دانیشت و گوتی:

– سەرگەردان بووم، چوومە ماڵێک، کچێک لە حەوشەکەی چاوەڕێی دەکرد، کە چوومە ژوور لە جێگای ئەو کچە شۆڕە دارێک کە گەڵاکانی تابەرپێی دنیا شۆرببوونەوە، ملوانکەیەکی کوژەکەی لە گەردنی کرابوو رووابوو. من چوومە ژووری و دایکی چاوەڕێی دەکرد حیکایەتی مێردەکەی بۆ کەسێک بگێڕێتەوە، وێنەیەکی لێ بوو چاوەڕێی دەکرد رەنگە نەبووەکانی خۆی بداتە کەسێک بیباتە ئەو سەری دنیا، لەوێ لەو بنی دنیایە سندووقێکی بچووکی بداتێ ، کە فیلمێکی تێدایە تا ئێستا هەزار جار سووتاوە. ئەو وێنەیەی لەسەر دیواری ماڵە کوردێک بوو بردمی هەزاران پێڵاوی سووتاو و کەلەپچەی کۆن و شکاو و سینگی پڕ گوللەی پیشاندام، باخەوانی برام من دەفتەرێک هەموو ژیانی وێران کردم، دەفتەرێک کە بۆنی سەرەتانی گەدەی لێدیت، ئەی دەبێت ئەو هەزاران دەفتەرەی کە لەو ئەشکەوتەدا باڵیی دەدان چ کاولبوونێک لە ناخمدا دەست پێ بکەن. مێردی ئەو ژنە چاوەڕێی دەکات حیکایەتی ژنەکەی تەواو بێت و رێبواری گوێگر هەرکەس بێت بیکوژێ، هەر لەبەر ئەوەشە حیکایەتەکانی ئەو ژنە بە دنیادا بڵاونەبوونەوە.

باخەوانەکە سەیرێکی وردی کاکۆی کرد و پرسی:

– خۆ تۆ نەکوژراوی؟

کاکۆ بە هێمنی گوتی:

– ئەو ژنە هەرگیز حیکایەتەکانی تەواو نابێ.

باخەوانەکە زۆر ئارام گوتی:

– کەواتە ئەو پیاوە کەسی نەکوشتووە.

کاکۆ گوتی:

– لەویٚ کوشتن شتێکی دیکەیە، دیوارەکان و دەرگای کانتۆری جل خوێنیان لێدێت، ئینسانەکان هەرگیز لە کاتی کوشتندا خوێنیان لێنایە، من هاتوومەوە، بەڵام نازانم چۆن، دووچاو لەو دیوە پەنجەرەیەکەوە بەندی کردووم.

دووچاو، من لەو دیوی پەنجەرەبم ئەو لە ناو بافرێکی وشک، بەکراسێکی درێژەوە لە هەتاو، بەلای دارەکاندا تێدەپەڕیٚ و باڵندە سڕبووەکانی زستان بە فوویەک لە خەو هەڵدەستێنیٚ، بەدادانەوەی پێڵوویەک گوڵەکان بەئاگادێنیٚ، من چاوەڕێم دەکرد، هەروەک چۆلەکەیەکی سڕبوو، هەروەک گوڵێک لە لێواری زبڵدان دەڕوێت چاوەڕیٚ بووم، بە فوویەک، چاوەڕیٚ بووم بەپێڵوو لێکدانێک لە چاوەڕوانی خۆم بە ئاگام بێنیٚ.

باخەوانەکە وەختێک لەسەر قەدی دارێک نانی دادەنا، پەنیر و شووشەیەک شەڕاب و هەندیٚ زەیتوون، گوتی:

– کەواتە تۆ لەویٚ، لەو دیو پەنجەرە چاوەڕیٚ دەکەی و بەئاگاش نەهاتووی؟.

کاکۆ کە دنکە زەیتوونێکی رەشی چەوری لەسەر گیاکە هەڵدەگرتەوە، گوتی:

– ئەو کچەی بەکراسێکی درێژەوە باڵندە سڕبووەکان لە خەو هەڵدەستێنیٚ بێتە ئەو باخە، هەموو یادگارییەکان، هەموو پەیکەر و گەڵا نووسراوەکان، سێبەری عەشقەکان و رۆحیانەتیان لەبن دار و سابات و سەر درەختەکان لە خەو هەڵدەستێنیٚ، لە مردنێکی لەبن هاتووە رزگاریان دەکات، ئەو شیعرانە، ئەو وتە پڕ حیکمەتانە لەسەر سینگی رەق و بیٚ رەونەقی تەختە و دار و بەردەکان رزگار دەکات و دەیانگێڕێتەوە ناو سینگی عەشقەکان، دەیانگێڕێتەوە ناو جووڵە، جوانترین شیعرەکان، پڕ حیکمەتترین وشەکان، هێمای پەیکەرە بەردەکان دەکاتەوە بە درەوشانەوەیەک لە چاودا، دەکاتەوەبە وزەی یەکتر گوشین و گەرم وگوڕی سینگ.

کوڕە هەرە منداڵەکەی باخەوانی پڕ حیکمەت نەیدەویست بڵێت:

– خۆ شیعرە هەرە جوانەکانی ئەو دنیایە بۆ کەسێک نەگوتراون، وتە پڕ حیکمەتەکانی خۆشەویستی لە تەنهاییەکی قووڵدا نووسراون، کوا لە کوێدا عەشقەکان تاسەی چاوەڕوانی یەکتریان شکاندووە.

باخەوانەکە دەیویست بڵێت:

– کە مۆسیقا فەزای نێوانیانی پڕکردەوە، لە ژوورەکەی ئۆڕانۆسەوە کە گوڵە لاولاوێکی مۆر پەنجەرەکەی داپۆشیوە ئاوازێک بەپێی ترپەی دڵ لە گوڵێکەوە دەچووە سەر گوڵێکی دیکە. ئەو ئاوازە هەر بۆ خۆی ناوی ئۆڕانۆس بوو، بە هەنگاوی کورت لە گوڵە نزیکەکانەوە دەپەڕییەوە و بە هەنگاوی درێژیش نێوان گوڵە دوورەکانی دەبڕی. شا ئۆڕانۆس بە پێڵاوێکی سوورەوە، لەگەڵ ئاوازەکە دەفڕییە سەر گوڵەکان.

باخەوانەکە بە خەمبارییەک قووڵتر لەوەی مێژوو چاوەڕێی بوو، روانییە کاکۆ بە شەوقێکی ئەفسووناوییەوە گوێی گرتبوو.

لە ژێر ئەو ئاوازەدا زەیتوون و شەراب و پەنیریان خوارد، لە ژێر ئەو ئاوازەدا کاکۆ روانییە شا ئۆڕانۆس، باخەوانەکەش وەک کانییەک لە فرمێسک وەستابوو، دەیزانی لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم ئەستێرە، ئۆڕانۆس لە ناو گوڵێکی گەورەدا دادەنیشت و دواتر گوڵەکە دەچێتەوە و ناو یەک و ون دەبێت، ئەو کات دەبێت تابەیانی بەدیار کاکۆ وێرد بخوێنێ و باڵندەکانی تۆس بدوێنێ و لەگەڵ دەرکەوتنەوەی خۆر بۆ ئەبەد کاکۆ دەبێتە ئەمیری چاوەڕوانی و کلیلی دەرگایەکی دەدرێتێ لەودیوی ئەفسوونی مۆسیقاوەوە، دەبێ تا دنیا دنیایە بە دوای ئەو دەرگایەدا بگەڕێ و ئەو شیعرەی لەسەر بنووسێ کە بە هەموو تەمەنی هۆنیویەتییەوە. هەر ئەوەش نهێنی دەرکەوتنەوەی ئۆڕانۆس و نهێنی چاوەڕوانییە.

هەر کە گوڵەکە بەخۆی و ئۆڕانۆسەوە ون بوو یان چۆوە ناو یەک و داخرا، ئاوازەکە وەک دڵێکی ماندوو کەوتە سەر گەڵاکان و چیرۆکێک دەستی پێکرد کە لە یادی باخەوانەکەش نەبوو، هەر کە گوڵەکە بەسەر خۆی و ئۆڕانۆسدا داخرا، ئیدی ئاوازەکە وەک دڵێکی بریندار بۆ دڵنەوایی بەجێما، مانگ لەوپەڕی گەورەیی خۆیدا دەرکەت.

کاکۆ سەری خستبووە سەرشانی باخەوانەکە و پرچی درێژ و سپی و لوولی دەموچاوی کاکۆی داپۆشیبوو، لە دڵەوە هەستیان دەکرد خەڵکی شارەکەی تەنیشتیان هاتوونە سەرجادەکان و بێدەنگ لەبەر رووناکی مانگ پیاسە دەکەن. باخەوانەکە

وێردەکانی دەخوێند، جار جارە دەنگێکی بارێکی لێ بەرز دەبۆوە:

– پیرۆزی کە، بە دەوری ئەوماڵەدا، بە دەوری ئەو باخەدا، بە دەوری ئەو شارەدا، بڵاوی کەوە هەناسەی، رۆحی پاکت وەک جامێک لە رووناکی برێژە ناو گەرووی.

کاکۆ زووتر دەیزانی دەبێتە ئەمیری چاوەڕوانی، لەو رۆژەی جیمس پۆڵ بروانی ناسی، ئەو رۆژەی لە ناو کتێبێک گوێی لە دەنگی پێی ئۆرانۆس بوو، ئەو رۆژەی لەگەڵ حوسێنی جیهانگیر سەفەری کرد دەیزانی ئەو ئەمیری چاوەڕوانییە، بەڵام نەیدەزانی دەبێ کلیلێک و لە کوێ بشارێتەوە، دەستەکانی نابنە پاسەوانی کلیلێک دەبێ هەر خەریکی تاشینی بەرد بن، چاوەکانی لە روانین و پێیەکانی کۆڵهەڵگر، کاکۆ دەیگوت:

– خودایە لە کوێ ئەو کلیلە دابنێم؟

باخەوانەکە گوتی:

– دەبێ بیخەیتە بن زمانت.

کاکۆ لە میحنەتی خۆی تێگەیشت و گوتی:

– خودایە چ سزایەکە، چاوەڕێ بم و کلیلێک لە بن زمانم بێت.

باخەوانەکە دەیویست کاکۆ راکشێ، دەسرە مۆرە ئاوریشمە تەنکەکەی ئۆرانۆسی بخاتە سەرچاوەکانی و کلیلەکەش بخاتە ژێر سەری و وێردی «جێمان مەهێڵە درەخت» بخوێنێ. ئەو وێردە دەبوو هەموو باخەوانەکان بیزانن هەرچەندە تا ئێستا تەنها دووکەسیان هەلی ئەوەیان بۆ هەڵکەتووە ئەو وێردە بخوێنن، دەبێ ئەو شەو ئەویش ببێتە سێیەم کەس کە ئەو وێردە بخوێنێ، حەزی دەکرد براکانی و برازاکانی و نەوەکانی لەوێ بن و بە دەورەی کاکۆدا کۆڕ بگرن و شەرابی هەرە کۆنی دنیا لە کووپە بەردینەکان و هەر بە کاسی ئۆرانۆس بخۆنەوە، شەرابی تۆس وەک شەرابی تەمەن تەنها یەک جار دەخورێتەوە.

باخەوانەکە دەیگوت:

– لە کوێن، دەبێ لێرەبن و گوێتان لە دوا وێردم بێت، دەبێ گوێتان لێبێ بزانن دەنگم نالەرزێ و زمانم تەتەڵە ناکات، چاوم بە دوای ئێوەدا ناگەڕێ، دەبێ لێرەبن و لەگەڵ

بوونەوەی سەری کوپە بەردینەکانی شەرابی تۆس و خواردنەوەی ئەو وێردانە لەسەر بەردی سینگتان، هەر بەو شەرابە لەسەر پەڕەی زمانتان بنووسنەوە.

زووتر بە کاکۆی گوتبوو برا هەرە گەورەکەیان لە وڵاتێکی دیکە دێرێکی لە ناو شاخی سان سپارتادا دۆزیوەتەوە، ئەو دێرە لەبەردی شاخەکە هەڵکەندراوە و لە سەدەی شەشدا تەواو بووە، باخەوانەکە دەیگوت:

– دەبوو زووتر هاتبایەوە ، ئەو دێرە تازە بە تۆ خاوێن ناکرێتەوە، ئەو پیاوانەی پایە و پەنجەرە و دیواری بەردینی ئەو شاخەت لەگەڵ دەڕنن بە هیلاک دەچن. ئەو برا گەورەیەی باخەوان نەیدەهێشت کەس وێنەی ئەو دێرە بگرێ و باوەڕی وابوو بڵاوکردنەوەی وێنە و فیلم لەسەری ئیدی سیحر و جوانییەکەی نامێنێت و فەساد دەگاتە ئەویش.

برا هەرە بچووکەکەی کە تەنها پێنج ساڵ لە خۆی گەورەتربوو لەو شارە دەژیا، ئەویش چەند ساڵ پێشتر وازی لە باخەوانی هێنابوو لەسەر زەوی، کەشتییەکی گەشتوگوزاری کڕیبوو، گرووپێکی گەورەی یاری سێرکی پەیداکردبوو بە شارەکانی کەنار دەریای سپیدا دەگەڕا لەسەر کەشتییەکە باخچەیەکی بێ نموونەو بێنەزیری لە گوڵی هەمە جۆری هەموو ئەو شارانە دروستکردبوو، ناویشی لە باخچەکەی نابوو «باخچەی نوح» چونکە لە هەر شارە و تەنها دوو جۆرە گوڵی هەڵدەبژارد، باخەوانەکە ئەو برایەی خۆی ناونابوو نوح، دەیگوت:

– ئەو هاتبا، هاتباو ئەو شەو گوێی بۆ وێردەکانی «جێمان مەهێڵە درەخت» گرتبا، تەنها سەیری چاوەکانی کەم هەست دەکەم وشەکانم بە دەریادا بڵاودەبنەوە، ئیدی نافەوتێن، دەوەرن جگە لەو شەو من بۆم نییە جارێکی کە ئەو وێردە بخوێنم.

بەو پەڕی شپرزەییەوە لەبەرخۆیەوە گوتی:

– ئەو شەو بۆ من هەمان ئەو ڕۆژەیە کە لافاوەکەی نوحی تێدا هەستا. هەمان ئەو ڕۆژەیە کە شاری سەدوم وێران بوو، خودایە ئەو شەو نەمکەیتە ژنەکەی لۆت دڵم لای وێردەکەم و چاویشم لە دوای ئێوە بێت.

بەڵام کەس نەبوو بەو بڵێ برۆ ناو بەلەمە سندووقەکە، هیوای خواست زووتر کاتی وێردەکانی بێت و کاکۆ ئامادەکات، گوتی:

– پێویست بەو ترسە ناکات من لەو جیام.

« لە ساڵی شەش سەدەمینی ژیانی نوح، لە حەڤدەمین ڕۆژی مانگی دووەمدا، ئا لەو ڕۆژەدا هەموو سەرچاوەکانی قووڵایی مەزن تەقینەوە و دەروازەکانی ئاسمانیش کرانەوە. بارانیش چل و ڕۆژوچل شەو بەسەر زەویدا باری.»

نوح نەهات، ئەو هەر بە ناو لەو شارە دابوو، دەنا ساڵی یەک جار سەری لەو شاردە دەدا و پێش ئەوەی بچێتەوە ماڵەکەی خۆی ئێستا تەنها کچەکەی تێدا دەژیا، دەهاتە باخچەی ئۆڕانۆس بە پاڵتۆیەکی رەشی درێژەوە وەک پەیکەرێکی باڵابەرز بە تەنیشت دارەکاندا تێپەڕی و سەری لەبن دارێک دەدا کە ناوی نابوو چوار مێخ، پیاوێکی هیندی لە چوار لاوە لەسەر دارەکەی نوسیبوو، بە زمانێک نوح نەیدەتوانی بیخوێنێتەوە، ئەو پیاوە هیندییە هەر بە ڕۆنی قەدی دارەکان مۆمی دروست دەکرد و ئێواران دایدەگیرساند، نوح داوای دەکرد نووسینەکانی بۆ بخوێنێتەوە، ئەویش بە زمانێک دەیخوێندەوە کە ئەو هیچی لێ حاڵی نەدەبوو، بەڵام هەستی دەکرد دڵی وەک پەڵە هەورێکی سپی شنە بایەک پێش خۆی داوە.

دواتر کە کابرای هیندی مرد، داوای کردبوو لەسەر کێڵەکەی بنووسن.

«من ناڕۆم ئەوە هەر لە ناو ئەو درەختەدا چاوەڕێم»

کابرای هیندی چاوەڕێ بوو، هەرچەند دارەکە کە یەکێک بوو لە دارە هەرە بە تەمەنەکانی ئەو دارستانە و دنیا لە چەند لاوە شەقی بردو نووسراوەکانی سەریشی چەندان لەت بوون، کەچی نوح نەهات تاوێکی کە وێردەکان بێ کەس دەنیشنە سەر زەوی و دار و دیوارە ساردەکان و گوێیەک نابێ هەڵیانگرێتەوە.

خۆرێکی دوور و سوور، تەواو وەک ئەوەی مامۆستای وێنەکێشان بۆی دروست دەکردن، وەک تنۆکە شەڕابێک رژابێتە سەر لۆکە، لەودیو هەورەکانەوە کزکز دەبوو، کاکۆش بە هێمنییەکەوە کە تا ئەو کاتە دنیا بەخۆیەوەی نەدیبوو بیری دەکردەوە.

هێمنییەک لە قووڵایی دڵی و سەری تاڵەکانی قژی وەک یەک دەرژا، دەیویست جێگایەک بۆ کلیلی چاوەڕوانی لە ناخی خۆیدا بکاتەوە، ئەوەی دەزانی تا ئەو جێگایە لە ناوجەستەیدا دیاری نەکات، ئەوە لە بن زمانی نامێنێتەوە.

ئەو دەیدی، کوڕە هەرە بچووکی باخەوان، وەک مەراسیمی لە دنیا دەرچوون بۆ کەسێکی زیندوو سازکات، بە ئامانەت و دڵنیاییەوە، کاری دەکرد لەسەر مێزێک کە لە قەدی دارێک دروستکرابوو، بە جۆرێک دارەکە لە ناوەندەوە بڕابێتەوە و چونکە دیوە خڕەکەی لەسەر زەوی بوو لە دوورەوە هەر بە لانکە دەچوو، لەسەر رووکارە تەختەکەی، دۆشەکەڵەیەکی هێندەی باڵای زەلامێک درێژ راخست، ئەو دۆشەکەڵە لە توێکڵی دارێک دروستکرابوو، سپی بوو، وەک کەف بڵق بڵق بوو، گوڵی بە دەورەوە وەرکرد، دەستی کاکۆی گرت و لەسەر دۆشەکەڵەکەی درێژی کرد، قژی بە رۆنێک چەورکردبوو کە لە گوڵی ئۆفیلیا دروست کرابوو، لەبەر پێی مۆمێکی داگیرساند و روانییە خۆر کە هەر هێندەی لێوی خوارەوەی کچێکی ئەفریقی مابۆوە تامۆمەکەی داگیرساند ئەویش ئاوا بوو، دەسرە مۆرە ئاورێشمەکەی ئۆرانۆسی هێنا وەک پیرۆزترین کتێب قەدەکانی بڵاوکردەوە، بەسەر رووی کاکۆی دادا، هەموو سەر مێزەکەی گوڵاو پژێن کرد.

کوڕە هەرە بچووکەکەی باخەوان کلیلەکەی هەر لە دەستدابوو، جارێ نەیخستبووە ژێر سەری کاکۆ، لە ناو دارەکانەوە، لەو رێگا باریکەوەی لە نادیارەوە دەهاتەوە، کچە تاقانەکەی نوحی برای دەرکەوت و وەک پەیکەرێک لە مۆم لە ژوور سەری کاکۆ وەستا، کاکۆ بێ ئەوەی چاوەکانی بکاتەوە، یان دەسرەکە لەسەر دەموچاوی لابەرێ، بە هەمان هێمنی گوتی:

– برای باخەوانم، نازانم کاممان گەورەترین، من هیچ لەگەڵ خۆم نابەم، کامێراکەم لە ناو جانتاکەمدایە، سندووقە بچووکەکەی فیلمی هەرە کۆنی جەیمس پۆڵ براون لە کراسە شینەکەمەوە پێچاوە، لە گیرفانی تەنیشتی دەفتەرە بەرگ چەرمەکەی دایکمی تێدایە، نەمتوانی لاپەڕەکانی تەواوکەم، تۆ لەبن دارێک کە هی ژنێکی عاشق بوو و لە سووچی سەرەوەی باخەکە نێژراوە بیخوێنەوە ، من ئەو ژنە دەناسم، یەکێک بووە

له دەستە خوشکانی دایکم، ئەو ژنە بە کوێری عاشق ببوو، تەنها دەستی بە سەعاتی مەعشوقەکەی کەوتبوو، ئەو دەفتەرە چەرمە بۆ ئەو ژنە بخوێنەوە، با چیرۆکێکی تەواو لەگەڵ خۆی بەرێ. بەڵام من تەنها وێنەی دووچاو دەبەم، دووچاو لەودیو پەنجەرەیەکی تەڵخەوە، دووچاو لە ئەشکەوتێکەوە و دڕژێتە سەر دنیا، دنیایەک بۆ خۆی مردووە، من ئەو دووچاوە دەبەم.

باخەوانەکە دەستی برد کلیلەکە بخاتە بن سەری، کچەکە بە هەمان دووچاوی هەنگوینییەوە، هەمان دووچاو کاکۆ باسی دەکرد، کە هەرگیز هی کچەی برازاکەی نەبوون دەستی درێژکردو گوتی:

– باخەوانی دانا، ئەو پیاوە ئیدی ئەو کلیلەی پێنا پارێزرێ، دەنگی لە دنیایەکەوە دێ لێرەوە دوورە، ئەو کلیلە تازە درێژکراوە دەبێ من وەریبگرم.

باخەوانەکە کە ئێستا دڵنیا بوو ئەو کچە برازاکەی نییە، هەمان ئەو کچەی کاکۆیە کە بە فوویەک باڵندە سرەکانی لە خەو هەڵدەستاند، بۆنی بەهەشتی بڵاوکردەوە گوتی:

– من دەبێ وێردەکانم بخوێنم.

کچەکە بەوپەڕی دڵنیاییەوە گوتی:

– ئەو تازە گوێی لێ نابێت، بیدە بە من، من چاوەڕێی هاتنی درەختێک دەکەم.

١٥١٠٢٠٠٨